# فەلسەفەی مارکسیزم

## کورتە باسێکی ماتێریالیزمی دیالەکتیک

نووسینی:÷. پودوسیتنیك و یاخوت

## کورتە باسێکی ماتێریالیزمی مێژوویی

نووسینی: ÷. پودوسیتنیك و سبیزکین

وەگێڕانی لە عەرەبییەوە

جەلال دەباغ



حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان



- **ناوی کتێب**: فەلسەفەی مارکسیزم
- **نووسەر**: ڤ. پودوسیتنیك و یاخوت . ڤ. پودوسیتنیك و سبیزکین
- **وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە**: جەلال دەباغ
- **پیتچنین**: سۆزان نوری
- **دیزاینی ناوەڕۆك**: سۆزان نوری
- **دیزاینی بەرگ** : نزار نوری
- **تیراژ**: ١٠٠٠
- **زنجیرە**: ١٧١
- **چاپخانە**: شڤان
- **چاپ**: چاپی دووەم
- **ژمارەی سپاردن**: (٥٢٢) ی ساڵی (٢٠٠٧)



## پێشەکی ئەم چاپە

چاپی یەکەمی (ماتێریالیزمی دیالەکتیك) ساڵی ٩٧٧ بلاّوکرایەوە. لەوکاتەوە تا ئێستا پتر لە شەش جار لای خۆمان و لە کوردستانی خۆرهەلاّت چاپ و بلاّوکراوەتەوە. هەروا بە دەیان جاریش لە شارو لە چیا لەلایەن لاوان و پێشمەرگەو کەسانی تێکۆشەرەوە دانەی لە بەرگیراوەتەوە. وا ئێستا دەرفەتیش هاتەپێشەوە کە نامیلکەی (ماتێریالیزمی مێژوویی) لەگەڵ (ماتێریالیزمی دیالەکتیك) لە بەرگێکدا پێکەوە بە چاپ بگەیەنین. بێگومان جیاکردنەوەی ئەم دوو بەشەی (فەلسەفەی مارکسیزم) تەنیا لە بەر خوێندنەوەو فێربوونە.

مارکسیزم تێئورییەکی زیندووە. لە دژی دۆگم و بەستەڵۆکیی بیروقاڵبکارییەو پێبەپێی پەرەسەندن و پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژی ئەمیش پێش دەکەوێت و لە پراکتیکدا بەرجەستە دەبێت. شکستییەکەی هەندێ لە وولاّتانی سۆسیالیستی وەك تاقیکردنەوەیەك بە هیچ جۆرێك مانای لاوازی و شکستی مارکسیزم ناگەیەنێت.

لەو باوەڕەدام ئەم نامیلکەیە لەبەردەست خوێنەرانی بەڕێزدایە یارمەتییەکە بۆفێربوونی فەلسەفەی مارکسیزم بە زمانی شیرینی کوردی. پاش چاوپێداگێڕانەوەیەکی پێویست ئامادەمان کردەوە بۆ چاپ بەو هیوایەی لەلایەن خوێنەرانی خۆشەویستەوە پەسەند بکرێ و سەرنج و رەخنەو تێبینییەکانیان خۆشحاڵمان دەکات.

جەلال دەباغ

ئایاری ٢٠٠٧







## پێشەکی چاپی یەکەمی کوردی

خوێنەری بەڕێز. . . . . . .

ئەم کتێبەی بە زمانی شیرینی کوردی لە بەردەستتدایە. لەلایەن دوو نوسەری سۆڤێتی ڤ. پودوسیتنیك و یاخوت – وەوە نوسراوە کە هەردوکیان شارەزاییەکی باشیان لە فەلسەفەی مارکسیزم – لێنینیزمدا هەیە. . ئەم کتێبە جگە لە رووسی بە گەلێك زمانی تریش چاپ و بلاّوکراوەتەوە. منیش بە پێویستم زانی بیکەم بە کوردی.

بایەخی ئەم چاپە کوردییەی (کورتە باسێکی ماتێریالیزمی دیالەکتیك) لەوەدایە کە بۆ یەکەمین جارە بە زمانی کوردی بلاّودەکرێتەوەو کتێبخانەی کوردی هێشتا ئەم چەشنە کتێبەی نییە.

ئەم کتێبە بە زمانێکی سادەو ڕەوان، بە جۆرێکی وا نوسراوەو، کراوەتە کوردی کە خەڵکی کەم خوێنەواریش، لە کرێکارو جوتیارو رەنجکێشانی تر لێی تێبگەن و سەرەتایەك بێت بۆ خوێندن و فێربوونی فەلسەفەی مارکسیزم – لێنینیزم بە هەردوو بەشەکەیەوە کە تەنیا بۆ خوێندن و فێربوون لێك جودادەکرێنەوە، (ماتێریالیزمی دیالەکتیك و ماتێریالیزمی مێژوویی)، هیوادارین لە دوا رۆژیشدا دەرفەتمان دەستکەوێ کە هەندێك لایەنی تری ئەم فەلسەفە زانستییەی کە بەشێکی گرنگە لە تیۆری چینی کرێکار بە زمانی کوردی چاپ و بلاّوبکەینەوەو، بەم کارەش خزمەتێکی بچووك بەلاّم پڕ لە شانازیی رەنجکێشانی کوردمان کردبێ.

جەلال دەباغ

١٩٧٧/٦/٢٠

# پێشەکی دانەرەکان

ئەم کتێبەی کە بۆ فێربوون دەیخەینە بەردەستی خوێنەران بەو مەبەستەیە کە شارەزای هەندێك بیروڕاو مەسەلەی بنچینەیی بن لە ماتێریالیزمی دیالەکتیکدا کە یەکێکە لەو بەشانەی فەلسەفەی مارکسیزم – لێنینیزمیان پێکهێناوە.

هەردوو دانەری ئەم کتێبە ئەوەیان خستۆتە پێش چاو کە خوێنەران بۆ یەکەمین جار فەلسەفەی مارکسیزم– لێنینیزم دەخوێنن، لە بەر ئەوە زۆر هەوڵیان داوە کە چەند لە تواناداییە بسووك و ئاسانی بیروڕاو لێکتێگەیشتن و کاتێگۆرییەکانی ماتێریالیزمی دیالەکتیك روون بکەنەوە و، نموونەی ئاسان و رەوان بێننەوە کە لە زانست و ژیانی کۆمەلآیەتی وەرگیراون.

هەردوو دانەرەکە هیوادارن کە ئەم کتێبەی دایانناوە بۆ هەموو ئەو کەسانە بە کەڵك بێت کە دەیانەوێ شارەزای فەلسەفەی مارکسیزم – لێنینیزم ببن.





# فەلسەفەی مارکسیزم

## کورتە باسێکی ماتێریالیزمی دیالەکتیك

**نووسینی: ÷. پودوسیتنیك و یاخوت**







## بەشی یەکەم

## فەلسەفەی مارکسیزم ماتێریالیزمی دیالەکتیکە

### فەلسەفە چییە؟

١- لەتاقیکردنەوەی ڕۆژانەی خۆمانەوە فێربووین کە بۆئەوەی لەو شتانەی لە دونیای دەوروپشتماندا رووئەدەن تێبگەین، ئەبێ رژێمێکی زانیاری بکەینە ڕابەری خۆمان لە سەرنجدانی ژیان و هەموو دنیاو شوێنمان لەم دنیایەداو سەرنجدانی ئەم یان ئەو دیاردەو رووداوە، ئەم چەشنە ڕژێمە بۆسەرنجدانی دنیاو تێگەیشتنی بەڵکو هەروەها بۆ ئەوەش کە مرۆڤ شوێنی خۆی لەم دنیایەدا بزانێ و بە چەشنێکی کاریگەر کار بکاتە سەر رووداوەکان و بۆ ئەوەی بە گەرمی بەشداری خەباتی رزگاریخوازی بکات کە لەم سەردەمەدا زۆر بەرین و فراوان بووە، (بە کورتی تەنیا کاتێك ئەتوانین بە باشی لەو رووداوانەی دەوروپشتمان تێ بگەین ئەگەر سەرنجدانێکی راست بکەینە رابەری خۆمان و لە گۆشەی ئەو سەرنجەوە تەماشای هەموو لایەنێکی ژیان و دنیاو دیاردەو رووداوەکان بکەین)و، تەنیا فەلسەفەیە کە زانستێکی لەم چەشنەمان ئەدات بە دەستەوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە زانیاری فەلسەفەش لەپاڵ زانستەکانی تردا هەروەکو هەوا چۆن پێویستە بۆ ژیان ئاوا پێویستە بۆ دامەزرێنەرانی ژیانی نوێ.

هەرکەسێك لە فەلسەفە بکۆڵێتەوە و بە قووڵی فێری بێت،

بیروڕای لەشت کۆڵینەوەی زۆرترو بەرچاوی فراوانتر ئەبێ و بە وردی سەرنجی هەموو ئەو شتانە ئەدات کە لە دنیای دەوروپشتیدا ڕوو ئەدەن، هەروا لە خۆڕایی نییە کە ووشەی ((فەلسەفە)) لەزمانی یۆنانی کۆنەوە وەرگیراوە و مانای ((خۆشەویستی زانستە)).

ئەبێ ئەوەش بزانین کە دنیابینیی هەموو فەلسەفەیەك بە چەشنێکی زانیاری نییە. هەندێ لە فەیلەسوفەکان بە تایبەتی لە وولاتانی ئیمپریالیزمدا ڕووداوەکانی دنیا ئاوەژوو ئەکەنەوە، بەم جۆرە دەرئەکەوێت کە هەموو فەلسەفەیەك

نابێتە ڕابەری ژیان، چونکە وەنەبێ هەموو دنیابینییەك ڕاست بێ و، بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە خەڵکی تەنیا لە ڕێگەی فەلسەفەیەکی زانیارییەوە ئەتوانن بگەنە بیروباوەڕێکی گیرو بە ڕاستی پارێزگاری بەرژەوەندی گەلەکانیان بکەن و ئازادیو سەربەخۆی وڵاتەکانیان بپارێزن ولە پێناوی ئاسایش و بەختیاری مرۆڤدا کارو کۆششی مەزنیان لێ بوەشێتەوە. جا ئایا بایەخ و ئەهمیەتی گەورەی فەلسەفە لە چی دایە؟زانیاری فیزیاو ئەستێرەناسی وبیولۆژی (زانیاری زیندەوەر) وزانستەکانی تر لەو قانوونانە ئەکۆڵنەوە کە کە دەربارەی بەشێك لە دیاردەو ڕووداوەکانی سروشتن، بەلام فەلسەفە زۆر لەو قانوونە فراوانە ئەکۆڵێتەوە دەربارەی هەموو دیاردەو ڕووداوەکانی دنیان و لەسەر ڕێوشوێنی ئەوان تەواوی دنیا لە گۆڕان و پەرەسەندندایە، لەبەر ئەمە فەلسەفە زانیارییە کە دەربارەی قانوونە هەرە بەرین و فراوانەکانی گۆڕان و







پەرەسەندنی سروشت و کۆمەڵ و بیروڕای مرۆڤ.

بەلام بێ گومان هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر لەمەوە بێینە سەر ئەو باوەڕەی کە گوایا فەلسەفە بتوانێ دەستبەرداری زانیارییەکانی تر بێت و یان ئەوان دەستەبەرداری فەلسەفە بن، فەلسەفە تەنیا کاتێك دنیابینییەکی پێشکەوتنخوازو پێشڕەوە ئەگەر لەبەر ئەنجام گەیشتندا پشت ببەستێ بە دەستکەوتی زانستەکانی تر.

٢- لەم ڕۆژەدا ئەو فەلسەفەیە تەنیا فەلسەفەی مارکسیزمی لێنینیزمە کە پەیوەندی لەگەڵ زانستەکانی تر بەهێزە و پشتی ئەستوورە بە تازەترین دەسکەوتی زانیاری و هەروا زانیاری ئەم چەرخە بە باشترین دنیابینی فەلسەفەیی پێشکەتووانە چەکدار ئەکات و پێشکەوتووترین ڕێگای زانستیان بۆ ئەدۆزێتەوە و یاریدەیان ئەدات بۆ دەسکەوتی زانیاری نوێ کە بۆ مرۆڤایەتی یەکجار پێویستن.

٣- فەلسەفە کۆمەڵە دنیابینییەکی تایبەتی پێشکەش بەو خەڵکە ئەکات و بە باشترین تێگەیشتن لە بارەی دنیاوە چەکداریان ئەکات و هێزو توانای مەزنیشی لەمەدایە.

٤- (بەلام وەك وتمان دنیابینی لای هەر کەسە بە جۆرێکە و ئەگۆڕێ)، دنیابینی لای هەندێ کەس زانیاری و پێشکەوتووانەیە و، لای هەندێکی تر پێچەوانەی زانیارییەو کۆنەپەرستانەیە.

بۆ نموونە ئەگەر سەرنجێکی هەندێ مەسەلەی فەلسەفە بدەین کە پەیوەندیان بە مانای ژیان، ئازادی و شتی واوە هەیە ئەبینین هەر کۆمەڵە بە چەشنێکی لێی تێ ئەگەن و جۆری تێ گەیشتنی

تێکۆشەرانی پێناوی ئازادی و بەختیاری گەلان جیاوازە لە جۆری تێگەیشتنی چەوسێنەرو رەنج خۆرانی گەلان. تێکۆشەرانی دژی ئیمپریالیزم بە چەشنێك لە ئازادی و بەختیاری تێ ئەگەن کە جیاوازە لە تێگەیشتنی ئیمپریالیزم.

بە هۆی جیاوازی شوێن و جێگای خەڵکەوە لە ژیان و کۆمەڵدا. بیروباوەڕی فەلسەفەشیان جیاوازە. مێژوو پێشانمان دەدات کە لە کۆمەڵێکدا ئەگەر چەند چین و توێژێکی کۆمەڵایەتی هەبێت لە ناویەکدا لە زۆرانبازی و ململانێ دابن، ئەوا لە بارەی فەلسەفەشەوە تێبینیان جیاواز دەبێت و، بە هیچ جۆرێك ناگونجێت لە کۆمەڵێکی وادا یەك جۆرە فەلسەفە هەبێت و زۆر لێکراوان و زۆرداران بەیەك چاو تەماشای دنیا بکەن، بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە فەلسەفە بێ لایەن نییە و هەر چینە فەلسەفەی تایبەتی خۆی هەیە و هەموو کاتێك حزبییە و پارێزگاری بەرژەوەندی چینایەتی حزبی دەکات.

لەبەر ئەمە هەمیشە لە فەلسەفەی هەموو چەرخێکی مێژووییدا چەند حزبێکی بەرەنگارو ناکۆك هەبوون، لەو حزبانەش دەتوانین ماتیریالیزم و ئایدیالیزم ناوبەرین.

لێرەدا نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە زۆرجار مانای راستەقینەی زانیاری ئەم دوو وشەیە ئاوەژوو ئەکرێتەوەو ئەشێوێنرێت و چینە کۆنە پەرستەکان بە هەموو توانایەکیانەوە هەوڵ دەدەن میللەت وا تێ بگەیەنن کە ماتیریالیست ئەو کەسەیە تەنیا بایەخ بە قازانج و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی ئەدات و بەس، ئایدیالیست ئەو کەسەیە کە







خزمەتی مەسەلە وبیروباوەڕو چاکەیەك ئەکات بە چەشنێکی دروست و بێ مەبەستێکی تایبەتی!

بێکومان ئەم چەشنە تێگەیشتنە ئاوەژوو کردنەوەو شێواندنەی ماتیریالیزم و ئایدیالیزم هیچ چەشنە پەیوەندییەکی نییە لەگەڵ ئەو جیاوازییە لە راستیدا لە نێوان ئەم دوو ڕێبازە فەلسەفییەدا جیاوازییان لە شتێکی تردایە کەوا لێرەدا ئەیخەینە بەرچاو:

فەلسەفە یەکێکە لە زانیارییە کۆنەکان و لەناو ئەو هەموو مەسەلانەدا کە لە دەمێکەوە لێیان دەکۆڵرێتەوە مەسەلەیەکی بنچینەی هەیە و سروشتی فەلسەفە لەسەر چاکردن و لێکدانەوەی ئەو مەسەلەیە وەستاوە. جا ئایا مەسەلەی بنچینەیی فەلسەفە کامەیە؟

بێگومان لە دنیادا زۆر چەشنە شت و مەك و دیاردە هەن. هەندێکیان وەك:بەردو درەخت و هەورە تریشقە و بروسکە و ئاوو ئاژەڵ و ڕووەك و زۆر شتی تریش کە سەربەخۆیی لە هەست و ئیدراکی مرۆڤ هەن و ئێمە بە حەواسی خۆمان شعور بە بوونیان دەکەین و توانای بینین و بیستن و پێوان و کێشانیانمان نییە. وەك ئەم جۆرە دیاردانە تەنیا لە هۆشمەندی (وعی) مرۆڤدا هەن.

بەم جۆرە ئەبینین لە دنیادا دوو کۆمەڵە دیاردە هەیە: هەندێکیان بە سەربەخۆیی لە هۆشمەندی مرۆڤ و بە چەشنێکی مەوزوعی و لە خۆیانەوە هەن و ئەمان پێیان دەوترێ دیاردەی ماتریالیستی. بەڵام کۆمەڵی دووەم جۆرە دیاردەیەکن تەنیا لە

هۆشمەندی مرۆڤدا هەن وپێیان دەوترێ دیاردەی ئایدیالیستی. جالێرەدا هەمیشە ئەم مەسەلەیە دێتە کایەوە: ئایا پەیوەندی نێوان دیاردەکانی ماتیریالیستی ئایدیالیستی کامەیە و؟ کامەیان لەپێش ئەوانی ترەوەن؟

دیاردەکانی ماتیریالیستی ئایدیالیستی؟ یان وەکوتر بڵێین، ئەبێ کامیان بە یەکەم دابنێین: دنیای مادی، واتا سروشت، یان هۆشمەندی؟ ئەمە لایەنێکی مەسەلەی بنچینەیی لە هەموو فەلسەفەیەکداو، لایەنەکەی تری ئەم مەسەلەیە لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دا بەدی دەکرێت:ئایا مرۆڤ ئەتوانێ دنیا بناسێت و خەیاڵێکی راستەقینەی بەرامبەر پەیدا بکات یان نا؟

فەیلەسوفەکان بە چەشنێکی جیاواز وەڵامی ئەم مەسەلە بنچینەییە ئەدەنەوە و بەپێی جۆری وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دابەش ئەبن بە دوو سوپاگەی گەورەوە.

یەکەم: سوپاگەی ماتیریالیست کە باوەڕیان وایە دنیای مادی، واتە سروشت یەکەمینە و هۆشمەندی دووەمینە و ئەنجامی سروشتە.

دووەم: سوپاگەی ئایدیالیست کە هۆشمەندی بە یەکەمین و سروشت بە دووەمین و ئەنجامی ئەو ئەزانن. ئەمەیە جیاوازی راستەقینەی نێوان ئەم دوو سوپاگەیە لە فەلسەفەدا کە٢٥٠٠ساڵ زیاترە لە زۆرانبازی و ململانێدان. ماتیریالیستەکان لەسەر ڕۆشنایی پێشکەوتنی زانیاری بە جۆرێکی ڕاست و دروست ئەی سەلمێنن کە هەموو شت وەك دیاردەکانی (مادی) دەورووپشتمان لەخۆیانەوە بە







سەربەخۆیی و لە دەرەوەی هۆشمەندی مرۆڤدا هەن بۆ نموونە: زەوی و بەردو بروسکە ودرەخت و ئەو جۆرە شتانە بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە مرۆڤ و هۆشمەندی ئەو هەن. جگە لەوە زانیاری سەلماندویەتی کە پێش ئەوەی مرۆڤ لەسەر زەوی پەیدا ببێ دنیا هەر هەبووە. بەلاّم ئایدیالیستەکان بێ ئەوەی گوێ بدەنە زانیاری ئەڵێن ئەم دنیایەی دەورەپشتمان و هەموو شت وەك و دیاردەکانی مادی بەرهەمی هۆشمەندین و ئەو پەیدای کردوون. باوەڕیان وایە کە لە سەرەتای فیکرو تێگەیشتن و بیرۆکە هەبوون و لە پاشدا شت وەك لە لایەن ئەمانەوە دروستکراون.

مێژووی فەلسەفە دوو چەشنە باوەڕی ئایدیالیزمی بە خۆیەوە دیووە:ئایدیالیزمی عەینی و زەینی واتا مەوزوعی و زاتی. عەینی بە گشتی بەو شتانە دەوترێ کە بوونیان لە دەرەوەی مرۆڤ و سەربەخۆیە لە فیکرو هۆشمەندی مرۆڤ. هەندێك لە فەلسەفەکان لەو باوەڕەدان کە بیرۆکەیەك بە شێوەیەکی عەینی هەیە و ئەم دنیایەی دروستکردووە لە بەر ئەوە پێیان ئەوترێ ئایدیالیستی عەینی وەك فەیلەسوفی کۆنی یۆنانی (ئەفلاتۆن) (٤٢٧- ٣٤٧پ. ز) وە فەیلەسوفی ئەڵمانی هیگڵ کەلە چەرخی نۆزدەهەمدا ژیاوە. ئەم باوەڕە بنچینەی ئەو ئاینانەیە کە باسی ئایدیالیستەکان پێیان دەوترێ زەینی. ئەمانە لەو باوەڕەدان کە هەموو شتێکی دنیا لەلایەن هۆشمەندی حەزو هەستەکانی مرۆڤەوە دروستکراوە. وەك فەیلەسوفی ئینگلیزی (بیرکلای ١٦٨٤- ١٧٥٣) کە باوەڕی وایە لە خودی مرۆڤ و هۆشمەندی بەولاوە شتێکی تر نییە و

گوایە هەموو شتێك دنیا ئەو کاتە هەیە کە مرۆڤ هەست بە بوونیان بکات بە هۆی هەستەوەو تەنیا ئەو کاتە هەن کە مرۆڤ توانای بینین و بیستن و دەست لێ دانیانی هەبێت و ئەگەر وا نەبێ ئەوا ئەو شتانە وجودیان نییە. بیرکلای و هاوبیرانی لەو باوەڕەدان کە تەنیا لە هۆشمەندی و ئیدراك و هەستەکاندا هەیە و بەس. ئەمە وەك ئەوەیە بوترێ گوایا زات، واتا مرۆڤ خۆی دنیای ئەبێت و هەموو جارێکیش سەر لە نوێ ئەبێتەوە.

لەمەوە وادەردەکەوێت کە هەر کاتێك مرۆڤ چاوی بنوقێنێت ئیتر دنیا نامێنێت و کە چاوی کردەوە دنیا پەیدا دەبێتەوە. بەم چەشنە بیروباوەڕە دەوترێ ئایدیالیزمی زەین.

ئایدیالیزمی عەینی و، زەینی، هەردووکیان وەك لەلایەن تاقیکردنەوەی مرۆڤ و ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤەوە دراونەدواوە و پێشان دراوە کە پوچەڵن و، ژیانی ڕۆژانە ڕاست و دروستی دنیابینی مادی سەلماندووە.

فەلسەفەکان لەو باوەڕەدان کەبوونی شتومەك و دیاردەکانی دەوروپشتمان بە جۆرێکی راستەقینە و سەربەخۆیە لەئێمە و لە بیرو هۆشمەندیمان. ئەمە بیروڕای هەموو مرۆڤێکی ژیرو تێگەیشتووە، چونکە ژیان و تاقیکردنەوەی ڕۆژانە هەمیشە ئەوەیان فێر ئەکەن. دیالەکتیکەکان هەموو شتێك وەکو خۆی چۆن لە واقعی ئایدیالیزمدا هەیە ئاوا دەبینین و فەرمانی بوونی بە سەردا ئەدەن بۆ نموونە:

ئێمە لیمۆ ئەبینین و هەیەو هەستی پێ دەکەین و بە هۆی







خاسیەتەکانی عەینییەوە کە سەربەخۆن لە دەسەلاتی مرۆڤ هەندێ هەستی تایبەتی پەیدا دەکەن وەك:ترس و ڕەنگی زەردو بۆن و شتی وا. ئەمە تەماشا کردنێکی لە خۆوەی دیالەکتیکی دنیایە کە بۆتە ڕابەری ژیانی ڕۆژانەی ئەم خەڵکە.

فەیلەسوفە دیالەکتیکەکان ئەم جۆرە دنیا بینییەیان لاپەسەندە و لەسەری دەڕۆن بەپێی زانیاری سەلماندوویانە و کردوویانە بە دنیا بینییەکی هۆشمەندانە. هەر لەبەر ئەمەشە کە ماتێریالیزمی فەلسەفەی پێچەوانەی ماتێریالیزمی خۆبەخۆ (عفوی) یەو لەسەر ڕێ و شوێنی زانیاری پێك هاتووە و یارمەتی مرۆڤ دەدات کە بە ڕاستی لە دیاردەکانی سروشت و ڕووداوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی تێ بگات.

لەمەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە مەسەلەی بنچینەیی فەلسەفە چەند بایەخێکی گەورەی هەیە. وەنەبێ بە ڕێکەوتیش بێت کە لە زۆر کۆنەوە تا ئەمڕۆ لەسەر ئەم مەسەلەیە زۆران و ململانێ لە نێوان دیالەکتیك و ئایدیالیستەکاندا هەیە. ئەم کێشە ئایدۆلۆژییەی نێوان ماتیریالیزم و ئایدیالیزم کێشەی چینایەتی ئەخاتە ڕوو، کێشەی هێزە پێشکەوتنخوازەکان و هێزە کۆنە پەرستەکانی ناو کۆمەڵ. لەم کێشەیەدا، ماتیریالیزم هەمیشە بەرگری لە بەرژەوەندی هێزە پێشکەوتنخوازەکانی ناو کۆمەڵ کردووە و دەکات، بەڵام ئایدیالیزم هەندێجار نەبێ، بەرگری لەبەرژەوەندی هێزەکان کۆنە پەرستی کردووەو دەکات.

لێکۆڵینەوەو باش تێگەیشتنی مرۆڤ لە سەر ئەو ڕێبازە وەستاوە

كە ئەم یان ئەو فەیلەسوفە بۆ زانین و تێگەیشتن ئەی گرێتە بەر، ڕێبازی فەلسەفە و بۆ زانیاری و بەو هۆیەوە دەتوانین لە هەموو دیاردەكانی سروشت و فەلسەفی ڕاستمان كردە رابەری خۆمان ئەوا دەتوانین بە سەركەوتوویی نهێنییەكانی سروشت و گەردوون بخەینە ڕوو، بەڵام ئەگەر ڕێبازێكی چەوتمان هەڵبژارد ئەوا لە تاریكە شەودا وێڵ و سەرگەردان دەبین و ناگەینە ئامانجی دیاریكراومان زانیاری ڕاستمان دەربارەی سروشت و گەردوون دەست ناكەوێ. هەموو زانیارییەك ڕێبازێكی تایبەتی خۆی هەیە بۆ لێكۆڵینەوەی دیاردەكان، بۆ نموونە زانیاری بایۆلۆژی (زانیاری زیندەوەر) لەم چەرخەدا ڕێبازی تێبینی و تاقیكردنەوە بە كار دەهێنێت. . . هتد، هەندێ لە زانیارییەكانی تایبەتی ڕێبازی خۆیان تەنیا بۆ لێكۆڵینەوە ی چەند دیاردەیەك بەكار ئەهێنن و لە كۆڕی زانیاری خۆیاندا. بەڵام ئەركی فەلسەفە ئەوەیە كە ڕێبازێك پیشان بدات بۆدیاردەكانی سروشت و كۆمەڵ، بەم جۆرە بۆمان دەردەكەوێ كە ئەركی فەلسەفە ئەوەیە ڕێبازێكی فەلسەفەیی گشتی بۆ زانین بدۆزێتەوە كە ببێتە ڕابەری هەموو زانیارییەكان و بتوانن شان بە شانی ڕێبازی تایبەتی خۆیان بە كاری بێنن.

ئینجا بابزانین ئەو ڕێبازانەی زانینی دنیا كامانەن كە لەماوەی هەموو مێژووی فەلسەفەدا دۆزرانەوە ئایدیالیزم بۆ زانینی هەموو دیاردەكان دوو ڕێبازی فەلسەفەیی هەیە: مەرجی ڕێبازی یەكەم ئەوەیە بەجۆرێك تەماشای هەموو شت و مەك و دیاردەكان بكرێت








كەلەئاڵوگۆڕو پەرەسەندنی هەمیشەیی و بەردەوامدان بەم ڕێبازە دەوترێ ڕێبازی دیالەكتیكی.

مانای ئێستای وشەی ((دیالەكتیك)) زۆر جیاوازە لەمانای سەردەمی كۆنی. فەیلەسوفەكانی سەردەمی یۆنانی كۆن وا لە (دیالەكتیك) تێ ئەگەیشتن كە دۆزینەوەی ڕاستییە بە هۆی دەمەتەقێو گفتوگۆكردنەوە لە كێشەی بیروڕای جیاوازدا. بەڵام ئێستا دیالەكتیك وای تێ دەگەین كە ڕێبازێكی فەلسەفەییە بۆ زانینی ڕاستیو دەرخستنی ئەوەی هەموو شتێك لەم دنیایەدا لە گۆڕانو پەرەسەندندایەو، وەك فەیلەسوفی یۆنانی كۆن (هیرقلیت) دەڵێ: ((هەموو شتێك لە ڕۆیشتن و گۆڕاندایەو مرۆڤ ناتوانێ دووجار بەئاوی ڕووبارێك خۆی بشوات چونكە ئاوی دووەم جار زۆر جیاوازترە لەئاوی جاری پێشوو)).

دووەم ڕێبازی فەلسەفە بە جۆرێك تەماشای شت و مەك و دیاردەكان دەكات كە وەستاوو ناگۆڕێن و نابزون. بەم ڕێبازەش دەوترێ ڕێبازی میتافیزك. بەم جۆرە ئەبینین كە دیالەكتیكو میتافیزیك دوو ڕێبازی جیاوازو پێچەوانەی یەكن دەربارەی زانینی دنیا.

**جا با بزانین لەم دوو ڕێبازە فەلسەفەییە كامیان ڕاستو زانیارییە**.

بێگومان ڕێبازی یەكەم ڕێبازی ماتیریالیستەو بڕوای گۆڕانو پەرەسەندنی هەموو شتێكەو لەگەڵ ڕاستیدا دەگونجێتو زانستو تاقیكردنەوەی مرۆڤیش سەلماندوویەتی. ئاشكرایە كە ژیان لە شوێنی

خۆیدا ناوەستێ، بەڵکو لە گۆڕان و پەرەسەندن دایە، بۆ نموونە: ماوەی چەند ساڵێك لەمەوبەر ئیمپریالیزمی ئینگلیزو فەرەنسا دەسەلاتیان بەسەر ئەفەریقادا گرتبوو، بەڵام ئێستا ئەبینین زۆربەی گەلانی ئەفەریقا سەربەخۆنو کۆتی دیلی ئیمپریالیزمیان شکاندووەو لە پێناوی دوا ڕۆژێکی بەختیاردا خەبات دەکەن. ئەمە پەرەسەندنو پێشکەوتنە لە ژیانی ئەو گەلانەدا. . دیاردەکانی سروشتیش هەروا لە پەرەسەندنو گۆڕاندان. . بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە دیالەکتیك بە شێوەیەکی ڕاست ڕێبازی لێکۆڵینەوەی هەموو دیاردەکانی سروشتو کۆمەڵمان فێر دەکات. بە لام نابێ ئەوەمان لە یادبچێ کە دیالەکتیك تەنیا پاش یەکگرتنی تەواوی لەگەڵ ماتیریالیزمدا دەبێتە ڕێبازێکی زانیاری ڕاستەقینە. ئەم یەکێتییەی نێوان دیالەکتیكو ماتیریالیزم لەفەلسەفەی مارکسیزمدا هاتۆتە دی کەپێی دەوترێ: ماتیریالیزمی دیالەکتیك.








## پەیدابوونی ماتێریالیزمی دیالەکتیك

فەلسەفەی مارکسیزم کە ماتێریالیزمی دیالەکتیکە لەلایەن مامۆستاو ڕابەرانی چینی کارگەرانی جیهان کارل مارکس (١٨١٨- ١٨٨٢) وە فردیك ئەنگلس (١٨٢٠ - ١٨٩٥) دانراوەو دوای ئەوان ڕابەری بلیمەت ڤ. ئی. لێنین (١٨٧٠ - ١٩٢٤) بە چەشنێکی داهێنەرانەو لە ڕۆژگارێکی نوێدا پەرەی پێداوە.

لەهەموو مێژوویی مرۆڤایەتیدا کەس نەبووە وەك مارکسو ئەنگلسو لێنینو کاریان کردبێتە سەر پەرەپێدانی ڕۆشنبیریو سەر ئەنجامی گشت مرۆڤایەتی. تەنیا ئەمان بلیمەتانە سەرنجی دوا ڕۆژیان داو چارەنوسی ئایندەی گەلانیان ڕەچاوکردو ڕێگای ژیانی ئازادیو بەختیارییان بۆ هەموو مرۆڤایەتی ڕووناکردەوە.

بیروباوەڕی فەلسەفەی مارکسو ئەنگلس لە ناوەڕاستی چەرخی نۆزدەیەمداو لە ئەنجامی جووڵانەوەکانی سەرەتایی کرێکاراندا لە پێناو ڕزگاریی ئابووریو سیاسییاندا پەیدا بووە.

بۆ یەکەم جار خەباتی پرۆلیتاریا لە ساڵانی چلو پەنجای چەرخی نۆزدەیەمدا دەستی پێکرد. لە ئینگلتەرە خەباتی جەماوەری کرێکاران لە پێناوی مافەکانی سیاسییاندا پەرەی سەندو ئەم خەباتە بەناوی جووڵانەوەی (شارتی) یەوە لە مێژوودا ناسراوە. لە فەرەنسا کرێکارانی لیون ڕاپەڕینو. لە ئەڵمانیاش کرێکارانی کارخانەکانی

چنین لە سیلیزیا هاتنە مەیدانی تێکۆشانەوە، ئەم جەنگە چینایەتیانە بۆ یەکەم جار لە نێوان کرێکاران‌و سەرمایەداراندا قەومان بەسەرەتای خەباتی رزگاری دادەنرێن. بەم جۆرە باوەڕی مارکس‌و ئەنگلس لەسەر بنچینەی خەباتی ڕزگاریخوازی پرۆلیتاریا لە دژی چەوسانەوەو ڕەنج خۆری دامەزراوەو بەتەواوی لەگەڵ بەرژەوەندی چینی کارگەراندا ئەگونجێت‌و بۆتە پرۆگرامی خەباتی کارگەران لەپێناوی سۆشیالیزمدا. ئەم باوەڕە تاقە ڕێگای ڕاست و دروستی رزگار بوون لە کۆیلایەتی سەرمایەداری بۆ پرۆلیتاریای گشت وولاّتانی‌دنیا روون کردەوە.

باوەڕی مارکس و ئەنگلس دوور نەبووە لە پەرەسەندنی ڕۆشنبیری جیهان، ئەو باوەڕە میراتگری باشترین بەرهەمێکی مرۆڤایەتیی پێشکەوتووە لەم مەیدانەداو، باشترین کرداری فەلسەفە لەپێش مارکس و ئەنگلسدا ئەوە بووە کە لە سروشت گەیشتنی مادی و باوەڕی پەرەسەندنی (دیالەکتیکی) پێشکەش بەو خەڵکە کردووە کە ئەم دەستکەوتانەی فەلسەفەش بە تایبەتی لە کۆتای چەرخی هەژدەیەم و سەرەتای نۆزدەیەمدا لە فەلسەفەی ئەڵمانیدا دەردەکەون. فەیلەسوفی ئایدیالیستی ئەڵمانیی بە ناوبانگ جۆرج هیگل (١٧٧٠- ١٨٣١) ەوە فەیلەسەفی ئایدیالیستی ئەڵمانیی ناسراو لودفیگ فویرباخ (١٨٠٤- ١٨٧٢) نزیکترین پێشینەی مارکس و ئەنگلسن لە مەیدانی فەلسەفەدا. فەلسەفەی هیگل نرخێکی یەکجار گەورەی هەیە چونکە بیرۆکەی پەرەسەندن، واتە ماتیریالیستی تێدابووە. بە فەلسەفەی







فویرباخ ڕووناکترین تێگەیشتنی مادی ئەو کاتە بوو لە بارەی سروشتەوە و، بەهێزێکی تازەوە مەسەلەی پێویستی تێکۆشانی لە دژی ئایدیالیزم هێنایە ناوەوە. لە کۆتای چەرخی هەژدەیەمەوە زانیاریەکانی سروشتی زۆر بەخێرای‌و لە ئەنجامی پێویستییەکانی بەرهەم هێنانی سەرمایەداریدا پەرەیان سەند. بۆ نموونە: لە فیزیادا لێکۆڵینەوەی دیاردەکانی سروشتی وەك گەرمایی‌و موغناتیس‌و کارەبا زۆر بە سەرکەوتوو و بەرەو پێشەوە هەنگاویان ناوە. لە کیمیادا خاسیەتی چەشنە عناصری کیمیایی دۆزرایەوەو شێوەی پێکهاتنی کۆمەڵێك کەرەسەی کیمیایی زانراوە. لە جیولۆجیادا کە زانیاری لێکۆڵینەوەیی پەیدابوون‌و شێوەی پێکهاتنی چینەکانی زەوییەوە سەرکەوتنی زۆر گەورە وەدەست خرا هەموو ئەم سەرکەوتنانەی زانیارییەکانی سروشتی بوون بە سێ دۆزینەوەی گەورە کەئەمانەن:

یەکەم: دۆزینەوەی شانە(خلیة) زاناکان سەلماندیان کە هەموو ئەندامەکانی زیندەوەرو ڕووەك لە زۆر چەشنە شانە پێکهاتون‌و، بەم دۆزینەوەیە دەرکەوت کە سروشتی زیندوو یەك جۆرە پێکهاتنی هەیە.

دووەم: دۆزینەوەی یەکێك لە قانوونە بنچینەییەکانی سروشت کە ئەویش قانوونی پاراستن‌و گۆڕینی وزەیە(طاقة). بەپێی ئەم قانوونە وزە نە پەیدا دەکرێ‌و نە لە ناویش دەبرێ‌و لەمەدا وەك مادەیە کە وزەی تێدایە.

تەنیا لە مەرجێکی تایبەتیدا لە شێوەیەکەوە ئەبێ بە شێوەیەکی

تر. بۆ نموونە:وزەی میکانیکی دوای لێدان و لێخشاندن ئەگۆڕێت بە وزەی گەرمایی کە ئەمیش لە مەنجەڵ و تۆربینەکانی هەڵمدا ئەبێت بە وزەیەکی میکانیکی و کارەبایی. بەم جۆرە دەرکەوت کە پەیوەندی ئاڵوگۆڕ هەیە لە نێوان شێوە جۆر بە جۆرەکانی وزەدا.

سێیەم: پەیدابوونی باوەڕی زانای سروشتی بەناوبانگی ئینگلیزی داروین (١٨٠٩- ١٨٨٢) دەربارەی ئەصلی جۆرەکانی ڕووەك و زیندەوەرەکە پێی دەوترێ (داروینیزم) داروین گورزێکی گرانیدا لە بارەی سەرنجی میتافیزك کە پێچەوانەی ماتیریالیستەو، سەلماندی کە هەموو رووەك و زیندەوەرێك بە مرۆڤیشەوە لە ئەنجامی پەرەسەندنێکدا پەیدابوون کە ملیۆنەها ساڵی خایاندووە.

بایەخی ئەم دۆزینەوە گەورانەی زانیارییەکانی سروشتی لەوەدایە کە ڕێگایان ئاواڵە کردەوە بۆ دەربازبوونی لە ئاسۆی تەنگەبەری ڕێبازی بیرکردنەوەی میتافیزیکی زاناکانی ئەو سەردەمە و بۆ سەرنجدانی سروشت بە چەشنێکی نوێ، پاش ئەوە ئیتر سروشت وەك شتێکی وەستاو و نەگۆڕ نە ئەهاتە بەرچاو. زۆرتر روون بووەوە کە هەموو سروشت لە بچووکترین شتەوە تا گەورەترین ئەستێرەی ئاسمان. لە دەنکە لمێکەوە تا ڕۆژی ئەستێرەکان، لە بچووکترین شانەوە تا ئەگاتە مرۆڤ، هەموویان لە جووڵان وبزووتن و ئاڵوگۆڕێکی هەمیشەییدان.

هەروەها لە سەر ڕۆشنایی زانیاری مێژوو دەرکەوت کە ژیانی کۆمەڵایەتیش لە شوێنی خۆی نامێنێتەوە ئەگۆرێت، کۆمەڵ لە چەند








چینێك پێك هاتووە ئەمانە کێشەو ناکۆکیی چینایەتییان لە ناودا هەیە. بەم پێیە شۆڕشەکانی بۆرژوازی لە ئینگلتەرەوە و فەرەنسا بەرپاکراون، و ڕژێمێکی کۆنی دەرەبەگییان لەناو برد.

بە کورتی تەواو ڕەوتی پەرەسەندنی زانیاری دەربارەی سروشت و باری سەرنجی نوێی ماتیریالیست جێگای گرتۆتەوە. مارکس و ئەنگلس بەباشی لە هەموو دەسکەوتنێکی بە نرخ و پێشکەوتووی زانیاریی پێش خۆیان گەیشتبوون و ئەو بەرهەمە پێشرەوەی بیرو ژیریی مرۆڤایەتییان بە چەشنێکی ڕەخنەگرانە و بەپێی بەرژەوەندو ئامانجەکانی پرۆلیتاریاو هەموو ڕەنجکێشان سەر لەنوێ داڕشتەوە. ئەم جووتە شۆڕشگێڕە مەزنە بە بلیمەتی خۆیان سەرکەوتنێکی زانیاریی بێ وێنەیان دەست کەوت. لە زانیاری فەلسەفەو ئابووریی سیاسیو باوەڕی ئیشتراکیو لە زانینەکانی تری مرۆڤایەتیدا شۆڕشێکی گەورەیان بەرپاکردو زانیارییەکی شۆڕشگێڕی نوێیان پێکهێنا کە مارکسیزمە.

چاکترین ئەنجامێکی ئەم شۆڕشەی مارکسو ئەنگلس لە زانیاریدا دامەزراندنی فەلسەفەی مارکسیزم بووە. واتە ماتێریالیزمی دیالەکتیك کە دنیا بینییەکی شۆڕشگێڕانەی نوێیە. مارکس ڕایگەیاند کە لە ڕابردوودا فەیلەسوفەکان بەهەر شێوەیەك بۆیان گونجابێت دنیایان لێکداوەتەوە. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەرکی هەرە گرنگ گۆڕینی دنیایە نەك لێکدانەوەی بێگومان بۆرژوازی ئیمپریالیزم هیچ بە تەنگ گۆڕینی دنیاوە نیە چونکە خۆی خاوەن دەسەڵاتەو ئەیەوێ تا هەتایە

ڕژێمی سەرمایەداری بەرقەرار بێت. بەڵام پرۆلیتاریاو ڕەنجکێشانی تر. بە پێچەوانەی بۆرژواوە گەورەترین قازانجیان لەوەدایە دنیای کۆن بگۆڕن و کۆمەڵێکی سۆشیالیست پێکبێنن کە چینی کۆمەڵایەتی تیا نەبێت. ئەم ئامانجەشیان بەتەواوی لەگەڵ بەرەوپێشچوونی کۆمەڵ و قانوونەکانی مێژوودا ئەگونجێت. تەنیا پرۆلیتاریا کە چینێکی هەرە شۆڕشگێڕو پێشکەوتووی کۆمەڵەو، رابەری ڕەنجکێشان و زۆر لێکراوانە، ئەتوانێ ئەم نامە پیرۆزو مەزنە بگەیەنێتە جێ و کۆمەڵی نوێیی ئیشتراکی دابمەزرێنێت فەلسەفەی کۆن بە کەڵکی ئەوە نەدەهات بکرێتە چەکی هێنانەدیی ئەم ئامانجانە. چونکە زۆر دوور بوو لە ژیانی گەل و بەرژەوەندی خەڵکی زەئایدیالیزمەتکێش و، بۆ ئەم ئامانجە مەزنەی خەباتی پرۆلیتاریا فەلسەفەیەکی شۆڕشگێڕی نوێ پێویست بوو، ئەمەش نەك تەنیا بۆ لێکدانەوەی جیهان و بەس، بەڵکو هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە چەکێکی فیکری و بۆ گۆڕینی دنیا بە بارێکی شۆڕشگێڕیدا، بخرێتە کار. ئەم چەکە تیژو بەکارەی ڕەنجکێشان تەنیا فەلسەفەی مارکسیزمە، کەپێیی دەوترێ ماتێریالیزمی دیالەکتیك.

مارکس و ئەنگلس زۆر باش لەوە گەیشتبوون کە ڕاست نییە بە تەواوی دەستبەرداری فەلسەفەی پێشووبن بۆ هێنانە دیی دنیابینییەکی شۆڕشگێڕی نوێ، بەڵکو پێویستە پاش ڕەخنە لێگرتنی سەر لە نوێ دابنرێتەوە و دەبێ دەسکەوتی بە نرخی بیری پێشڕەویی مرۆڤایەتی تیا پارێزگاری بکرێت کە ئەویش تێگەیشتنی مادی







سروشت و باوەڕی پەرەسەندنە.

واتە ماتیریالیست. بەڵام ئەوەش تەنیا بە لەناوبردنی ناتەواوییەکانی فەلسەفەی پێشوو دەکرا کە کۆسپی ڕێگای پەرەسەندنی هەمیشەیی مرۆڤ بوون. جا ئایا ئەو ناتەواوییانەی فەلسەفەی پێشوو کامانەن ئایدیالیزم

ماتێریالیزمی کۆن بەشێوەیەکی میتافیزیکی بوو چونکە لەو باوەڕەدا بوو کە دنیا وەستاوەو ناگۆڕێ، بۆ نموونە:لە چەرخی ئایدیالیزمی حەڤدەیەمدا وا دەزانرا کە ڕۆژو ئەومانگ و ئەستێرانەی بە دەوریدا دەسوڕێنەوە هەر هەبوون و تا هەتایە هەروا بەبێ گۆڕان دەمێننەوە. ئەم باوەڕە سەبارەت بە زیندەوەریش هەروا چەسپاو بوو. ماتیریالیستەکانی کۆنی وەك فویرباخ و ئەوانی تر بە چاوی بایەخەوە سەرنجیان نەدەدایە دەورگێڕانی گەورەو هەڵسووڕان و کاروکردەوەی مرۆڤ هەر ئەوەیان دەدی کە سروشت کار دەکاتە سەر مرۆڤ و بە پێچەوانەی ئەمە سەرنجیان نەدەدا کە مرۆڤیش کار دەکاتە سەر سروشت، لێرەدا پێویستە بڵێین مرۆڤ تەنیا سەرنجی دنیای دەرەوە نادات و بەس. بەڵکو هەروەها زۆر بە توندی کاری تێ دەکات و بە کردەوە ئەیگۆڕێت. بۆ نموونە: مرۆڤ هەمیشە بەرهەم باشتر دەکات و ئامرازو ئامێرو دام و دەزگای نوێ و شتی وا دەکات. ڕژێمی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت و لە جێگای کۆمەڵی کۆن کۆمەڵێکی نوێ دائەمەزرێنێت.

جا ئایا ئەم ناتەواوییە گەورەیەی ماتێریالیزمی پێشوو چۆن و

لەبەرچی بووە ئایدیالیزم؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لەمەدایە کە ماتێریالیزمی کۆن هەتا سەر ڕاست و تەواو نەبووەو خاوەنەکانی تەنیا لە لێکدانەوەی دیاردەکانی سروشتدا ماتیریالیست بوون، بەڵام لە لێکدانەوەی دیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا هەر لەسەر هەڵوێستی ئایدیالیست ماونەتەوە. لە لێکدانەوەی دیاردەکانی سروشتدا بەراست و دروستی سروشتیان بەیەکەمین و هۆشمەندییان بە دووەمین و بەرهەمی ئەو دادەنا، بەڵام لە لێکدانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتیدا دەستبەرداری ماتیریالیزم دەبوون و هیچ سەرچاوەو هۆیەکی مادییان نەدەدی بۆ پەرەسەندنی کۆمەڵ و دواجار دەبوونە ئایدیالیست. بیروباوەڕو ئایدیالیزمەو ئارەزووی ئایدیالیزم گەورە پیاوانی دەسەڵاتدار، یان بە هێزی جووڵێنەری پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی دادەناو هۆیەکانی زاتی و ئایدیالیستییان بە تاقە سەرچاوەی پەرەسەندنی کۆمەڵ دەزانی و هۆیەکانی مەوزوعی و مادییان فەراموش دەکرد. نموونەیەکی ئاشکرا لەم بارەیەوە ئایدیالیزمفۆیەرباخ، کە سروشتی بە یەکەمین و هۆشمەندی بە دووەمین دادەناو، لە گۆشەی ئەم هەڵوێستەوە بە چەشنێکی راست رەخنەی لە ئایدیالیزم و ئایین دەگرت، بەڵام بۆ لێکدانەوەی دیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی وەك:ئایین، ڕەوشت و پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی لەسەر هەڵوێستێکی ئایدیالیستی دەمایەوە، بۆنموونە: لە بریتی ئەوەی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی وەك ڕەوشت بە ڕاستی لێك بداتەوە بزانێ پەیوەندیی لەگەڵ باری ڕاستەقینەی ژیانی ئەو خەڵکە







هەیە، وای دادەنا کە بیروباوەڕو ڕەوتیش بە جۆرێکی هەمیشەیی لەگەڵ مرۆڤدایەو ناگۆڕێت و سەربەخۆیە لە باری مادی ژیان. بێگومان ئەمەش سەرنجدانێکی ئایدیالیستانەی ژیانی کۆمەڵایەتییە، بەم جۆرە رەخنە گرتن لە ناتەواوییەکانی ماتێریالیزمی کۆن و زاڵ بوون بەسەریاندا مەرجێکی پێویست بوو بۆ پێکهێنانی ماتێریالیزمی دیالەکتیك. مارکس و ئەنگلس بە ئەرکی خۆیان زانی لەسەر بناغەی فەلسەفەی پێشوو، کە تێگەیشتنی مادییانەی سروشتە، پێکهێنانی ماتیریالیزم تەواو و بەرین بکەن بە جۆرێك ژیانی کۆمەڵایەتیش بگرێتەوەو سەرنجدانێکی مادی و زانیاری مێژوو بخەنە بەردەستی مرۆڤایەتی. بۆ ئەم مەبەستەش دانانی دیالەکتیکی شۆڕشگێری کە تەواوترین و بەرین ترین باوەڕە دەربارەی پەرەسەندن و، یەکخستنی ماتیریالیزم و دیالەکتیك لە باوەڕێکی یەکگرتووی تەواودا کە ماتێریالیزمی دیالەکتیکەو پەیڕەو کردنی بە سەرەوژووری کۆمەڵدا بووە کارێکی یەکجاری پێویست.

**جا ئایا دیالەکتیك لە فەلسەفەی پێشوودا لەچ ئایدیالیزماڵێکدا بوو؟**

ماتیریالیزمو دیالەکتیك لە فەلسەفەدا بەجۆرێکی جیاواز پەرەیان سەندووە. ماتیریالیزم لەسەرەتاوە میتافیزیکی بوو، بەڵام دیالەکتیك لەناو باوەڕە فەلسەفەییەکانی ئایدیالیزمدا پەرەی سەند. بەتایبەتی لەباوەڕی فەیلەسوفی ئایدیالیستی ئەڵمانی هیگڵدا. بەم هۆیەوە دیالەکتیك زۆر ناتەواویی تێدابوو کە چارەسەر بکرێن. وەك لەمەوبەر ووتمان لە فەلسەفەی هیگڵدا دیالەکتیك بە شێوەیەکی پەرەدارتر

خرایە ڕوو، بەڵام ناتەواویی ئەم دیالەکتیکە ئەوە بوو کە بەتەواوی سەر شۆڕی ئایدیالیزم بوو. لەبەر ئەمە لە فەلسەفەی هیگڵدا دیالەکتیك تەنیا بەسەر پەرەسەندنی فیکرەو، بەسەر هۆشمەندیدا پەیڕەو دەکرا. هیگل لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە فیکرەو، روئایدیالیزم پەرەدەسێنێت و لە ئایدیالیزماڵەتێکەوە دەچێت بۆ ئایدیالیزماڵەتێکی تر. بەڵام سروشت بە قۆناغێك دادەنێ واتە مێژوویەکی تایبەتی نییە. لەبەر ئەوە پێویست بوو ناتەواوی بنچینەیی دیالەکتیکی هیگل لەناو ببرێت و پارێزگاری هەموو لایەنێکی بە نرخ و پێشکەوتووی بکرێت. بەڵام فۆیەرباخ هەموو پەیڕەوەکەی (هیگل) ی تێك و پێکدا، هەروا بە ئاسانی فڕێی دایە کەنارەوە، بەم جۆرە وەك دەڵێن ڕاست و چەوت پێکەوە پشت گوێ خران، تەنیا بلیمەتی وەك مارکس دەیتوانی ناوەرۆکی دیالەکتیکی لە ناو هەموو نهێنییەکانی باوەڕە ئایدیالیزمەکەیدا بدۆزێتەوە و پارێزگاری بکات، ناوەرۆکی ئەم باوەڕە ئەوە بوو کە هەموو شتێك لەم دنیایەدا دەگۆڕێ و پەرەدەسێنێ.

ناکۆکیەکانی ناوەوە سەرچاوەی ئەم پەرەسەندنەن، بەڵام بۆ جیاکردنەوەی ئەم باوەڕە پێشکەوتووەی پەرەسەندن لە توێکڵی ئایدیالیزم پێویست بوو سەر لە نوێ و لە بنەڕەتەوە دیالەکتیکی هیگل لە سەر بنچینەیەکی مادیو بە شێوەیەکی زانیاری ئەم چەرخە دابنرێتەوە. بێگومان ئەم کارەش بەبێ پشت بەستن بە دەستکەوتەکانی چالاکی و زانیاری شۆڕشگێڕانە ناکرێت. مارکس و ئەنگلس لە لێکۆڵینەوەی سروشت و ژیانی کۆمەڵایەتیدا ئەو ڕێبازەی







دیالەکتیکیان پەیڕەوکرد کە خۆیان دایان نابوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە توانییان بڕوایەکی فەلسەفیی وا دابنێن ماتیریالیزم و دیالەکتیك لە یەکگرتنێکی هەمیشەییدا پێکەوە کۆبکاتەوە

بەم جۆرە ماتێریالیزمی دیالەکتیك پەیدا بوو کە دنیابینییەکی شۆڕشگێریی نوێیەو، تاقە دنیابینییەکی ڕاستەو بە تەواوی لەگەڵ بەرژەوەندی ئامانجەکانی خەباتی رزگاریخوازیی رەنجکێشاندا دەگونجێت.

ئەمرۆ ماتێریالیزمی دیالەکتیك بۆتە چەکێکی فیکری باش و یارمەتی دەری پێکهێنانی ژیانێکی نوێ. جا ئایا ماتێریالیزمی دیالەکتیك چییەو چیمان فێردەکات؟

# بەشی دووەم
## مادەو شێوەکانی جوڵانەوەی مادە

بەردی بناغەی مارکسیزم ئەو باوەڕەیە کە بە تایبەتی دەربارەی مادەیە. ژیان بە گشتی و تاقیکردنەوەی ڕۆژانەمان بە تایبەتی بۆمان دەردەخەن کە ئەم دنیایە بە چەشنێکی مەوزوعی و سەربەخۆ لە هۆشمەندی و هەست و هۆش و ویست و ئارەزووی مرۆڤ هەیە. زانیاریش ئەمەی سەلماندووە و لە دەمێکەوە پیشانی داوە کە زەوی ماوەیەکی زۆر لە پێش مرۆڤ زیندەوەرەکانی تردا پەیدا بووە، بەپێی زانیاری وا زانراوە کە زەوی پێنج ملیارد ساڵە هەیە، بەڵام مرۆڤ نزیکەی یەك ملیۆن ساڵە پەیدا بووە. بوونی ئەم دنیایە بەبێ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ هەست و هۆشمەندی مرۆڤدا هەبێت ئەوەمان بۆ دەردەخات کە دنیایەکی مادییە.

ئەوەندە شت و مەك و دیاردەی فرەچەشن لە دەورو پشتماندا هەن هەرگیز کۆتاییان نایەت وەك ((بەردو دارو درەخت و لم و چەوو رۆژو زیندەوەرو دەریاو بیابان و ئەستێرەکان و زۆر شتی تر کە بە هەموویان ئەوترێ مادە)) و بە ووشەی لەم جۆرەش دەوترێ هەندێك مەفهوم هەن بەشێکی زۆر شت و مەك و دیاردە دەگرنەوە و هەندێکی تریان بەشێکی کەم بۆ نموونە مەفهومی شت و مەك، فراوانترە لە مەفهومی مێز یان کورسی.







جا ئایا فراوانترین مەفهوم هەیە. . بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین بەڵێ هەیە، ئەگەر مەفهومێك هەموو شتو دیاردەکان بگرێتەوە. هەر لە دەنکە لمێکەوە هەتا عەقڵی مرۆڤ. ئەوا ئەو مەفهومە فراوانترنیە کە ئەویش مادەیە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مادە وەك مەفهومی شتومەك وایە، بەڵام فراوانترین مەفهومە. جیاوازی ئەم لەوانی تر ئەوەیە کە نەك تەنیا نیشانەی جەوهەری و گشتیی چەند کۆمەڵە شتێك دیاری دەکات، بەڵکوو هی هەموو شت و مەك و دیاردەکانی دنیا هی هەموو شتومەکی دەورو پشتمان فراوانترین مەفهومێکی لەم جۆرە ((مەقولەی)) فەلسەفەییشی پێ دەوترێ.

جا ئایا ئەو خاسیەتە جەوهەرییە گشتییانە کامانەن کە لە هەموو شتێکدا هەن ئەو خاسیەتانە لە پێش هەموو شتێکدا مادەیین و بە جۆرێکی مەوزوعی هەن، واتە لە دەرەوەی هۆشمەندی مرۆڤ و بە جۆرێکی سەربەخۆ لەو هۆشمەندییە.

هەروەها شتەکان خاسیەتێکی تری گرنگیان هەیە. بۆ نموونە کاتێك بە ئاوێکی گەرم خۆمان دەشۆین هەست بە گەرمی دەکەین. کە تەماشای دارستانێك دەکەین ڕەنگی سەوزی گەڵای درەختەکان دەبینین. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە خاسیەتی ئەو شتانەی سەربەخۆ لە ئێمە هەن ئەوەیە کار دەکەنە سەر هەست و هۆشمان و دوابەدوای ئەوە ئیحساساتی لەو چەشنە هەستی پێ دەکرێت، ئەمەش مانای وایە کە هەموو شتەکانی دەوروپشتمان، هەموو ئەو شتانەی بە

جۆرێکی مەوزوعی هەن، واتە هەموو دنیای دەرەوەی مادەیی کە کار دەکاتە سەر ئەندامەکانی هەستمان و دەبێتە هۆی ئیحساسات پێی دەوترێ مادە.

لینین لە کتێبەکەیدا بە ناوی (ماتیریالیزم و ئیمپریو کریتیچیزم)بە مانای ماتیریالیزم و رەخنەی تاقیکردنەوە مادەی ئاوا باس کردووە:

(مادە ووتەیەکی فەلسەفییە بۆ دەربڕینی راستیی مەوزوعییانە کە مرۆڤ بە هۆی هەست پێکردنەوە دەیان زانێت. مادە ئەوەیە کە کار دەکاتە سەر ئەندامەکانی هەستکردنمان و هەستمان دەبزوێنێت، مادە ڕاستییەکی مەوزوعییانەیەو لە هەستدا پێمان دراوەو شتی لەم بابەتە مادەیە)* .

بێگومان هیچ مەفهومێکی فەلسەفی نییە هێندەی مەفهومی مادە لەلایەن ئایدیالیستەکانەوە هێرشی بەتینی کرابێتە سەر. تا ئێستا ئایدیالیستەکان (مثالیەکان) بە هەموو توانایەکیانەوە کۆشش دەکەن و جۆرەها فڕوفێڵ و تەڵەکەبازی بە کار دەهێنن و ساختە لە زانیاری ئەم سەدەیەدا دەکەن بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە بە هیچ جۆرێك مادە نییە و گوایە لە ناو چووە. بەلاَم ئەمە قسەیەکی هیچ و پووچە، چونکە لە ناوچوونی مادە مانای لە ناوچوونی دنیایە. دیارە ئایدیالیستەکان کۆشش دەکەن کەبەپێی توانا بۆ سەلماندنی قسەکەیان

* (لینین دانراوەکان چاپی چوارەمی رووسی، بەرگی ١٤ ل ١٣٣، ١١٧).







هەندێ بەڵگەی وا بێننەوە کە خەڵکی بڕوایان پێ بکات، بۆ ئەمەش پشت دەبەستن بە هەندێ دۆزینەوە لە فیزیکی ئەتۆمیدا، لەبەر ئەوە ئێمە لەمەودوا هەندێ بە درێژی لەم باسە دەکۆڵینەوە.

بۆ ئەوەی لەم باسانەی خوارەوە تێ بگەین پێویستە سەرنجی ئەوە بدەین کە زاناو فەیلەسووفەکان لە ڕابوردوا ووشەی (مادە) بە ووتەیەکی فەلسەفیی تێ نەگەیشتبوون، بەڵکو بە یەکێك لە شێوەکانی مادەی تێگەیشتبوون، بۆ نموونە ئەو ئەتۆمەی(ذرە) کە هەموو لەشێکی لێ پێك دێت، بەپێی زانیاری سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەم وا دانراوە کە دابەش نابێت و ناشکێت و کەرتبوونی بۆ نییە و خشتی هەمیشەییە لە بینای جیهاندا و هەموو دنیای لێ دروستکراوە.

بەلاَم لە سەدەی نۆزدەیەمدا بە بەڵگەی تەواو پیشان دراوە کە ئەتۆم دابەش دەکرێت و پێویستە ئەو بیروڕایە پەسەند بکرێ کە دەڵێت ئەتۆم دابەش نابێت، ئێمە نامانەوێ بە درێژی باسی ئەو دۆزینەوە زانیارییانەی فیزیکی ئەتۆمی بکەین. لێرەدا تەنیا دەمانەوێت ئایدیالیستەکان لە سەر بناغەی ئەم دۆزینەوانە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی گوایە ماتیریالیزم ژێر کەوتووە !

ئەڵێن لەمەوبەر دابەش کردنی ئەتۆم نەگونجاوە بە بەردی بناغەی مادە دانراوە، بەلاَم وا دەرکەوت کە کەرت و بەش دەکرێت. ئەمەش مانای وایە کە ئەو بناغەیەی ماتێریالیزمی لەسەر دامەزراوە ناوکی ماتیریالیزمەو مادەیە هەرەس دەهێنێ. بەلاَم ئەم قسەیە پڕوپووچ و بێ بناغەیە.

با بزانین لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمداو سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە زانیاریدا چی روویداوە؟

خەڵکی لەم ماوەیەدا زانیاری تازەتر فێربوون، لەوەوبەر نەیان دەزانی کە ئەتۆم دابەش دەکرێت و نەیان دەزانی کە ئەلکترۆن و پرۆتۆن و ناوکی ئەتۆم هەیە. بەڵام ئێستا ئەمە دەزانن. هەموو ئەم شتانەش بەڵگەی ئەوەن کە تێبینیمان دەربارەی تابلۆی سروشتی دنیا و دەربارەی شێوەی پێکهێنانی مادە گۆڕدراوە.

زانیاری هاوچەرخ زۆر شتی نوێی زانیوە لە بارەی پێکهاتنی مادەوە. لە کاتێکدا کە لە سەرەتای دۆزینەوەکاندا دووبەش یان سێ بەشی مادە زانرابێ ئێستا پتر لە ٣٠ بەشی دۆزراونەتەوە. بەڵام گرنگترین شتێك کە زانیاری سەلماندوویەتی ئەوەیە کە بوونی هەموو ئەو بەشانەی مادە سەربەخۆیە لە هۆشمەندی ئێمە. ئەوانیش هەروەکو ئەتۆم مادەیین و لەناو بردنیان کارێکی نەگونجاوە.

دۆزینەوەکانی زانیاری بە تەواوی پێمان دەسەلمێنن کە بە هیچ جۆرێك ناگونجێت ماتێریالیزمی میتافیزیك لەگەڵ ماتێریالیزمی دیالەکتیك تێکەڵ بکرێت. مادە لە بارەی سەرنجی ماتێریالیزمی میتافیزیکەوە بریتییە لە ئەتۆمەکان کە دابەش بوون و شکاندنیان بۆ نییە. بەڵام لە باری سەرنجی ماتێریالیزمی دیالەکتیکەوە مادە تەنیا بە دواهەمین خشت یان خاسیەتێکی هەمیشەیی کۆتایی نایەت و، تەنیا تایبەتمەندێتییەکی نییە، بەڵکوو ئەوەندە تایبەتمەندی هەیە کە لە ژماردن نایەت و بێ پایانە: شتومەکی دنیا هەمە جۆرن و







تایبەتمەندییەکانیشیان هەروا جۆرن، لەبەر ئەوە ناکرێت بیروڕایەکان دەربارەی شێوەی پێك هاتنی مادە لەگەڵ مەفهومی فەلسەفەیی مادەدا کە ڕاستییەکی مەوزوعییانەیە تێکەڵ بکەین.

دۆزینەوەکانی زانیاری ئەو مەسەلەیە چارەسەر دەکەن کە سەبارەت بە شێوەی پێکهاتنی مادەیە:

ئایا مادە لە ئەتۆمەکان و ئەلکترۆنەکان پێك دێت، یان لە بەشی تریش؟ بەڵام فەلسەفە مەسەلەیەکی تر چارەسەر دەکات: ئایا ئەم دنیایە، دواجار ئەم لەشە وردانە، بەجۆرێکی مەوزوعی و بەبێ پەیوەندی و لە دەرەوەی هۆشمەندیی مرۆڤ هەن؟ دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەو لەشە وردیلانەی لەلایەن زانیارییەوە دەدۆزرێتەوە هەر چەندێ نوێ بن (کە بەردەوام دەشیان دۆزینەوە) ئەمە بە هیچ جۆرێك نابێتە بەرپەرچدانەوەی ماتیریالیزم، چونکە ئەولەشە وردیلانە خۆشیان مادەیین و بە چەشنێکی مەوزوعی هەن، سەربەخۆ لە مرۆڤ و مرۆڤایەتی.

بێگومان تێبینی ئێمە لە تابلۆی دنیا هەر چۆنێك بگۆڕدرێت نابێتە بەڵگەی(لەناو چونی مادە). لەبەر ئەوەی مادە واقعێکی مەوزوعییە، لە دۆزینەوەکانی زانیاریدا، بەڵگەی تازە چنگ دەکەوێت و بە تەنیا تێبینیمان لەمەر بیناو پێکهاتنی دنیاو تابلۆ زانیارییەکەی دەگۆڕێت.

بەڵام ئەو باوەڕەی کە دەڵێ مادە هەمیشەییەو نە سەرەتای هەیەو نە کۆتایی زۆر چەشنە پرسیار دێنێتە کایەوە. مرۆڤ بە

درێژایی ژیانی سەرنج دەدات کە هەموو شتێك سەرەتاو دوایی هەیە و ئەو شتە  لەو کاتەدا پەیدا بووە. بەم جۆرە ئەم پرسیارە دەکرێت: کەواتە چی مادەی دروستکردووە؟ زانیاری بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێ: مادە هەمیشە و لە کۆنەوە هەر هەبووەو سەرەتای دەست پێکردنی نییە.

ئەمەش لەلایەن یاسای مانەوەی مادەوە سەلمێنراوە. بۆ نموونە ئەگەر پارچە تەختەیەکمان خستە ناو ئاگرەوە تەنیا کەمێك خۆڵەمێشی لێ دەمێنێتەوە. بەڵام تەختەکە سووتاندنی بە تەواوی لەناو نەچووە کە هیچ پاشماوەیەکی نەمابێت، بەڵکو گۆڕاوە بە هەندێك مادەی تر کە لە پارچە تەختە سوتاوەکە ناکەن.

زانای مەزنی رووسی میخایل ڤاسیلیڤیچ لۆمۆنۆسۆف(١٧١١- ١٧٦٥) بایەخێکی گەورەیدا بەم چەشنە ڕووداوانەو دواجار گەیشتە ئەم ئەنجامەی کە هیچ لاشە(جسم) یان توخمێك (عنصر) نییە لە سروشتدا کە بەبێ

پاشماوەیەك لەناو بچێت، یاخود لە هیچەوە پەیدا ببێت. لۆمۆنۆسۆفت ئەم بیروباوەڕەی خۆی لە یاسا بەناوبانگەکەیدا داڕشتووە کە ناوی ناوە یاسای مانەوەی شتو مەك و هەروەها پێی ئەڵێن یاسای مانەوەی مادە. بەپێی ئەم یاسایە هیچ شتێك نییە لە سروشتدا کەلەهیچەوە پەیدا ببێت. یان بەبێ پاشماوەیەك  لەناو بچێت بەڵکوو تەنیا ئەوە هەیە کە دەگۆڕدرێت بە شێوەیەکی تری مادە.







لەم یاسا گرنگەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوە قسەیەکی زۆر پوچو بێ بنەوانە بووترێت ئەم دنیایە لە هیچو نەبوو دروستکراوە. خۆ ئەگەر گریمان ڕۆژێك لە ڕۆژان هیچ شتێك لەم دنیایەدا نەبووبێت، واتە هیچ جۆرە مادەیەك نەبووبێت، ئەوا بێگومان مەحاڵ دەبوو دروست بکرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی مادە هەیە، مانای وایەهیچ کاتێك پەیدا نەبووە، بەڵکو هەردەم بووەو هەمیشەو تاهەتایە دەشبێت.

# جیا نەبوونەوەی مادە لە بزووتنەوە

هەر شتێك لە جێگایەکی تایبەتی دانرابێت وادێتە بەرچاو کە ناجوڵێتەوە بێ بزووتنەوەیە. بۆ نمونە بەردێك هیچ باری خۆی ناگۆڕێت ئەگەر یەکێك لە جێگای خۆی نەی بزوێنێت. بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەگەر بەجۆرێکی وردبین سەرنجی بەردێکی وەستاو بدەین بۆمان دەردەکەوێت کە جۆرە بزووتنەوەیەکی تێدایە:لەوێدا بە جۆرێکی بێ بڕانەوە ئەتۆمو بەشە وردیلەکانو ئەلەکترۆنەکانی کە وەك دەزانین لە هەموو شتێکدا هەن لەهاتووچۆدانو، بەهۆی شێداریو تیشکی ڕۆژو باوە ڕووخاندنی تێدا بەردەوام دەبێت، بۆ نمونە ئەگەر سەرنجی خانوویەك بدەین بۆمان دەردەکەوێت کە ئەویش بێ بزووتن نییە، هەرچەندە بەڕواڵەت وادیارە کە وەستاوەو ناجوڵێت، بەڵام ئەویش لەگەڵ زەویدا بەدەوری ڕۆژدا دەسوڕێتەوە ئێمە ئەگەر چی بەهێمنی لەشوێنێك دانیشتینو بەهیچ لایەکیشدا نەچین خوێن بە لەشماندا دێتودەچێتو زۆر چەشنە ئاڵوگۆڕی ئاڵۆز لەلەشماندا ڕوو دەدەن: شانەی نوێ دروست دەبنو ئەوانی کۆن لەناو دەچن. ئەمەش بزووتنەوەیە.

با بۆنموونە باسی گەرمایی بکەین کەلە ئەنجامی بزووتنەوەی ژمارەیەکی یەکجار زۆری بەشە وردیلەکانەوە دەر دەکەوێت، وەك بەشە وردیلەکانی ئاو کە بەهۆی هاتوچۆیانەوە ئاوەکە گەرم دەبێت.







بەڵام ئەمە بزوتنەوەیەکی میکانیکی نییە. بەڵکو شتێکی تازەی زۆر ئاڵۆزترە. تەزوی کارەباش بزوتنەوەی ئەلکترۆنەکانە. بەڵام (تفاعل)ی کیمیای بزووتنەوەی کۆمەڵ بوونی ئایۆنەکانەو ئەمە لەوی پێشوو ئاڵۆزترە. هەروا شتی زیندوو لە بزووتنەوەیەکی هەمیشەیی دایە. لەناو کۆمەڵی مرۆڤایەتیشدا ئاڵوگۆڕی هەمیشەیی هەیە! ڕژێمەکانی کۆمەڵایەتی ئەگۆڕدرێن، خەڵکی خۆیانو، شێوەی ڕەوشتو خوویانو تێگەیشتنیان لە ڕووداوەکانو شتی وایان دەگۆڕدرێن.

جا کەوابوو لەمەوە کە وتمان دەگەینە چ ئەنجامێك؟ ئەگەینە ئەم ئەنجامە کە لە دنیادا زۆر چەشنە بزووتنەوە هەن کە ئەمانەن:

١- بزوتنەوەی میکانیکی: کە بریتییە لە گواستنەوەی لەشە وردەکانی مادە، یان گواستنەوەی لەشەکان.

٢- بزووتنەوەی فیزیکی: کە بریتییە لە کاروباری وزەی گەرماییو کارەبایی.

٣- بزووتنەوەی کیمیایی: بریتییە لە (تفاعل)کردنی کیمیایی، واتە یەکگرتنو جیابوونەوەی ئایۆنەکان.

٤- بزوتنەوەی بایۆلۆژی: بریتییە لەو ئاڵوگۆڕانەی لەلەشی زیندوودا ڕوو دەدەن.

٥- بزوتنەوەی کۆمەڵایەتی: واتە ئەو ئاڵوگۆڕانەی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕوو دەدەن.

جا هەروەکو ئەنگلس پیشانی داوە، بزووتنەوەی هەموو ئاڵوگۆڕو بەیەکدا هاتنێکی گەردوون دەگرێتەوە، هەر لە گواستنەوەیەکی

سادەوە تا دەگاتە بیرکردنەوە. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بزوتنەوە ئەو هەموو ئاڵوگۆڕە جۆربەجۆرەیە کە لەشت و مەك‌و دیاردەکاندا ڕوو دەدەن، لە دنیادا ڕوو دەدەن، واتە بەگشتی گۆڕانی مادەیە.

ئایا دەکرێت لە بارێکدا بێت هیچ گۆڕانی تێدا نەبێت؟

بێگومان. . نە. . شتی وا ناشێت. . لە زەمانی کۆنیشدا هێشتا لەدنیادا نە مرۆڤو نەئاژەڵو نەشانەی زیندوو هەبوون لەناو مادەدا ئاڵوگۆڕ هەر ڕووی دەدا.

لە ڕاستیدا لەشەکان لەئەتۆمو وردیلەکان پێك هاتوون کە ئەمانیش بەردەوام دەخولێنەوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە هیچ لەشێك نەبووەو ناشبێت وەستاوبێتو بەهیچ جۆرێك جووڵانەوەی نەبێت. جا لەبەرئەوەی ئەتۆمو وردیلەکانو ئەلکترۆنەکان هەن، ئەمانە دوور نین لە (تفاعل)کردنی کیمیایی. لەمەوە ئەگەینە ئەو ئەنجامە کە هەروەها شێوەی کیمیایی جووڵانەوەی مادە هەبووە.

بەم جۆرە دەردەکەوێت کە هیچ حاڵەتێکی وانەبووە مادە بێ جووڵانەوە بووبێت. لە بەر ئەوە دەڵێین جووڵانەوە شێوەی مانەوەو بوونی مادەیە. جووڵانەوە خاسیەتێکە لەمادە جیا نابێتەوە. مادە بێ جولانەوە نابێت و، تەنیا لە جووڵانەوەدا هەیە. ئایا ئەوەی باسکرا مانای وایە ماتێریالیزمی دیالەکتیك نکۆڵیی لە بوونی نەبزوتن(سکون) دەکات؟ نەخێر. . . نکۆڵی لێ ناکات. . نەبزوتن لە سروشتدا هەیە، بەم نسبییە. ئەمەش مانای وایە هیچ دیاردەیەك







نییە کە جووڵانەوەی تیا نەبێت و هەموو شتێك لەناو جووڵانەوەدا ساکنە.

ئەگەر لە شتێك نەبزوێت ئەوە بە نیسبەت شتێکی ترەوەیە. بۆ نموونە لە کاتی جووڵانەوەی شەمەندەفەردا ئێمە لە چاو شەمەندەفەرەکەدا نەجولاو دەبین، بەڵام لەگەڵ شەمەندەفەرەکەدا پێکەوە لە حاڵەتی بزووتنەوەدا دەبین.

تێگەیشتنی نەبزووتن بە جۆرێکی دیالەکتیك لە بنچینەوە جیاوازە لە تێگەیشتنی میتافیزیکی. میتافیزیکەکان وا لە نەبزووتن تێ دەگەن کە نەبوونی هەموو چەشنە جووڵانەوەیەکە، بەڵام ماتێریالیزمی دیالەکتیك پێچەوانەی ئەم تێگەیشتنەیە، ئەوەی لە سروشتدا بایەخێکی تەواو کاریگەری هەیە نەبزوتن نییە، ئەگەر چی بە جۆرێکی نیسبیشە، بەڵکو بزوتن و پەرەسەندن و گۆڕانە. ئێمە وەك دیمان مادە، سروشت، بە هیچ جۆرێك پێویستی نییە بە (بزوێنەرێك)چونکە بزوتنەوەی ناوخۆیی لەگەڵدایە، خاسیەتێکی بنچینەییە کە لێی جیا نابێتەوە. ئەم پرسیارەش هیچ مانایەکی نییە کە بوترێ: ئەوەی کە لە ئەزەڵەوە هەیە لە کوێوە پەیدا بووە؟:

## کات و شوێن دوو شێوەی بوونی مادەن

هەموو شتێك درێژی و پانی و بەرزی هەیە و شوێنێکی تایبەتی داگیر دەکات و، هەر شتە بارێکی تایبەتی هەیە لە چاو شتەکانی تردا. . . دوور ترە یان نزیك ترە، بەرزتر یان نزم ترە، لای ڕاستە یان لای چەپە. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە هەموو شتێك لە شوێنێکی تایبەتیدا هەیەو مەحاڵە بە جۆرێکی تر بگونجێت. وەك زانیومانە کە هەموو ئەو شتانەی لە دنیادا هەن پێیان دەوترێ مادەو لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مادە لە شوێندا نەبێت نییەو، لەبەر ئەمەشە کە شوێن بە شێوەیەکی بوونی مادە ناو دەبرێت.

هەروەکو لەمەوبەر پیشانماندا هەموو دیاردەکانی دنیا لە بارێکی هەمیشەیی ئاڵوگۆڕو جوڵانەوەو پەرەسەندندان، جگە لەمە هەموو دیاردەکان لە دنیادا بە چەشنێکی تایبەتی بە دوای یەکدا دێن: ڕۆژ لە دوای شەو دێت و دوای سەرمایەداریش سۆشیالیستی دێت. هەندێك ڕووداو زووترو هەندێکیان درەنگتر دێن و، هەموو درێژە دانێکی تایبەتییان هەیە. ئەم ئاڵوگۆڕو پەرەسەندنە، ئەم بەدوای یەکدا هاتن و، درێژەپێدانە، تەنیا لە سنوری کاتدا ڕوو دەدەن و بەبێ کات ناگونجێن، بەم چەشنە ئەبینین هەموو شتێکی دنیا لەکاتدا ڕوو دەدات.

لەبەر ئەمە کاتیش شێوەیەکی بوونی مادەیە. لینین لە کتێبی







((ماتیریالیزم و ئیمپریوکریتیچیزم – ماتیریالیزم و ڕەخنەی تاقیکردنەوە)) دا دەڵێ:

((لە دنیادا هیچ نییە جگە لە مادەی جووڵاو، ئەمیش تەنیا لە شوێن و کاتدا توانای جووڵانەوەی هەیە))*. شوێن بریتیە لە شێوەی بوونی مادەو جێگای بوون و درێژییەکان وقەوارەی لاشەی مادەیی دیاری دەکات. بەڵام کات لایەنێکی تری بوون و پەرەسەندنی مادە دیاری دەکات: بەدوای یەکدا هاتن و ماوەی ئاڵوگۆڕی لاشەی مادەیی. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە شوێن و کات خاسیەتی جیاوازیان هەیە. ئایا ئەو خاسیەتانەی شوێن و کات کامانەن:

شوێن سێ باری درێژیو پانیو بەرزی هەیەو ئەمانەن گرنگترین خاسیەتەکانی شوێن. هەموومان دەزانین کە ئاڵوگۆڕی دیاردەکان لە کاتدا تەنیا بە یەك ڕێبازا دەڕوات ! لەڕابردووەوە بۆ ئێستاو بۆ دواڕۆژ، تێپەڕبوونی کات بە پێچەوانەی ئەمەوە ڕوو نادات، مەگەر تەنیا لە سەر گوزشتە و چیرۆکە خەیاڵیەکاندا مرۆڤ توانیبێتی ((ئامرازێکی کات)) دروست بکات کە سەعات ژمێرو دەقیقە ژمێرەکانی ((بەپێچەوانەوە)) بجوڵێنەوە. مەحاڵە هەموو پلەکان بە ڕێبازی پێچەوانەدا بسوڕێنەوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە گرنگترین خاسیەتی کات ئەوەیە کە ناگەڕێتەوە بۆ دواوە.

* (لینین – دانراوەکان – چاپی چوارەمی ڕووسی بەرگی ١٤ لاپەڕەی ١٦٢).

ئەگەر شتێك جێگایەك لە شوێندا بگرێت، ئەمە تەنیا لە کاتێکدا دەبێت وەکوو: ئەمرۆ، یان دوێنێ، یاخود بە کورتی بڵێین ((لە کاتێکی دیاریکراودا))، لە کوێ؟. . کەی؟. . . ئەم دوو پرسیارە بە توندی پێکەوە بەستراونەتەوە، کات و شوێنی رووداوەکە روون دەکەنەوە.

بەم جۆرە، کات و شوێن بە توندی لەگەڵ یەك هاوپەیوەندن و ناگونجێ لە یەکتری جیا بکرێنەوە، نە شوێن بەبێ کات و نەکات بەبێ شوێن هەیەو، لەبەر ئەوەی مادە لە شوێن و کاتدا هەیە ناکرێ شوێن و کات لەیەك جیابکرێنەوە، هەروەها ناشتوانرێت لە مادە جیا بکرێنەوە. لەپێش سەرەتای چەرخی بیستەمدا، لە زانیاریدا بیروڕای زانای مەزنی سروشتی (ئیسحاق نیوتن ١٦٤٢- ١٧٢٧) بڵاوبووەوە کە گوایە شوێن و کات بەجیاوازی لە مادەو بە چەشنێکی سەربەخۆ لە شت و مەکی مادەیی هەن و، شوێن شتێکە وەکو سندوقێکی گەورە یان ژوورێکی وا گەورەیە کە کۆتایی نییەو بەبێ دیوارو سەقف و زەوی، دەتوانرێ شتی تێ بخرێ و لێی لابرێت، وەکوو هەموو دنیای دەورو پشت لەناو ئەم ((سندوقە)) یا ئەم ((ژوورە)) دا ((دانرابێت)). لەمەوە نیوتن گەیشتە ئەم ئەنجامە کە گوایە شوێن ((مطلق)) ە، واتە سەربەخۆیە لە مادە، هەروەها نیوتن بە جۆرێکی وا سەرنجی دەدایە (کات) کە ئەمیش (مطلق) ەو هیچ پەیوەندی بە مادەوە نییە و سەربەخۆیە. ئەمە بیروڕای ماتێریالیزمی میتافیزك بوو.

بەڵام فیزیکی مەزنی چەرخی بیستەم ئەلبرت ئەنشتانین (١٨٧٩- ١٩٥٥) کە تیئۆری (نسبی) دۆزییەوە بە چەشنێکی جیاواز مەسەلەی







(شوێن و کات) ی چارەسەر کردو، بەپێی باوەڕ سەلماندی کە دامەزرێنەرانی ماتێریالیزمی دیالەکتیك(مارکس و ئەنگلس) دەریان بڕیبوو کە شوێن و کات لەگەڵ یەك و لەگەڵ مادە هاوپەیوەندن و هەردوو لایان لەسەر خاسیەتەکانی مادە پێك هاتوون.

بە ڕواڵەت وادیارە کە لەسەر زەوی و لەسەر ساروخێك بەخێراییەکی نزیك لە خێرایی ڕووناکی بڕوات ئەوا لەناو ئەو ساروخەدا کات زۆر بە هێواشتر وەك لە کاتی سەر زەوی تێپەڕ دەبێت، وا خەیاڵ بکەن کە لەساروخێکی لەو چەشنەدا بۆ ماوەی سێ ساڵ بفڕین ئەو کاتە زۆر سەرسام دەبین کە دەگەڕێینەوە بۆ سەر زەوی و دەبینین لەسەر زەوی ماوەی ٣٦٠ ساڵ تێپەڕیوە. بێگومان خەیاڵێکی وا کارێکی گرانە، بەڵام لە راستیدا وایە، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە زەوی کاتی خۆی هەیە و ئەو ساروخەش کە بە خێراییەکی نزیك لە خێرایی روناکی بڕوات کاتی خۆی هەیە. کات نسبییەو لەسەر خێرایی جووڵانەوە وەستاوە ڕۆیشتنی هەر لەشتێك چەند خێراتر بێت لە شوێنێکدا ئەوەندە تێپەڕبوونی کات بەنیسبەت ئەو لەشەوە لە سەر خۆتر دەبێت. هەروەها شوێنیش خۆی نسبییە. ئەگەر گریمان شەمەندەفەرێك بەخێرایی نزیك لە خێرایی رۆژ لە نزیك شۆستەی مەحەتەکەیەوە بڕوات (خێرایی رۆژ لەسانیەیەکدا ٣٠٠ هەزار کیلۆمەترە) سواربووەکان دەبینین شۆستەکە کورت بۆتەوە بەڵام ئەوانەی لەسەر شۆستەکە وەستاون بەپێچەوانەوە دەبینن شەمەندەفەرەکە کورت بۆتەوە. ئەوە وەنەبێ تەنیا وابێتە بەرچاوو

هه‌ڵه‌ی بینین بێت، به‌ڵكو راستییه‌كی مه‌وزوعییه‌ به‌م جۆره‌ ده‌رده‌كه‌وێ كه‌ شوێنیش نسبییه‌.

ئایدیالیسته‌كانی هاوچه‌رخ هه‌وڵی شێواندنی ئه‌مه‌ ده‌ده‌ن كه‌ له‌لایه‌ن زانیارییه‌وه‌ دۆزراوه‌ته‌وه‌ ئه‌وان ده‌ڵێن: له‌به‌ر ئه‌وه‌ی شوێن و كات نسبییه‌ به‌ جۆرێكی مه‌وزوعی نین، به‌ڵكو ته‌نیا له‌ هۆشمه‌ندیی مرۆڤدا هه‌ن، به‌ڵام ئه‌مه‌ راست نییه‌ زانیاری تازه‌ هه‌موو ئه‌و چه‌شنه‌ بیروباوه‌ره‌ میتافیزیكیانه‌ی به‌درۆ خستۆته‌وه‌.

مرۆڤ هه‌ر چه‌نده‌ ناتوانێت كات رابگرێت به‌ڵام ده‌توانێ له‌ به‌رامبه‌ر تێپه‌ڕبوونی مه‌وزوعییانه‌یدا ده‌سته‌پاچه‌ نه‌بێت و ده‌توانێ بۆ به‌رژه‌وه‌ندی خۆی به‌كاری بێنێت.

چه‌ند مرۆڤ بتوانێ كات باشتر به‌كاری بێنێ، ئه‌وه‌نده‌ زۆرتر له‌قازانجی ده‌بێت، بۆ نموونه‌ له‌ وولاتانی ئیشتراكیدا پله‌ی په‌ره‌سه‌ندنی به‌رهه‌م  به‌رزو پێشكه‌وتووه‌، ئه‌مه‌ ده‌بێته‌ هۆی ئه‌وه‌ی له‌ پێشبڕكێی ئابووری له‌گه‌ڵ وولاتانی سه‌رمایه‌داریی پێشكه‌وتوودا سوود وه‌ربگرن له‌كات. نموونه‌یه‌كی تر: گه‌لی كۆماری (مالی) له‌ هه‌وڵ و كۆششدایه‌ به‌ مه‌به‌ستی هێنانه‌دی پرۆژه‌ی پێنج ساڵه‌ بۆ بوژاندنه‌وه‌ی ئابووری نیشتمانی. هه‌وڵ ده‌دات ئه‌م پێنج ساڵه‌ به‌كاربهێنێت بۆ پته‌وكردنی سه‌ربه‌خۆیی وولات و به‌رزكردنه‌وه‌ی راده‌ی ژیانی گه‌ل. ئه‌مه‌ش مانای وایه‌ گه‌ل و حكومه‌تی مالی هه‌وڵ ده‌ده‌ن سوود له‌كات وه‌ربگرن. !







## دوایی نه‌هاتن، ویه‌كێتیی دنیا

شوێن دوایی نایه‌ت و، كاتیش نابڕێته‌وه‌و هه‌میشه‌ییه‌. . . له‌به‌ر ئه‌وه‌ دنیاش به‌ هه‌موو لایه‌كدا راكشاوه‌، بۆسه‌ره‌وه‌و بۆ خواره‌وه‌، بۆ لای راست و بۆلای چه‌پ دوایی نییه‌. له‌كاتێكیشدا نه‌ سه‌ره‌تایی بووه‌و نه‌ كۆتایی ده‌بێت.

زانیاری بێ چه‌ندو چون ئه‌و باوه‌ره‌ مادییه‌ی سه‌لماندووه‌ كه‌ جیهان دوایی نییه‌و شوێنیش دوایی نییه‌. زه‌وی وه‌ك ده‌نكه‌ لمێك وایه‌ له‌ ده‌ریای ئه‌م گه‌ردوونه‌دا كه‌بێ كه‌ناره‌. بۆ پێوانه‌ی گه‌ردوون كیلۆمه‌تر به‌كار نایه‌ت، به‌ڵكو ساڵی روناكی كراوه‌ته‌ پێوانه‌، واته‌ ئه‌و ماوه‌یه‌ی تیشكی روناكی له‌ ساڵێكدا به‌خێرایی جووڵانه‌وه‌ی روناكی ده‌ی بڕێت و)(٣٠٠) هه‌زار كیلۆمه‌تره‌یه‌ له‌ سانیه‌یه‌كدا ئێستا زانایه‌كی گه‌ردوون ناسی خه‌ریكی لێكۆڵینه‌وه‌ی ئه‌و ئه‌ستێرانه‌ن كه‌ یه‌ك ملیار ساڵی روناكی و پتریش له‌ ئێمه‌وه‌ دوورن، ئه‌مه‌ش مانای وایه‌ كه‌ ئه‌و ساروخه‌ی به‌ خێرایی (٥٠) هه‌زار كیلۆمه‌تر له‌ سه‌عاتێكدا بڕوات دوای هه‌زاران ملیار ساڵ ئینجا ده‌توانێت بگاته‌ جێ! ئه‌م دوورییه‌ ئه‌وه‌نده‌یه‌ كه‌ زۆر به‌گران عه‌قڵ ده‌ی بڕێت، به‌ڵام سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ش زانیاری ده‌ڵێت ئه‌وه‌ دوا مه‌نزڵ نییه‌. له‌ ئێواراندا ته‌ماشای ئاسمان بكه‌ن ده‌بینن به‌ ئه‌ستێره‌ چنراوه‌، هێنده‌ی ئه‌ستێره‌ تێدا ده‌بینرێت، هه‌موو ئه‌م رژێمه‌ی ئه‌ستێرانه‌ی كه‌ رۆژیش به‌شێكه‌ له‌وان پێی

دەوترێت (مجرە)، ژمارەی ئەستێرەکانی ئەم (مجرە) یە(١٥٠) ملیار ئەستێرە دەبن و، بەملیۆنانی تر وەك ئەم (مجرە) یە لە ئاسماندا هەن، زاناکان توانیویانە بەهۆی بە هێزترین روانگەوە – بەهۆی گەورەترین تەلەسکۆبی بینینەوە لەم شتانە بکۆڵنەوە بەلاّم ئەمەش ((کۆتایی جیهان)) نییە. ئەمەش مانای وایە کە دنیا سنورێك و دواییەکی نییە و هەر لەبەر ئەمەش هەوڵ و کۆششی ئایدیالیستەکان بێ ئەنجامە کە دەیانەوێ ئەوە بسەلمێنن کە جیهان سەرەتای بووەو دوایشی هەیە.

ئەگەر گریمان گەردوون سنورێکی تایبەتی لەشوێندا هەبێ، ئەو کاتە ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە: ئایا لە دەرەوەی سنووری گەردووندا چی هەیە؟ ئاخۆ بەشێوەی گشتی جیهانێکی تر هەیە جگە لە جیهانی مادی؟

زانیاری بە تەواوی ئەوەی سەلماندووە کە جیهانێکی نامادی نییە، ((دنیای غەیب)) و ((ئەودنیا)) نییەو، ناشگونجێت ببێت و، لەبەر ئەوەی جگە لە مادە چیتر نییە، ئەوەی شیاوی گونجان بێت تەنیا دنیایەکی مادەییە، لەبەر ئەوە فەلسەفەی مارکسیزم فێرمان دەکات کە دنیا یەکەو نابێ لەمەش وا تێ بگەین کە لەم دنیایەی ئێمە تیایدا دەژین بەولاوە دنیایەکی تر نییە زانای ئیتالّی مەزن جوردانۆ پرونو(١٥٤٨- ١٦٠٠) ئەوەی سەلماندووە کە زۆر دنیای وا هەیە بەلاّم هەموویان مادەیین و تێکرا جیهانێکی مادی پێك دێنن. جگە لەمەش یەکێتی دنیا مانای ئەوەیە کە هەموو شت و مەك و دیاردەکان و





فەلسەفەی مارکسیزم

پروچیسەکان(عملیات) هاوپەیوەندن لەناویەکدا بە شێوەیەکی وان کە کۆمەڵە شتێکی دوورە پەرێز نییەو هەموویان تێکرا یەکن.

جا بابزانین چی یەکێتی دنیا دەسەلمێنێت؟ پەرەسەندنی فەلسەفەو زانستەکانی سروشت بەچەشنێکی دورو درێژوگران ئەمەیە وەلاّمی ئەنگلس بۆ ئەو پرسیارە. لە زەمانی کۆندا، لەکاتێکدا مرۆڤ بە جۆرێکی زانستیانە لە رۆژو ئەستێرەکان تێ نەگەیشتبوون، وایان دائەنا کە ((دنیای ئاسمان)) واتە (ئەستێرەکان و رۆژو مانگ) زۆر جیاوازن لە دنیای زەوی. ئا بەم جۆرە باوەڕ بەرامبەر دوو دنیا پەیدا بوو، بەلاّم بەرە بەرە لەگەڵ پێشکەوتنی زانیاریدا پەردەی نهێنی لادراو دەرکەوت کە ((ئاسمان)) لە بنچینەدا مادەییەو وەك ئەم جیهانەی تێیدا دەژین.

یەکەمین لێدانێکی باوەڕی چەوت دەربارەی گەردوون لەلایەن زانای مەزنی پۆلۆنی نیکۆلاّی پیرنێکەوە بوو (١٤٧٣- ١٥٤٣). ئەم زانایە ئەو باوەڕەی دەربڕی کە بەهیچ جۆرێك زەوی ناوەندی گەردوون نییە، بەڵکو ئەمیش ئەستێرەیەکی عادەتییە لە رژێمی رۆژدا. بەم چەشنە سەلمێندرا کە نابێت بە زەوی بەرەنگاری ((ئاسمان)) بکرێت و، هیچ شتێکیش لە ئاسماندا نییە کە لە سەروو سروشتەوە بێت.

لە سەدەی هەژدەیەمدا زانای مەزنی ئینگلیز ئیسحاق نیوتن ئەوەی سەلماند کە هەر بەپێی ئەو یاسایانەی میکانیك وەك چۆن زەوی بەدەوری رۆژدا دەسوڕێتەوە، هەر ئاواش مانگ ناچار دەکات بە دەوری زەویداو، ئەستێرەکانی تر بە دەوری رۆژدا بسوڕێنەوە،

ئەستێرەکات هەر لەو شتانەی دروست بوون کە زەوییان لێ پێك هاتووە. ئەمە ئیسپات بووە کە ئەو شتانەی زەوی و ئەستێرەکانی تریان لێ پێك هاتووە بە تەواوی یەکن. ئەمەش لە لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی ئەو لەشانەوە دەرکەوتووە کە لە قوڵایی ئاسمانی دوورەوە دەکەونە سەر زەوی، بۆ نموونە نیازك و (شهب) بەشی سەرەکی پێکهاتنیان ئاسنە کە لەسەر زەویش زۆرە. ئەمەش بێگومان ئەوە دەسەلمێنێت کە بەهیچ جۆرێك شتێکی ئامادەیی لە ئاسماندا نییە.

ئەمەی ووتمان مانای وایە کە هیچ دیاردەیەك لەم دنیایەدا نییە کە ئەنجامی جووڵانەوەی مادە و پەرەسەندنی مادە نەبێت، مادە هەموو شتێك دەگرێتەوەو کار تێکردنی دەگاتە گشت شوێنێك و، جگە لە مادەی جووڵانەوەو پەرەسەندوو، بەرهەمەکانی هیچ جۆرە شتێکی تر وجودی نییەو جگە لەو ناکرێ و ناتواندرێ شتێکی تر ببێت، ئەمەش مانای وایە کە تەنیا دنیای مادەیی هەیەو یەکێتیی هەیەو یەکێتیی دنیا وا لەوەدایە کە مادەییە.

دوای ئەمەش دێینە سەر باسی پەیوەندی دنیای مادەیی بە هۆشمەندییەوە.







# بەشی سێیەم

# مادەو هۆشمەندی

**هۆشمەندی خاسیەتی مادەیەکە خاوەنی ڕێکوپێکییەکی یەکجار بەرزە:**

لە سەردەمی پێش مێژووەوە، مرۆڤ ویستویەتی پەیوەندی نێوان لەش و ئەوەی پێی دەڵێن گیان، یاخود وەکو تر بڵێین هۆشمەندی مرۆڤ بزانێت، بەڵام چاری ئەم مەسەلەیە یەکجار گران بوو. چۆن دەتوانرێت لە شتێك بکۆڵرێتەوە کە نابینرێو نابیسترێو ڕەنگی نییە؟ لە ڕاستیدا هۆشمەندی ئێمە بەو جۆرەیە. هیچ کەسێك نازانێت بیرم چییە تا باسی نەکەم. کەواتە بیرکردنەوە چییە؟ بیر چییە؟ ئایدیالیستەکان چەندان سەدەو تا ئێستاش ئەم پرسیارانە بۆ مەبەستی خۆیان بەکار دێنن.

ئایدیالیستەکان دەڵێن سەرچاوەی ژیان و بیر دەروونە، گیانە. مەحاڵە لەش بەبێ گیان ببێت، لەش مردووە. ئایدیالیستەکان لافی ئەوە لێ دەدەن گیان (ڕوحیانەت) دەتوانێت بە تەواوی لە لەش جیابێتەوە دەڵێن لە کاتی لە دایك بووندا گیان لە لەشدا دەژی و لەکاتی مردندا لێی جیادەبێتەوە. بەڵام ئایا ئەمە ڕاستە؟ بابزانین مەسەلەکە چۆنە؟

هۆشمەندی بریتییە لە بیروباوەڕو هەست و (تصور) کردن و خواست و ئیرادە. لە پلەی یەکەمدا مرۆڤ هۆشمەندی هەیە. ئەگەر

یەکێك نەبێت هەست بکات، ئەوا هەست کردنیش نابێت، خۆ ئەگەر یەکێك نەبێت حەز بکات واتە مرۆڤ نەبێت، ئەوا حەزکردنیش نابێت. هەروا ئەگەر یەکێك نەبێت ئیرادەی هەبێت، ئەوا ئیرادەش نابێت.

راستە هەندێك لایەنی هۆشمەندی لە ئاژەڵیشدا هەیە. بۆ نموونە: هەستکردن بە رەنگ و بۆن، وەتا کەمێکیش تێگەیشتن، بەڵام ئەم لایەنانەی هۆشمەندی ماوەیەکی زۆر نییە کە پەیدا بوون.

لەمەی سەرەوە دەردەکەوێت کە سروشت نەك تەنیا پێش مرۆڤ، بەڵکو لە پێش هەموو زیندەوەرێکدا هەبووە، بەم جۆرە دەردەکەوێت کە بوونی سروشت سەربەخۆیە لە هۆشمەندی.

ئەم یەکەمینە، وەهیچ لە توانادا نەدەبوو کە هۆشمەندی لەپێش سروشتەوە ببێت، بۆیە ئەمیان دووەمینە.

لە زۆر دەمێکەوە سەرنجی ئەوە دراوە کە دەشێت پیاو هەندێك جار تەنیا بە برینێکی گەورە ببورێتەوە: واتە لە هۆش خۆی بچێت و هۆشمەندی نەمێنێت. زانیاری ئەوەی سەلماندووە کە بوورانەوە – نەمانی هۆشمەندی – بەهۆی کەمی خوێنەوە لە مێشکدا روو دەدات، یان لە ئەنجامی نەخۆشییەکی گران لە دڵ و دەمارەکانی خویندا، یان بەهۆی رووشانی بە ئازارو خوێن بەربوونەوە. ئەمەش مانای وایە کە هۆشمەندی لەسەر ئەو پروچیسە مادییانە(العملیات المادیە) وەستاوە کە لەناو لەشدا روو دەدەن، لە مێشك و لە دەمارەکانی سەر بەمێشکدا، مردن و لەناو چوونی لەش دەبێتە هۆی لەناوچوونی هۆشمەندی.

ئەمەش نموونەیەکی تر: هەموومان دەزانین کە ئەگەر پیاو







هیلاك، وماندووبێت، بیروباوەڕیشی وەکو پێویست رووناك نابێت، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر پیاو کەمێك بحەسێتەوە و وەرزش بکات یان خۆی بشوات ئەوا هەستیشی چاك دەبێت و بیروباوەڕیشی روون دەبێتەوە.

بەم جۆرە دووبارە دەگەینە ئەوەی کە بەبێ مادە هۆشمەندی نایەتە بوون، بەڵام ئایا هەموو مادەیەك بیردەکاتەوە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە تەنیا هێندە بەسە کە سەرنجێکی دنیای دەوروپشتمان بدەین و بڵێین: نەو. . . بۆ نموونە بەرد بیر ناکاتەوە. . . هەروا هەموو سروشتێکی نازیندوو بەشێوەیەکی گشتی. هەروا نیشانەی هۆشمەندی لەزۆر چەشنەگیان لەبەریشدا نییە.

جا ئایا کەی هۆشمەندی پەیدا بووە؟

زانیاری ئەم سەردەمەی سروشت سەلماندوویەتی کە سروشتی زیندوو لە سروشتی نازیندوو پەیدا بووە، ئەم بۆ چوونەش بایەخێکی یەکجار گەورەی هەیە. ئایدیالیستەکان لافی ئەوەیان لێ دەدا کە گوایە سروشتی زیندوو هیچ پەیوەندی لەگەڵ سروشتی نازیندوو نییە. ئەوان دەیان ووت گوایە شتە زیندووەکانو نازیندووەکان جیاوازییەکی یەکجار زۆریان لە نێواندا هەیە. لەڕاستیشدا وایە، زیندەوەرەکان بەپێچەوانەی بێگیانەکانەوە دەجوڵێنەوەو زۆر دەبن و پێ دەگەن و بە خۆدا دێن. بەڵام ئایدیالیستەکان هەر لەو کاتەدا نەیان دەتوانی لەو شتە هاوبەشەی لە نێوانیاندا هەیەتی بگەن. لەبەر ئەوە ئەو بیروڕایە هاتە ناوەوە کە گوایە لەناو شتی زیندوودا ((هێزێکی تایبەتی ژیان))

هەیە وایان لێ دەکات کە زۆر لە سروشتی زیندوو جیاوازبن.

جا ئایا ئەمە راستە؟

بێگومان شتی زیندوو جیاوازە لە سروشتی نا زیندوو، بەلاّم هەر لەو کاتەشدا بە توندی لە گەلێکدا هاوپەیوەندە. بۆ نموونە: شتی زیندوو لە هەندێك توخمی وەك کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین و ئاسن و گۆگردو فسفۆرو شتی وا پێك دێت. هەروەها ئەم توخمانەش خۆیان زۆر جار رێك دەکەوێت کە لە سروشتی نا زیندوودا دەبن. هەروەها لە زیندەوەردا تاقە یەك توخم نییە کە لە سروشتی بێ گیاندا نەبێت. هەموو ئەمەش ئەوە دەسەلمێنن کە پەیوەندی هەردوولایان بە ئاشکرا دیارە. زانیاریش دوای لێکۆڵینەوەی ئەم چەشنە راستیانە ئەوەی دەرخستووە کە مادەی زیندوو لە مادەی نازیندوو دروست بووە.

بەلاّم پەیدابوونی ژیان لەسەر زەوی و، پەیدابوونی یەکەمین شانە هێشتا مانای پەیدابوونی هۆشمەندی نەبووە. واتە لەگەڵ ژیاندا تەنیا یەکەمین سەرەتاکانی هۆشمەندی دەرکەوتوون.

هۆشمەندی بەستراوە بە چالاکی هەردوو بەشە گەورەکەی مێشکەوە. ئەم دوو بەشەی مێشك ئەنجامی پەرەسەندنی بەرەبەرەن کە چەندان سەدەیان خایاندووەو لەمەدا کۆئەندامی دەمار ((الجهاز العصبی)) پەرەی سەندووەو چالاکی و هەڵسوڕانی ئاڵۆز بووە. هەروەها رەوشت و هەڵسو کەوتی ئاژەڵیش پەرەی سەندووەو ئاڵۆزبووە تا مێشکی مرۆڤ پەیدا بوو، لەگەڵ ئەمەشدا هۆشمەندی مرۆڤ دەرکەوت.







دیاردە هەرە بەرزەکانی چالاکی و هەڵسوڕانی دەماریش پەیوەندی بە توێکڵی هەردوو نیوە گەورەوکەی مێشکەوە هەیە. بڕواهێنان بەمەش ئەو کاتە ئاسانە کە پەرەسەندنی کۆئەندامی دەمار لەگەڵ چۆنیەتی ئاڵۆزبوونی هەڵسوڕانی ئاژەڵ بەو پێیە، بەراورد بکەن. بۆ نموونە:ئەو ماسییانەی کەمێشکیان توێکڵی نییە ساکارترین هەڵسووڕانیان هەیە. بەلاّم ئەو هەڵسوڕانە لە باڵندەدا زۆر ئاڵۆزترە، چونکە لەملیاندا توێکڵ هەیە. ئەو سەگانەش کە توێکڵی مێشکیان زۆر لەهی باڵندە پەرەسەندووترە. ئەبینین ئەم هەڵسوڕانەیان زۆر ئاڵۆزترە. بەلاّم ئەو مەیمونانەی کە لە مرۆڤ دەچن، هەرچی جووڵانەوەیەکی ئیرادەییان لێ دەرکەوێت، دەگەڕێتەوە بۆ توێکڵی هەردوو نیوە گەورەوکەی مێشك، سەرەڕای ئەوەش، ناتوانرێت باسی بیرکردنەوەی ئاژەڵ بکرێت بەمانای راستی ئەم وشەیە. بیرکردنەوە خاسیەتێکی تایبەتی مرۆڤە، بەستراوە بەپەیدابوونی بەرزترین شێوەی مادەوە لە رەوتی پرۆچیسی پەرەسەندنی بەرەبەرەدا، ئەم بەرزترین شێوەیەش مێشکی مرۆڤە. وەنەبێ هۆشمەندی بەرهەمی هەموو جۆرە مادەیەك بێت، بەڵکو بەرهەمی مادەیەکی وایە کە خاوەنی رێکوپێکییەکی بەرزە-بەرهەمی چالاکی مێشکە. هۆشمەندی فەرمانی مێشکەو بەبێ مێشك بوونی نییە، ئەمەش کەوا هۆشمەندی لەسەر مێشك راوەستاوە مەسەلەیەکە ئەو راستییە سەلماندوویەتی کە دەتوانرێت مرۆڤی مردوو زیندوو بکرێتەوە ئەگەر مردنەکە پێش کاتێکی کەم رووی دابێت. بەلاّم ئەگەر کاتێکی زۆری بەسەردا

تێپەڕبوو، هەندێ پرۆچیسی وا لە ناو مێشکدا ڕوو دەدەن کە دەبنە هۆی تێکوپێك چوونی بەتەواوی.

لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانرێت دڵ بخرێتەوە کار، بەڵام خستنەوە کاری مێشك مەحاڵەو ناگونجێت: لەناو مێشکدا هەندێك پرۆچیسی وا ڕوو دەدەن کە پێیان دەوترێ ئەو پرۆچیسانەی گەڕانەوەیان بۆنییە. لەبەر ئەمە هۆشمەندی بەبێ گەرانەوە لەدەست دەچێت، ئەمەش بەتەواوی لەبەر ئەوەیە کە مێشك تا هەتایە لەکار وەستاوە، کەواتە هۆشمەندی چییە؟

با سەرنجی هەر بیرێك، یان هەر ئاخاوتنێك بدەین، بۆ نموونە: ئەم ڕستەیە ((من ئەم کتێبە دەبینم))، ((ئەو ماڵە بەرزە)) شتێکی ئاشکرایە کە ئەوەی لە مێشکدا هەیە کتێبەکە نییە، بەڵکوو بیرێکە دەربارەی کتێبەکە، هەروا ماڵەکە نییە، بەڵکو بیرێکە دەربارەی ماڵەکە. بەم جۆرە دەتوانین بڵێین ئەوەی لە سەرماندایە وێنەی شتەکان و دیاردەکانە. هەموو بیرێك لە چەند تێگەیشتنێك(مفاهیم) پێك هاتووە، بۆ نموونە: ئەو بیرەی لەم ڕستەیەدا ((گەڵاکان سەوزن)) دەربڕاوە بە دوو ووشە پیشان دراوە ((گەڵاکان)) و ((سەوزن)) جا ئایا ئەم تێگەیشتنانە لە کوێوە وەردەگیرێن؟ لە ژیانەوە، لەڕاستییەوە شتەکان خۆیان بە چەشنێکی مەوزوعی هەن و لەسەر بنچینەیان تێگەیشتن دەربارەیان دادەڕێژین. لە سەرەتادا کتێب هەیە، دوای ئەوە تێگەیشتنێك دەربارەی هەیە. بەم جۆرە پێکهاتنی تێگەیشتن دووەمینە. لەپێش هەموو شتێکدا ڕاستییەکە هەیە. ئینجا پێچەوانە







بوونەوەی و دروستبوونی بیرەکە دەربارەی بەم هۆیەوە لینین بیرکردنەوەی ناوناوە لەبەرگرتنەوەو پێچەوانە کردنەوەی ڕاستی، لە بیرکردنەوەدا سەر لەنوێ ڕاستی بەرهەم دێتەوەو وێنەو نەخشەی لەبەر دەکێشرێتەوە.

پێویستە ئەوە بخرێتە پێش چاو کە دوژمنانی ماتیریالیزم لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە ماتیریالیزم، مادەو هۆشمەندی دەکاتە یەك شت و هەروەها شتەکانی دەروونیش بە مادەیی دادەنێت. ئەمەش بە مەبەستی شکاندنی ناوبانگی ماتیریالیزمە. بەڵام ((ئەوەیان لەبیر دەچێتەوە)) کە ئەوە دەربخەن ئاخۆ بەتەواوی دەربارەی کام چەشنە ماتیریالیزم قسە دەکرێت. بۆ نموونە ماتێریالیزمی دیالەکتیك هیچ پەیوەندییەکی نییە لەگەڵ لاف لێدانی ئەوەی گوایە شتە دەرونییەکانیش مادەن. سەرەڕای ئەوە ماتێریالیزمی دیالەکتیك پەردە لە ڕووی ئەوانە لادەدات کە بە ((ماتیریالیستە ڤولگارەکان)) ((المادیون المبتذلون)) ناو دەبرێن. چونکە ئەمانە بیرو مادە دەکەنەیەك شت. ئەوان دانیش بەوەدا دەنێن کە هۆشمەندی دووەمینە، بەڵام ناتوانن بە چەشنێکی ڕاست و دروست بایەخداری ڕاستەقینەی لێك بدەنەوە ماتیریالیستە ڤولگارەکان لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە مێشك بیر دەردەدات هەر بەو چەشنەی کە جگەر زراو دەردەدات. بۆیە ناونیشان نراوە ماتیریالیستە ڤولگارەکان چونکە بیرکردنەوە بە جۆرێکی نالەبارو ڤولگارو هیچ و پووچ سادە تێ دەگەن.

لینین رەخنەیەکی توندو بەکاری لە ماتیریالیستە ڤولگارەکان گرت لەوەدا کە هۆشمەندی لەگەڵ مادە تێکەڵ دەکەن. ئەوەشی دەرخست کە هۆشمەندی ماتەری نییە. هۆشمەندی لەبەرگرتنەوەو وێنەیەکی راستییە. بەلاّم ئاشکرایە کە مێشك بەچەشنێکی جیاواز لە کامیرایەکی وێنەگرتن راستی پێچەوانە دەکاتەوەو وێنەی دەکێشێت. لەسەر مرۆڤدا راستی (واقع) بە جۆرێکی گونجاو دەگۆڕێت، واتە ئەوەی لەمێشکدا دەبێت کەرەسەو شت ومەکەکان خۆیان نین، بەڵکو وێنەکانیانن بە چەشنێکی ئایدیالیستی و هەر بەبیرکردنەوە.

بەم جۆرە دەردەکەوێت کە هۆشمەندی مرۆڤ خاسیەتی مادەیەکە خاوەنی رێکوپێکییەکی زۆر بەرزە کە ئەویش مێشکەو راستەقینەی مادەیی وێنە دەکێشێت وەك خۆی پیشانی دەدات.







## بیرکردنەوەو زمان

زۆر جار لە رەفتاری مەیمون سەرسام دەبین، بۆ نموونە ئەگەر مۆزێك بخرێتە بەردەمی مەیمونێك و لەبەردەمی مەیمونەکەشدا ئاگر هەبێت و نەتوانێت خۆی بگەیەنێتە مۆزەکەو بەلاّم ((فێر کرابێت)) کە ئاو لە بەرمیلێکی نزیکەوە ببات و ئاگرەکە بکوژێنێتەوە، بەم جۆرە خۆی دەگەیەنێتە مۆزەکە. هەروا ئەگەر بە جۆرێکی تر ئەمە دووبارە بکرێتەوەو مۆزەکە لە پشت ئاگرێکەوە بخرێتە سەر بەرمیلێکی گەورە لە رووبارێکداو لە دووریشەوە بەرمیلە ئاوەکە دابنرێت و، هەروەك جاری پێشوو پێویست بێت کە ئاگرەکە بکوژێنێتەوەو مۆزەکە ببات، ئەوا هەر چەندە ئاوی رووبارەکە لە مەیمونەکەوە نزیکەو دەتوانێت ئاگرەکەی پێ بکوژێنێتەوە، بەلاّم ئەوە ناکات و هەر چۆنێك بێت هەوڵ دەدات خۆی بگەیەنێتە بەرمیلەکە تا بە ئاوەکەی ناوی ئاگرەکە بکوژێنێتەوە.

ئەم نموونەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە مەیمون هیچ تێگەیشتنێکی دەربارەی ((ئاو)) نییەو خاسیەتەکانی نازانێت و بیرکردنەوەی بەستراوە بەو شتانەوە کە راستەوخۆ لە دەوروپشتیدا هەن و ئەگەر پەیوەندی راستەوخۆی بەوشتانەوە نەبێت بیرکردنەوەش لە تواناداا نابێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە مەیمون تا شتەکانی لە بەردەمدا نەبێت ((بیرناکاتەوە)). ئەگەر ئەمشتانەی

لەبەردەمدا نەبێت ناتوانێت ((بیربکاتەوە)).

بەلام بیرکردنەوە لای مرۆڤ لە رووی چۆنیەتییەوە جیاوازە. مرۆڤ لە کۆڕی هەڵسووڕانی بەرهەم هێنانو کردەوەو، هەڵسووڕانی زانستانەیدا شتەکان دەناسێتو شارەزای خاسیەتەکانیان دەبێتو لێیان دەکۆڵێتەوەو، سەرنجی ئەوە دەدات کە ئاو لە ناو بەرمیلو لە رووبارو لەناو بیرو لە دەریاو لە هەر شوێنێکی تردا بێت هەر ئاوەو خاسیەتەکانی وەك یەکە. بۆ نموونە خاسیەتی ئاگر کوژاندنەوە. بەم جۆرە مرۆڤ تێگەیشتنێك دەربارەی ((ئاو)) پەیدا دەکات. ئەوە نییە ئاوی بەرمیل یان دەریا یان رووبار بێت بەڵکو ((ئاوە بەشێوەی گشتی)). ئەمەش تێگەیشتنێکی گشتییە، لێرەدا مرۆڤ شێوەی تایبەتیو شتی هەست پێکراو نادات، بەڵکو خاسیەتە گشتییەکان لێك جیا دەکاتەوە. کە ئێمە باسی مەفهومی ((درەخت)) دەکەین واتە ((درەخت بەشێوەی گشتی)) مەبەستمان لەو خاسیەتە گشتیانە کە لە هەموو درەختێکدا هەن، نەك تەنیا لەو درەختەی لە باخەکەماندا ڕوواوە، ئێمە لەم حاڵەتەدا سەرنج نادەینە درەختێکی تایبەتی هەست پێکراو، بەڵکو بەشێوەیەکی ڕووت بیردەکەینەوە. لەبەرئەوە بەمە دەوترێت تێگەیشتنێکی ڕووت. ئەمەش خاسیەتێکی بیرکردنەوەی مرۆڤەو ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە بۆ ئاژەڵ نە گونجاوو مەحاڵە بێتەدی. جا ئایا بەهۆی چییەوە دەتوانین نیشانە سەرەکیەکانی شت جودا بکەینەوە، واتە ئەم نیشانانە لە شتەکە خۆی بپچڕین؟ بە هۆی وشە، یان ئاخاوتنەوە ئەمە دەتوانین. وشەی ((درەخت)) ئەوەمان بۆ







ڕوون دەکاتەوە کە باسەکە دەربارەی درەختە بە شێوەی گشتی، نەك دەربارەی درەختێکی تایبەتیو دیاری کراوو مەحاڵیشە بتواندرێت بەبێ وشە بیرێکی ڕوون دەربڕێت، هەر لەسەرەتای منداڵییەوە هۆشمەندی مرۆڤ لەسەر بنچینەی وشە، زمان پەیدا دەبێت، چونکە بەهۆی زمانەوە بیروباوەڕمان دەردەبڕین. لەئاکاری ئەم پڕۆسەشدا بەرەبەرە شتێك پەیدا دەبێت کە تەنیا لە مرۆڤدا دەبێت: بیرکردنەوە پەیوەندی بەتینی لەگەڵ ئاخاوتندا هەیە. جیاکردنەوەی هۆشمەندی مرۆڤ، بیرکردنەوە لە ئاخاوتنی مرۆڤ کارێکی نەگونجاوو مەحاڵەو یەکێتییەکی بێ پسان لە نێوانی زمانو بیرکردنەوەدا هەیە. ئەنگلس ئەوەی ڕاگەیاندووە کە پەیدا بوونی ئاخاوتنی درێژو ڕوون بووە هۆی پەرەسەندنی پتری مێشکی مرۆڤ. جا ئایا هۆیەکانی ئەمە کامانەن؟ ئەم نموونەیە یارمەتیمان دەدات بۆ دۆزینەوەی وەڵامی ڕاستی ئەو پرسیارە:

لە مێژوودا زۆرجار ((پەروەردە))بوونی منداڵان لەناو گەلە گورگدا ڕوویداوە، یەکێك لەم ڕووداوانە لە ساڵی ١٩٥٦ دا لە هیندستان بووە، بەچکە گورگێك منداڵێکی فڕاندووە کە هێشتا تەمەنی نەگەیشتۆتە سێ ساڵان، بەڵام پاش چەند ساڵێك کە منداڵەکەیان دۆزییەوە تەماشایان کرد بەم جۆرە بوو: ئەو منداڵە لەسەر هەر چوارپەل دەڕۆیشتو لاسایی حەیوانەکانی دەکردەوەو دیارە توانای قسەکردنیی نەبوو منداڵەکە لەهەموو شتێکدا لاسایی حەیوانەکانی دەکردەوە، تا ئێرە ئەمە سەرسامی پێ ناوێ. بەڵام ئەوەی لەم

چیرۆکەدا سەیر بێت ئەمەیە کەهەرچی هەوڵیاندا ئەو منداڵە فێری قسەکردن بێت بێ ئەنجام بوو، ئەو منداڵە سیمای مرۆڤایەتی، واتە هۆشمەندی بۆ نەگەڕایەوە. هەروا نەیتوانی لەسەر باری تازەی ژیان ڕابێتو، لە پاشدا مرد.

لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە: ئاشکرایە کەمنداڵەکە لەکاتی لەدایك بوونیدا مێشکێکی مرۆڤانەی ئاسایی هەبوو لە کاتی گەورەبوونو بە خۆدا هاتنیدا دیارە مێشکیشی گەورە دەبوو، جا ئایا هۆی دواکەوتنی بیرکردنەوەی بەو جۆرەی کە هیوای لێ ببڕێت چی بووە؟ وا دیارە بۆ مرۆڤ تەنیا هێندە بەس نییە کەمێشکێکی تەواوی ببێت تا ببێتە خاوەنی هۆشمەندی مرۆڤانە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لەناو کۆمەڵدا لەگەڵ خەڵکدا بژی.

بیرکردنەوەی مرۆڤ لە دەرەوەی کۆمەڵە خەڵکدا نابێت

بیرکردنەوە لە ئەنجامی ژیانی مرۆڤ لەناو کۆمەڵدا پەیدا دەبێت تەنیا لە کاتێکدا بیرکردنەوە پەیدا دەبێت کە مرۆڤ لەلایەکەوە سروشت دەربڕێت و پێچەوانە بکاتەوە، لەلایەکی تریشەوە لەگەڵ خەڵکی ترداو لە هەڵسوڕانی بەکردەوەی بەرهەم هێناندا پەیوەندی تایبەتی پێك بهێنێت، کارکردنە کە مرۆڤ و کۆمەڵی مرۆڤایەتی دروست کردووە. هەر لە ئاکاری کارکردندا، لەناو چالاکی بەرهەم هێناندا، مێشکی مرۆڤ و هۆشمەندی مرۆڤ پەرەی سەندووە. هەر لەبەر ئەوەشە مارکس باسی کردووە کە هۆشمەندی هەر لە سەرەتاوە بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییەو هەرواش دەبێت، تا ئینسان بە شێوەیەکی







گشتی هەبێت هۆشمەندی بەرهەمی ژیانی مرۆڤە لەناو کۆمەڵداو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە.

ئەمەش مانای وایە، کە ناکرێت هۆشمەندی لە دەرەوەی کۆمەڵ بێت و بۆ زمان و ئاخاوتنیش ئەمە هەروایە، ئاخاوتنی درێژو روون واتە زمان، وەك پێداویستییەك و هۆیەك بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاو، هۆیەك بۆ پەیوەندی کردنی نێوان خەڵکی پەیدا دەبێت، تەنیا لەناو ووشەدا بیرەکە دەبێتە شتێکی راستەقینە، تابیرکردنەوە لە مێشکی مرۆڤدا بێت شتێکی مردووەو مەحاڵە دەست خەڵکی تر بکەوێت. هەر لەبەر ئەمەش بوو مارکس رایگەیاند کە زمان بریتییە لە واقیعی راستەوخۆی بیرو ئەمەش مانای وایە کە بەبێ بەرگی زمانەکە، بەرگە مادەییەکە، بیرکردنەوە نییە، تا ئەگەر بە دەنگێکی بەرزیش بیروڕای خۆمان دەرنەبڕین و وەك لە دڵی خۆماندا بیربکەینەوە، ئەو کاتەش هەروا بیروڕای بە بەرگێکی زمان دەپێچینەوە. لە سایەی زمانەوە نەك تەنیا بیروڕایەکان دادەڕێژین و بەس، بەڵکو هەروەها بۆ کەسانی تریش، دەری دەبڕین،

# بیرکردنەوەو ئامراز

ئاشـکرایە کـە زۆر کـەس هەنـدێك شـتیان دەربـارەی ئـامرازی ((زیرەك)) بیستووەو هەندێکیش بـۆ خۆیـان دیویانـە زۆر کـاری گـران دەکەن: ئـەو ئامرازانـە لـە زمانێکـەوە بـۆ زمـانێکی تـر وەردەگێـڕن و فرۆکـەو شـەمەندەفەر لێ دەخـوڕن و، تـا دەگاتـە ئـەوەی کـەیاری شـەترەنجیش دەکـەن. هـەروا ئـەو ئامرازانـە هەنـدێك کاروبـاری مەنتیقیش جێبـەجێ دەکـەن کەلـە فـەرمانی مێـشکی مـرۆڤن، ئەمانـە ((تـێ دەگـەن)) کـەنگی دەبـێ شـەمەندەفەرەکە رابگیرێـت و هەنـدێك پروچـیس و هەڵـسوڕانی تـر ((بیرکردنــەوە)). . هتـد. هــەروەکو بیرکرنەوەی مرۆڤ لێرەدا لـەناو بـەرگێکی ئاسـندا کاربکات. ئەمانـەش پێیان دەوترێت ئامرازەکانی(سیبیرنیتیك). (سیبیرنیتیك) زانیاری ئەو ئامرازانەیە کە خۆبەخۆ رێبەرێتی دەکرێن.

بـەڵام ئـاخۆ دەتوانرێـت ئـامرازێکی وا دروسـت بکرێـت کـە بـە تەواوی جێگەی مێـشکی مـرۆڤ بگرێتـەوە؟ نـەخێر. . ئەمـە لە توانـادا نییە. راستە ئـامراز دەتوانێـت بـە شـێوەیەکی تـەواوی ئـەو کاروبارانـە جێبـەجێ بکات کەلەلایـەن مرۆڤـەوە لەسـەری رادەهێنـدرێت و، هـەروا دەتوانێـت جۆرەهـا راسـتیی نـوێ بدۆزێتـەوە کـە ئـەوەی دروستیـشی کردووە نەیزانێت، بەڵام وێڕای ئەوە ئامراز لە هەموو کاتێکدا لـە چـاو ئەقڵ و ژیری مرۆڤدا تەنیا یارمەتی دەرێکە و بـەبێ مـرۆڤ میتـالیکی







مردووە. (میتال. معدن).

جـا ئایـا بۆچـی مێـشکی مـرۆڤ ئەوەنـدە بـەرزە کـە لەگـەڵ هـیچ ئامرازێکدا بـەراورد ناکرێت؟ چونکە مێـشکی مـرۆڤ بەرهـەمی ژیـانی کۆمەڵایــەتی و هــەروا بیرکردنــەوەی مــرۆڤ بەرهــەمی ژیــانی کۆمەڵایەتییــە و هــەروا بیرکردنــەوەی مــرۆڤ شـێوەو روخــسارێکی کۆمەڵایەتی هەیە. تاقە ((مێشکێکی ئەلەکترۆنی)) نییـە کـە بتوانێـت جیهـانی گیـانی نـاوەوەی مـرۆڤ ((سـەر لـە نـوێ دروست بکاتـەوە))و بیبووژێنێتـەوە خـەون و خـەیاڵ و توانـای خواست و ئـیرادەی بـەکارو دنیـای ئـاڵۆزی هونـەری بـداتێ. ئامرازەکـان تـەنیا ئـەو فەرمانانـەی مرۆڤیان پێ دەکرێت کە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکییانـەی وەك ئامرازیـان هەیـە و لـەوە بـەولاوە هیـچی تریـان پـێ ناکرێت، جـا ئـەو ئـەرك و فەرمانانەی کە ئامرازەکـانی سـیبیرنیتیك لـە جێگـای مـرۆڤ دەیانکەن هەر چۆن بن، هەمیشە هۆیەکن کـە مـرۆڤ و کۆمـەڵ بـەکاریان دەبـەن، بۆ مەبەستی چارکردنی ئەرکەکانی بەرهەم هێنان و زانست و شتی وا، ئامراز توانای بیرکردنەوەی نییە، بەڵکو تەنیا یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ بیرکردنەوە. کاری مەزن و گەورەی تـەکنیکی سـیبیرنیتیك بـە تـەواوی وا لەوەدا کە چالاکی بیرکردنەوەی مرۆڤ ئاسان دەکات.

# بەشی چوارەم
# یاسایەکان و کاتیگۆریە بنچینەییەکان
# لەدیالەکتیکی مارکسیدا

لەمەوبەر ئەوەمان روونکردەوە کە مادە چییەو لەچ شێوەیەکدا هەیە. ئێستاش ئەو یاسایانە تێدەگەین کە بزووتنەوەی مادەو، هەموو پەرەسەندنێکی ناو سروشت و ژیانی کۆمەڵایەتی و هۆشمەندی مرۆڤیان لەسەر پێك دێن. ئەو یاسایانە گشتی و فراوانترین یاسان و، هەموو شت و دیاردەیەکی ئەم جیهانە سەر شۆریان بوون و پێیان دەوترێت یاسایەکانی دیالەکتیکی مارکسیزم، ئەم دیالەکتیکە بە جۆرێك لەم یاسایانە دەکۆڵێتەوە کە زانیارییەکە دەربارەی گشتیترین یاسایەکانی پەرەسەندنی سروشت و کۆمەڵ و بیرکردنەوەی مرۆڤایەتی. یاساو کاتیگۆرییەکانی دیالەکتیك(کاتیگۆری- مقوله) لەناو یەکتردا پەیوەندی زۆر کۆنیان هەیە، وەك هەریەکەیان ئەویتریان تەواو بکەن و هەموو پێکەوە تەواوترین و فراوانترین تێبینیمان بدەنێ دەربارەی ئەو پەرەسەندنەی لە جیهاندا روو دەدات.








## ١- یاسا چییە؟

بۆ تێگەیشتنی ئەوەی کە بە یاسا ناوی دەبەین با سادەترین نموونە باس بکەین:ئەگەر بەردێك فڕێ بدەین، گومانی تێدا نییە کە دەکەوێتە سەر زەوی و، دیارە ئەگەر تیرێکیش لە کەوانەوە بهاوێژین هەر بەو چەشنەی لێ بەسەر دێت.

حا ئایا ئەم دیاردەیە بۆ دەبێ وابێت و هۆی ئەمە چییە؟

پێش هەموو شتێك دەبێ لەوە ئاگاداربین کە ئەم دیاردەیەی باسی لێ دەکەین وانییە هەندێك جار بەو جۆرە رووبدات و هەندێك جاریش وانەبێت. بەڵکو دیاردەیەکە هەر دەبێ بەو جۆرە رووبدات هیچ لە تواناداا نییە و ناگونجێت بەردەکە یان تیرەکە نەکەونەوە سەر زەوی.

شتێك بهاوێژرێت بەهۆی یاسای راکێشان (جاژبیە) ی گشتیەوە دەگەڕێتەوە سەر زەوی. ئەمەش مانای وایە لە بارێکی وادا رژێمێکی رێکوپێکی لە شوێن یەك هەیە کە لێی لانادرێت، کاتێك لە هەڵسوڕان و کرداری رۆژانەشماندا رووبەرووی ئەم چەشنە دیاردەیە دەبینەوە دەڵێین: لێرەدا پەیوەندییەکی یاسایی و بنچینەیی لەنێوان دیاردەکاندا هەیە ئەوەی ئەم پەیوەندییە هەمیشەییە قووڵانەش دەردەبڕێت پێی دەوترێت(یاسا)، واتە یاسا بریتییە لەو پەیوەندییەی کە بەهۆی هەلومەرجێکی لەناکاوی دەرەوەو، راگوزاری نییە، بەڵکو لە سروشتی

ناوەوەی دیاردە هاوپەیوەندەکان پەیدا دەبێت، لە یاساشدا هەموو پەیوەندییەکان دەرناکەون، بەڵکو تەنیا پەیوەندییە بنچینەیی و کاریگەرەکان دێنەروو، بەڵام ئەمە دەربارەی خاسیەتەکانی یاسا نییەو لەیاسادا دەگمەن و شاز نییەو ئەم وتەیە ماناى یاسا روون دەکاتەوەو، واتە یاسا تەنیا لە هەندێك دیاردەدا کارناکات، بەڵکو لەناو گشت دیاردەیەکی ناوخۆیی‌و شتێکی تایبەتیدا ئەو کارکردنەی هەیە. بۆ نموونە یاسای ئەرخەمیدس، باسی شتە گشتی‌و هاوبەشەکانی نێوان هەموو ئەو لەشانە دەکات کە دەخرێتە ناو شلەیەکی تایبەتییەوە. واتە ئەو پەیوەندییەی لە یاسای ئەرخەمیدسدا دەرخراوە (لەنێوانی قەبارەی لەشەکەو هێزی پاڵپێوەنانی شلەکەدا) خاسیەتێکی گشتی هەیە، لە هەموو یاسایەکیشدا هەر بەم جۆرەیە: شتی گشتی‌و هاوبەش لە هەموو دیاردەیەکدا دەردەبڕێت. بەم جۆرە دەبینین یاسا دەربارەی قووڵترین و گشتی ترین شت زانستمان پێشکەش دەکات.

لە یاسادا نەك تەنیا پەیوەندی گشتی، بەڵکو هەروا پەیوەندی پێویستیش هەیە. ئەو شتە یاسا دەری دەبڕێت بە چەشنێکی پێویست و حەتمی دەدۆزێتەوەو دەردەکەوێت.

لە ژیاندا پیاو زۆر جار ووشەی ((یاسا)) بە مانایەکی تریش بەکاردێنێت. بۆ نموونە: دەوڵەتێك دەستورێکی نوێ پەسەند دەکات و ئەو یاسای بنچینەیی ژیانی ووڵاتە. یاسایەکی حقوقییە کە هێزی دادگایی هەیە. بەڵام کە ئێمە باسی تێگەیشتنی فەلسەفییانەی یاسا دەکەین، مەبەستمان لەو یاسایانە نییە کە لەلایەن خەڵکەوە دانراون،








بەڵکو مەبەستمان ئەو یاسایانەیە کەبە جۆرێکی مەوزوعی لەناو سروشت و کۆمەڵدا هەن.

جا لەبەر ئەوەی شت و دیاردەکان بە جۆرێکی مەوزوعی هەن، پەیوەندییەکانی نێوانیشیان، واتە ئەو یاسانەی کە بەگوێرەیان پەرەدەسێنن، هەروا بە چەشنێکی مەوزوعی هەن، لەبەر ئەوەی دەبینین گرنگترین خاسیەتی یاسا ئەوەیە کە بە چەشنێکی مەوزوعی هەیە ئەمەش مانای وایە کە پەرەسەندنی سروشت و کۆمەڵ لەسەر خواست و هۆشمەندی کەس نەوەستاوەو یاسایەکە هەر دەبێ ببێت و تەواوی هەڵسوڕانی رۆژانەی مرۆڤیش بە تەواوی ئەمە دەسەلمێنێت. یاسایەکانی سروشت بە ماوەیەکی زۆر لە پێش کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا کاری خۆیان هەر کردووە. مرۆڤ ماوەیەکی ئەوەندە یەکجار درێژ نییە کەپەیدا بووە. بەڵام ئەو یاسانەی کە ئەم زەوییە بە گوێرەیان دەخولێتەوە لە زۆر دەمێکەوە هەن، هەروەکو زەوی خۆی لە زۆر دەمێکەوە هەیە. ئەم قسەیە بەسەر یاسایەکانی هەروا یاسایەکانی تری سروشتیشدا دەگونجێن، هەروەها یاسایەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیش سروشتێکی مەوزوعییان هەیە، خەڵکی ناتوانن بە ئارەزووی خۆیان نەیاسا دروست بکەن و نەبەتاڵیشی بەکەنەوە.

بەڵام فەیلەسوفە ئایدیالیستەکان بیروڕایەکی تریان هەیە. ئەوان دەڵێن یاسایەکان بە چەشنێکی مەوزوعی نین فەیلەسوفی ئەڵمانی عمانوئیل کانت (١٧٢٤- ١٨٠٤) دەڵێت گوایە سروشت خۆی هیچ یاسایەکی نییەو هەموو شتێکی لە شێوەی ئاژەوەدایەو تەنیا عەقڵی

مرۆڤ دەتوانێت رژێم و رێو شوێنی یاسایی بخاتە ناو سروشتەوەو ئەگەر مرۆڤ نەبوایە یاساکانیش نەدەبوون. فەیلەسوفە بۆرژوازییەکانی ئەم سەردەمەش ئەو جۆرە بیروڕایە بلاّودەکەنەوە، بەلاّم ئاخۆ راستە مرۆڤ لەسەر ئەو شێوازە بیربکاتەوە؟ بێگومان. . نەو.

مرۆڤی سەرەتایی هیچ بیرێکی نەبوو دەربارەی بوونی یاسایەکان لە جیهانداو بە دواشیاندا نەگەراوە ئەمەش مانای وایە هیچی دەربارەیان نەزانیوەو لە پاشدا کە خەڵکی لە ژیانی رۆژانەوە تێگەیشتن کە پەیوەندی یاسایی لەنێوان دیاردەکاندا هەیە دەستیان کردە گەڕان بەدوایانداو لە واقیعدا دۆزییانەوە. لەمەوە بەباشی دەردەکەوێت کەتێگەیشتنی ئایدیالیستانەی یاسا پێچەوانەی هەڵسوڕانی بەکردەوەیە کەشێوەی مەوزوعیی یاساکانی سروشت و کۆمەڵ دەسەلمێنێت.

لەوەوە دەردەکەوێت کە یاسا ئەو پەیوەندیە گشتیو پێداویستییە مەوزوعیو هەمیشەییانە دەردەبڕێت کە لەنێوان شت ومەك و دیاردەکانی ئەم دنیایەدا هەن. دیارە دانپێدانانی شێوەی مەوزوعییانەی یاساکانی سروشت و کۆمەڵ هیچ پێچەوانەی ئەوە نییە کە مرۆڤ دەتوانێت ئەو یاسایانە بزانێت بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاریان بێنێت. تەواوی مێژووی زانیاری و تەکنیکیش وەك باشترین بەلگەی ئاشکرایە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ سوود لەو یاسایانە وەربگرێت کە لە هەڵسوڕان و ئیش و کاریدا دەیاندۆزێتەوە ماتێریالیزمی دیالەکتیك







دانی ناوە بەو دەورە گەورەیەدا کە هۆشمەندی لە ژیانی مرۆڤدا هەیەتی، بەتەنیا خەون و خەیاڵی گونجاو بەوە قایلمان دەکات کە هۆشمەندی بە چەشنێکی سەلبی ئەم جیهانە دەرنابڕێت. لەکاتی وادا وەك پێش واقیع بکەوێت و بە چەشنێکی کاریگەر کاری تێ بکات وایە. بۆ نموونە ئەوە ئاشکرایە کە خەیاڵی ئازایانەی نووسەر (جۆن فرن) پێش زۆر دۆزینەوەی زانیاری کەوت.

ئەمڕۆش تیئۆری زانیاریانە، تیئۆری مارکسیزم- لێنینیزم بووە بەهێزێکی مەزن کە یارمەتی سەدان ملیۆن کەس دەدات بۆ دروستکردنەوەی جیهانی کۆن لەسەر رێ و شوێنێکی نوێ.

بەم جۆرە، وەك لەمەوبەر وتمان، ئەگەر یاسایەکان دان بنێن بەو پەیوەندییە بنچینەییانەدا کە هەموو دیاردەکانی ناو سروشت و کۆمەڵ و بیرکردنەوە لێك جوێ دەکەنەوە، ئەوا پێیان دەوترێت یاسایەکانی گشتی، واتە یاسایەکانی دیالەکتیك. جا با بزانین ئەو یاسایانە کامانەن؟

## ٢- یاسای وەرچەرخانی ئاڵوگۆڕەکانی چەندایەتی بۆ چۆنایەتی

بۆ دروستکردنی فرۆکەیەکی تیژڕەو کە لە خێرایی دەنگ تیژڕەوتربێت، یان بۆ دروستکردنی ساروخێك هەندێك کەرەستەی وا پێویستن کە لە سروشتدا نین. جا ئایا لە کوێ ئەو کەرەستانەمان دەست دەکەون؟بۆ نموونە لە کوێ جۆرە میتاڵێکمان دەست دەکەوێت کەلە پۆڵا پتەوتربێت، یان لە شووشە روون و پاکتر بێت، ئەوەی کلیلی چاری ئەم مەسەلەیەی دابێت بە دەستەوە کیمیایە، زاناکان فێربوون چۆن بۆلیمیرەکان دەبیننەوە، واتە ئەو مادانەی بەشۆکەکانیان لەژمارەیەکی یەکجار زۆر ئەتۆم پێك هاتوون، زاناکانی کیمیا بە گۆڕینی پێکهاتنی چەندایەتی ئەو بەشۆکانە چلۆنایەتی تازەیان دروست دەکرد، خاسیەتی نوێی مادەکانیان دەهێنایە ناوەوە.

جا ئایا چلۆنایەتیو چەندایەتی چین؟ لە هەر شتێکدا جۆرە شتێکی وا هەیە کە ئەو شتەی پێ دەناسین، ئەگەر سەرنجی دەوروپشتی خۆمان بدەین گەلێك شت دەبینین، بۆ نموونە شوشەی مەرەکەب، درەخت، ئاژەڵ، یان هەر شتێکی تر، دەبینین چەشنە نیشانەو لایەن و رووخسارو خاسیەتێکی وای هەیە کە پێی دەناسرێت و لە شتەکانی جیا دەکاتەوە. بۆچی دەڵێن ئەوە قەڵەمە؟ چونکە دەبینین شتێکی وەك خەلۆوز لەناو پارچە تەختەیەکی درێژکۆڵەدایەو







دەتوانین بۆ نووسین ونەخشەو وێنەکێشان بەکاری بێنین، بەم جۆرە خاسیەتە سەرەکیەکانی قەڵەمەکە دیاری دەکرێت و ئەو شتە پیشان دەدرێت کە بەو دیاری دەکرێت و ئەو شتە پیشان دەدرێت کە بەو چەشنەی لێ کردووە وابێت، واتە چلۆنایەتییەکەی.

بەم چەشنە دەبینین چلۆنایەتی بریتییە لە چۆنیەتی ناوخۆیی ئەو شتە کە لکاوە بە شتەکە خۆیەوە، سەرجەمی خاسیەتە بنەڕەتییەکانی شتەکە بە هۆیانەوە بە چەشنێکی نیسبی جێ گیربووەو لە شتەکانی تری پێ جودا دەکرێتەوە.

جا ئایا لەسەر چ بنچینەیەك فەرمانی خۆمان بەسەر چلۆنایەتیدا دەدەین؟ بۆ ئەم مەبەستە نموونەیەك باس دەکەین:گریمان منداڵێك شووشەیەکی شیری کڕیو لەسەر جادە لە دەستی کەوتە خوارەوە، بەڵام شووشەکە نەشکا لێرەدا ئێمە لە بەردەم چلۆنایەتییەکی تازەداین کە ئەویش ((جۆرە شووشەیەکە ناشکێت)) لەمەوە دەگەینە ئەنجامێك کە ئەویش چلۆنایەتییەکی تازەیە.

ئێمە ئەو چلۆنایەتیە تازەیەمان بە هۆی دۆزینەوەی خاسیەتە تازەکانەوە بۆ دۆزرایەوە. هەموو کاتێکیش دەبێ بەم جۆرە بکەین. جا ئەگەر لە چلۆنایەتی میتالیك- معدن- بکۆڵینەوە دەبێ خاسیەتەکانی بزانین:رەنگەکەی، ئایا ژەنگ دەگرێت یان نا، سەنگی ئەتومیەکەی، نەرمە یان پتەو. . . هتد ئێمە بە لێکۆڵینەوەی ئەم شتانە شێوەی ناوخۆیی دەزانین واتە چلۆنایەتییەکەی.

ئاوەها دەزانین کە خاسیەتەکە نیشانەی شتەکەیە، لەشتەکانی

تری جودا دەكاتەوە، ئەم خاسیەتە ناوخۆیی یانەی شتەكانیش چلۆنایەتیانە لەمەشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە چلۆنایەتی لە ڕێگای خاسیەتەكانەوە دەردەكەوێت. دەبێ سەرنجی ئەوەش بدەین كە هەر شتێك خاوەنی تاقە یەك خاسیەت نیە، بەڵكو زۆر خاسیەتی هەیە، لەبەر ئەوە نابێ چلۆنایەتیو خاسیەت تێكەڵ بكەین و لێمان تێكچن، چلۆنایەتی یەكێتی ناوەوەی هەموو خاسیەتەكانە واتە تەنیا بەیەك خاسیەت چلۆنایەتی شتێك دەرناخرێت و دەبێ سەرجەمی خاسیەتەكان لەبەر چاو بگرن، لەوانە میتالیك ژەنگەكەی نەمێنێت كە یەكێكە لە خاسیەتەكانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر میتالەكە دەبێت، تەنیا ئەگەر هەموو خاسیەتەكانی، یان بەلایەنی كەمەوە خاسیەتە بنچینەییەكانی نەمێنن ئەوا چلۆنایەتیش نامێنێت.

شتومەك‌و دیاردەكان تەنیا لە ڕووی چلۆنایەتییەوە باسیان ناكرێت، بەڵكو هەروەها لەڕووی چەندایەتیشەوە. جا تێگەیشتنی ئەمە كاتێك ئاسانە كە ئەوەمان لەبیر نەچێت ئێمە، لەپاڵ ئەو شتانەدا كە پەیوەندییان بە چەندایەتی شتەكانەوە هەیە، ڕووبەڕووی هەندێك مەسەلەش دەبینەوە كە لەگەڵ چەندایەتیدا هاوپەیوەندن، ئەو شتە چەندە، ژمارەی، قەبارەی چەندە. . . هتد.

باسكردنی چەندایەتی شتومەك‌و دیاردەكان زۆر فرە چەشنە، لەبەر ئەوە بەشێوەیەكی جۆربەجۆر دەردەبردرێت. بۆ نمونە: ئەگەر بمانەوێ چەندایەتی ئاژەڵ بزانین، وەك حوشتر، مەڕ، بزن‌و مانگا، ئەوا ئێمە ژمارەی دەكەین تا بزانین چەندن، ١٠، ١٠٠، ١٠٠٠، هەروا بەم







جۆرە. ئەگەر پێویست بوو چەندایەتی برنج‌و پاقلەو شتی‌وا لەچاو بەرهەمی ساڵی پاردا بزانین، ئەوا دەتوانین بە نیسبەتی سەدی، بە تەن. . هتد ئەمە دەربخەین.

بەم جۆرە چەندایەتی ناساندنی شت‌و مەك‌و دیاردەكانەو پیشاندانی ئەوەیە كە ئەو شت‌و دیاردانە كە بەژمارەومیقدارو پلەو قەبارەو شتی‌وا چین‌و شێوەی ڕوونكردنەوەیانە.

ئەگەر چلۆنایەتی بگۆڕدرێت ئەوا شتەكە خۆیشی دەگۆڕدرێت. بەڵام ئاخۆ گۆڕینی چەندایەتی دەبێتە هۆی گۆڕینی شتەكە خۆی؟ با بزانین ئەمە چۆنە:

ئاشكرایە كەبۆ دروستكردنی بەربەستێك لەسەر ڕووبارێك پێویستە ژمارەیەكی زۆر بەرد بەكار بێنین، جا بۆ ئەوە ئەگەر لەسەرەتادا چەند بەردێكمان هاویشتە ڕووبارەكەوە هێشتا ئەو بەربەستەیە دروست نا بێت، بەڵام دوای هەوڵدانێكی زۆرترو بەكارهێنانی ژمارەیەكی زۆرتر بەرد دەبینین لە بنەڕەتەوە كار دەكاتە سەر جۆگەی ڕووبارەكەو پاشان بەری لێ دەگرێت‌و ئاوەكە پەنگ دەخواتەوەو لەو هەموو بەردە بەربەستێك دروست دەبێت. لەمەوە بۆمان دەردەكەوێت كە لەسەرەتادا كاتێك ژمارەی بەردەكان (چەندایەتی) كەم بوو، نەتوانرا (چلۆنایەتییەكی) تازە دروست بكرێت كە لەم حاڵەدا بەربەستەكەیە، بەڵام دوای ئەوەی ئاڵوگۆڕەكە گەیشتە ڕادەی پێویست‌و پێوانەی تایبەتی، كاریكردە سەر چلۆنایەتی شتەكە یان دیاردەكە. بابزانین پێوانە چییە؟

هەر هێندە بەسە کە مرۆڤ سەرنجێکی جیهان بدات تا لەو ڕاستییە تێبگات کە شتومەكو دیاردەکان هەمیشە بە پێوانەیەکی تایبەتی دەبن، تا ئەم یان ئەو ڕادەیە، بۆ نمونە بەردێکی گەورەو یەکێکی بچوك هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا بەرد قەبارەیەکی تایبەتی هەیە. هەرگیز بەردێکی واتان نەدیوە کە درێژی کیلۆمەترێك بێت، چونکە ئەو کاتە دەبێتە کاژێر، ئەمەش مانای وایە کە هەموو شتێکی جیهان پێوانەیەکی تایبەتی هەیە: چلۆنایەتییەکی تایبەتی هەر چەشنە چەندایەتییەك بەرامبەری ناگونجێت، بەڵکو چەندایەتییەکی دیاریکراو تا ئەم یان ئەو ڕادەیە دەبینین بەڵام درێژ یان کورت یان ناوەنجی هەیە. . . هتد. قورسایی جیاوازیشیان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر کەسە درێژاییەکی تایبەتی هەیە. . هتد. بۆ نمونە کەستان پیاوێکی واتان نەدیوە کە پێنج مەتر درێژ بێت یان یەك تەن قورس بێت، چونکە چەندایەتی(یەك تەن) لەگەڵ چلۆنایەتی تایبەتی(مرۆڤ) دا ناگونجێت، لە هەموو شتێکیشدا مەسەلەکە بەم جۆرەیە. هەموو شتێك چلۆنایەتی تایبەتی هەیەکە ناگونجێت هەموو چەندایەتییەك بۆی ببێت، بەڵکو تا ڕادەو سنورێکی تایبەتی دەبێتو بەم چەشنە ئاشکرایە کە پێوانەیەکی تایبەتی لە هەموو شتێکدا لەبەرچاو دەگیرێت، لەمەوە دەردەکەوێت کە پێوانە بریتییە لە تێکڕا گونجانو بەرامبەر بوون، بریتییە لە یەکێتیی لایەنەکانی چەندایەتیو چلۆنایەتی لە شتەکاندا. هەر شتێك بگرین هەمیشە بریتییە لە چلۆنایەتییەك کە چەندایەتییەکی تایبەتی







بەرامبەرییەتی.

لەمەشەوە ئەنجامێکی زۆر گرنگمان دەست دەکەوێت. ئەگەر ئالۆگۆڕی چەندایەتی لە شتەکاندا ڕوویداو، تا لەڕادەی پێوانەی پێویستدا بێت کار نەکاتە سەر چلۆنایەتی. لەم حاڵەتەدا وادێتە پێشچاو کە شتەکە ئالۆگۆڕی چەندایەتی دەربەست نییەو سەرنجی نادات.

بەڵام هەر کە لەسنووری پێوانەکە تێپەڕکرا ئالۆگۆڕی چەندایەتی کار دەکاتە سەر چلۆنایەتی شتەکەو دەیگۆڕێت. چەندایەتی دەگوێزرێتەوە، دەگۆڕدرێت بۆ چلۆنایەتی.

ئالۆگۆڕەکانی چەندایەتی بەرەبەرەو بەشێوەیەکی نەبینراو کۆدەبنەوە. لەسەرەتادا وادەبێت وەك کاری نەکردبێتە سەر لایەنی چۆنیەتی شتەکە. بەڵام کاتێکی وا دێت ئەم کۆمەڵ بوونە ئاشکرا دەبێتو ئالۆگۆڕی چەندایەتی دەبێتە هۆی ئالۆگۆڕی چلۆنایەتی شتەکە. ئەوە بوو لە نموونەکانی پێشەوەدا باسی ئەمەمان کرد. کاتێك کیمیاگەرەکان دروست بوونی بولیمیرەکانو دەسکەوتی مادەی نوێ فێربوونو، تێگەیشتن چۆن دەتوانن چلۆنایەتی تازەیان دەست بکەوێت، پشتیان بەست بەیاسای گواستنەوە (گۆڕین)ی چەندایەتی بە چلۆنایەتی.

دەبێ ئەوەش وەبەرچاو بگرین کە بەتەنیا ئالۆگۆڕی چەندایەتی نییە کە دەبێتە هۆی ئالۆگۆڕی چلۆنایەتی، زۆرجار بەپێچەوانەشەوە ڕوو دەدات، واتە ئالۆگۆڕی چلۆنایەتی دەبێتە هۆی ئالۆگۆڕی

چەندایەتی، گریمان خەڵکی توانییان جۆرە پاقلەیەکی سودانی بدۆزنەوە ئەمە چلۆنایەتییەکی نوێیە، بەڵام ئەم جۆرە پاقلە تازەیە رۆنی زۆرتری لێ دەردێت و، بەم جۆرە ئاڵوگۆڕی چلۆنایەتی لێرەدا دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕی چەندایەتی. چەندایەتی دەگوازرێتەوە (دەگۆڕدرێت)بۆ چلۆنایەتی و بەپێچەوانەشەوە چلۆنایەتی دەگۆڕدرێت بە چەندایەتی.

لەمەوە دەردەکەوێت کە ناوەرۆکی یاسای وەرچەرخانی ئاڵوگۆڕەکانی چەندایەتی بۆ چلۆنایەتی ئا لەمەدایە:لە سەرەتادا ئاڵوگۆڕی بچوکەکانی چلۆنایەتی بەچەشنێکی نادیارو بەرەبەرە کۆدەبنەوەو لەپلەیەکی تایبەتیدا دەبنە هۆی ئاڵوگۆڕی ریشەیی، چلۆنایەتی، بەم هۆیەشەوە چلۆنایەتییە کۆنەکە نامێنێت و جۆرێکی تازە دەردەکەوێت کە ئەمیش دەبێتە هۆی ئاڵوگۆڕی چەندایەتی تازە. بەڵام بابزانین چۆن وەرچەرخانی ئاڵوگۆڕەکانی چەندایەتی بۆ ئاڵوگۆڕییەکانی چلۆنایەتی پێك دێت؟

بێگومان هەموو کەسێ دیویە ئاو چۆن دەکولێت. لەسەرەتادا گەرم دەبێت، ئینجا گەرمایی بەرزتر دەبێتەوە تا دەگاتە٧٠، ٦٠، ٥٠ع پلە، بەڵام ئاوەکە هەر ئاوە. راستە هەندێك ئاڵوگۆڕ روویداوە ئەم گۆڕانە هێشتا لەو رادەیەدا ئاوەکە دەگاتە ٩٩پلەی گەرمایییە ئەمە هەروا دەبێ، بەڵام کە گەرمایی ئاوەکە پلەیەکی تر بەرزبووە دەبینین ئاوەکە بەخێرایی دەکولێت و دەبێت بە هەڵم و بەمە چلۆنایەتی ئاوەکە دەگۆڕدرێت.







لەم نموونەیەدا دەتوانین بە ئاشکرا ئەو رێگەیە ببینین کە چەندایەتی پێ دەگۆڕدرێت بە چلۆنایەتی. لە سەرەتادا دیمان کە ئەو کارە لەسەرخۆو بەرەبەرە پێ دەهات، ئاڵوگۆڕی چەندایەتی (لەپلەی گەرماییدا) پێك دەهات، بەڵام کاتێك ئەو ئاڵوگۆڕە کۆمەڵ دەبوو ئەوەندەی کەپێویست بوو پێك دەهات و بەخێرایی لەناکاو وەرچەرخان لە چلۆنایەتیدا دەبوو، بەم وەرچەرخانە دەوترێت بازدان ئەمەش مانای وایە پەرەسەندنی لەسەرخۆ، چەندایەتی، لە نوختەیەکی تایبەتیدا دەپچڕێت و کاتی گواستنەوەو وەرچەرخان بۆ چلۆنایەتییەکی نوێ پێك دێت کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بازدانە، هەر لەبەر ئەمەشە لینین بازدانی وا باس کردووە کە بریتییە لە نوختەی وەرچەرخانێکی کاریگەر لە چلۆنایەتییەکی کۆندا بۆ نێو وەرچەرخانێکی تیژە لە پەرەسەندندا.

لەمەی سەرەوە وتمان ئاشکرا بوو کە پروچیی پەرەسەندن(عملية التطور) لە دوو قۆناغدا تێپەڕ دەبێت، بە دوو شێوە دەبێت. ئاڵوگۆڕی لە سەرخۆ، کەم، چەندایەتی و ئاڵوگۆڕی خێرا، بنەڕەتی چلۆنایەتی. ئاڵوگۆڕی لەسەرخۆ هەمیشە لە سنوری پێوانی کۆنەکەدا، لەسنووری چلۆنایەتییە کۆنەکەدا روودەدات. لەمەدا هێشتا ئاڵوگۆڕی بنچینەیی لە شت و مەك و دیاردەکاندا روونادات بەم مانایە دەتوانرێ بە ئاڵوگۆڕی بەرەبەرە ناوببرێت. ئەم بەرەبەرەییە (EVOLUTION)

پەرەسەندنێکی هێواش و لەسەرخۆو پلەبەپلەی بێ بازدانی

گەورەو وەرچەرخانە بۆ چلۆنایەتییەکی نوێ.

بەڵام ئەم پەرەسەندنەی بەستراوە بە تێکدانی تەواوی کۆنەوە بە وەرچەرخانێکی چلۆنایەتی لە پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتییداو بیروڕای زانیاری و باری تەکنیك و شتی وادا، پێی دەوترێت پەرەسەندنی شۆڕشگێڕانە. دەبێ ئەوەش بخەینە بەرچاو کە زۆرجار میتافیزیکەکان مانای(بەرەبەرەیی) دەشێوێنن، هەندێك لە میتافیزیکەکان لافی ئەوە لێدەدەن گوایە پەرەسەندن بەرەبەرە تەواو دەبێت بەبێ هیچ چەشنە بازدانێك. ئەوان دەڵێن ئەوەی کە لە دنیادا روو دەدات بە تەنیا ئاڵگۆڕی چەندایەتییە لە سروشتدا هیچ شتێك نییە لەڕووی چلۆنایەتیەوە نوێ بێت. بەم سەرنجەش دەوترێت بەرەبەرەین ڤۆلگارو بێ بایەخ چونکە بەشێوەیەکی شێواو و ڤۆلگارو نابەجێ لێی تێدەگەن. لایەنگرانی ئەم باری سەرنجە خەباتی شۆڕشگێڕانە لە دژی ئیمپریالیزم و ئیستعمار بە پێویست نازانن.

هەروا جۆرە بیروڕایەکی میتافیزیکی تر هەیە کە زیانی لەوی پێشوو کەمتر نییە، ئەمەش باوەڕی گێرە شێوێنەکان و بەشێوەی گشتی ((چەپڕەوە)) سەرچلەکانە. ئەمانیش بەرەبەرەییو ئاڵوگۆڕی چەندایەتی ئینکار دەکەن و تەنیا ((بازدان)) و ((تەقینەوەی شۆڕشگێڕانە)) دەناسن ئەویش بەبێ قۆناغێکی ئامادەیی پەرەسەندن و بەبێ مۆڵدانی بەرەبەرەی هێزەکان.

بەپێچەوانەی ئەم بیروباوەڕە میتافیزیکە یەك لاییانەوە ماتێریالیزمی دیالەکتیك لەوەوە تێ هەڵدەچێت کە پەیوەندییەکی







قووڵ هەیە لەنێوان هەردوو لایەنی بەرەبەرەیی و شۆڕشگێڕیی پرۆسێسی پەرەسەندندا. ئەم پەیوەندییەش وا لەوەدا کەهیچ کامیان بەبێ ئەویتریان ناگونجێت. بەبێ ئاڵوگۆڕی چەندایەتی، بەرەبەرەیی، ئاڵوگۆڕی چلۆنایەتیی شۆڕشگێڕانە نابێت، هەروا بەبێ ئاڵوگۆڕی چلۆنایەتیی، شۆڕشگێڕانە پێوانەی تازەو قۆناغی نابێت، واتە پەرەسەندن پێك نایەت.

جا با بزانین ئەو بازدانەی روو دەدەن چین و لەسەرچی وەستاون؟ بە ئاسانیو لەسەر بنچینەی ئەم نموونانەی خوارەوە دەتوانین تێ بگەین کە زۆر شێوەی بازدان هەیە. ئاشکرایە کە بێ چەندو چون دەزانین وەرچەرخان لە مەیمونەوە بۆ مرۆڤ بازدانێکە لە پەرەسەندنی دنیای ئاژەڵدا، بەڵام ئەم وەرچەرخانە لەماوەی رۆژێکدا پێك نەهاتووە، بەڵکو ماوەیەکی مێژوویی زۆری ویستووە، بەدەیان هەزار ساڵی خایاندووە. هەروا ئەو نموونەیەی کە دەربارەی کوڵانی ئاو لە پێشەوە باسکرا، شێوەیەکی دیکەی بازدانە، ئەم دوو شێوەیە لێك جیاوازن لەوەدا کە لە شێوەیەکاندا ئاڵوگۆڕی بنچینەیی روو دەدات لە ماوەیەکی درێژدا، بەڵام لەشێوەکەی تردا لە ماوەیەکی کورت تردا دەبێت، ئەمەش مانای وایە کە کات دەورێکی گەورەی هەیە لە دیاریکردنی شێوەی بازدانەکەدا.

هەروا شتێکی گران نییە لەوەش بگەین کە شێوەی جۆر بە جۆری ئاڵوگۆڕ لە چلۆنایەتییەوە بۆ چلۆنایەتیەکی تر، واتە شێوەی جۆربەجۆری بازدان، لەسروشتی ئەو دیاردانە وەستاون کە

پەرەدەسێنن و هەروا ئەو هەلومەرجەی پەرەسەندنەکەی تێدا روو دەدات، ئەمەش بەپێی هەندێك نموونە لەژیانی کۆمەڵایەتییەوە بە ئاشکرا روون دەبێتەوە. لە کۆمەڵێکی سەرمایەداریدا بازدان بەهۆی جەنگێکی یەك لایی کەرەوە روو دەدات، چونکە ئەو کۆمەڵە دابەش بووە بە چەند چینێکی ناکۆکەوە بەڵام پەرەسەندنی کۆمەڵی سۆشیالست کەچینی ناکۆکی تێدا نییە بازدان و وەرچەرخانی تیژ لەسەر بنچینەی لە ناوچوونی بەرەبەرەی رەگەزەکانی چلۆنایەتی کۆن و پێگەیشتنی رەگەزەکانی چلۆنایەتی تازەیە

لەو وڵاتانەشدا کە لە کۆتی ئیستعمار رزگاربوون ئاڵوگۆڕی ریشەیی لە ژیانی گەلدا بەرەبەرە روودەدات وەك بلاوبوونەوەی هەرەوەزییەکانی جوتیاران و، دامەزراندنی پیشەسازی، بەم جۆرە شێوە کۆنەکانی بەرهەم لەناودەچێت و شێوەی نوێ دەردەکەوێت. . هتد.

لەمەی سەرەوە دەردەکەوێت کەیاسای ئاڵوگۆڕی چەندایەتی بۆ ئاڵوگۆڕی چلۆنایەتی شێوەی پێکهاتنی ناوخۆیی‌و خۆبەخۆی چلۆنایەتی نوێ دەدۆزێتەوە، واتە بنچینەی پەرەسەندن خۆی، بەڵام ئایا هێزی بزوێنەری‌و سەرچاوەکەی چییە؟ یاسایەکی تری دیالەکتیك هەیە وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە کە ئەویش یاسای یەکێتی‌و ململانێی دژەکانە.







## ٣- یاسای یەکێتی و ململانێی دژەکان

لە زۆر کۆنەوە زانایان بیر لە مەسەلەی ناکۆکییەکان دەکەنەوە. بۆنموونە میتافیزیکەکان، لە گۆشەی ئەو باوەڕەوە کە پێویستە ناکۆکی لە قسەکردندا نەبێت، لافی ئەوەیان لێداوە کە هەروەها دەبێ لە سروشتیدا هیچ ناکۆکی‌و خاسیەت و لایەنێکی دژی یەکتر نەبێت. . هتد. فەیلەسوفی کۆنی یۆنانی زینون کە لە چەرخی پێنجەمی پێش لە دایك بوونی مەسیحدا ژیاوە باسی کردووە کەلە هەر شتێکدا ناکۆکی بدۆزیتەوە شتێکی راستەقینە نییەو، ناگونجێت و بێ مانایە.

هەروا هەندێك لە فەیلەسوفە بۆرژوازەکانی ئەم سەردەمەش ئەو چەشنە هەڵوێستەیان هەیە بۆ نموونە فەیلەسوفی کۆنەپەرستی ئەمریکایی سیدنی هۆك لافی ئەوە دەدات گوایە لەوانەیە محاکەمەکان و بەڵگەکان ناکۆك بن. بەڵام شت و مەك‌و دیاردەکان بەهیچ جۆرێك ناکۆکییان تێدا نابێت.

کەچی زانیاری هەڵسوڕانی بەکردەوە ئەوەمان پێ دەسەلمێنن کەلەناوخۆی شتەکان و، لەناو سروشتدا ناکۆکی‌و لایەنی دژ بەیەکتر هەیە. با تەماشای ئۆرگانی مرۆڤ و ئاژەڵ بکەین دەبینین لە یەك کاتدا دوو چەشنە پرۆسیسی دژی یەکتر هەیە. شانەکانیان بەخۆدا دێن‌و پێ دەگەن‌و هەر لەو کاتەشدا لە ناو دەچن. ئەگەر یەکێك لەم

دوو پرۆسیسە بووەستێت ئەوا ئۆرگانیش لەناو دەچێت. لە هەموو شوێنێکیش نموونەی ئەمە ڕوودەدات. ئەمە ناکۆکی سروشت خۆیەتی‌و مەحاڵە خۆی لێ وەدوور بگرێت.

جا بابزانین ئەم ناکۆکییانە لە بەر چی هەن؟ بۆ تێگەیشتنی ئەمە دەبێ پێشەکی سەرنجی ئەوە بدەین کەپێی دەوترێت (دژەکان)و بزانین کەی ناکۆکییان لە ناودا دەردەکەوێت.

با بزانین لە هەڵسوڕانی ڕۆژانەماندا وشەی (دژ) بە کام مانا بەکار دێنین؟ جەمسەری باکووری زەوی پێچەوانەو دژی جەمسەری باشوورە. لە ڕێگادا لای ڕاست پێچەوانەو دژی چەپە. . هتد. کاتێك بەراوردی چەند شتێك دەکەین دەبینین خاسیەتەکانیان وەك یەك نین‌و دەتوانین بە هەنێکیان بەرەنگاری هەندێکی تریان ببین. لەم کاتەدا دەڵێین ئەو شتومەك‌و دیاردانە دژی یەکترن. بۆ نموونە مرۆڤی چاك‌و خێرخوازو مرۆڤی خراپو شەڕخواز، جا ئایا لەبەرچی ئەم دیاردەو ڕووداوانە بە یەکتری بەرەنگاری دەکەین؟لەبەر ئەوە چونکە دیاردەیەك پێچەوانەو بەربەستی یەکێکی تر دەوەستێت‌و (نەفی) دەکات، وەك ئاشکرایە خێر بەربەستی شەڕەو، باکوور بەربەستی باشوورو، چەپ بەربەستی ڕاست، دژەکان ئەو دیاردانەو یان هەندێك لایەنیان کە هەندێکیان هەندێکی تریان (نەفی) دەکەن.

بەڵام ئەگەر شەڕ هەردەم ئەوەندە لەخێر دووربێت کە تێکڕا کۆنەبنەوە. ئەو کاتە لەنێوانی ئەم دوو دژەدا هیچ جۆرە بەیەکدادان‌و لێکدانی دوژمنانەو ناڕێکی‌و جیاوازی نابێت‌و، هیچ جۆرە ناکۆکییەك







ڕوونادات، جا ئاخۆ کەی ناکۆکی لە نێوان کەسانێکدا ڕوودەدات کە لەڕووی تەبیعەت‌و بیروباوەڕەوە لێك جیاوازبن؟ ئەو ناکۆکییانە لە کاتێکدا دەردەکەون کە پێگ دەگەن، یاخود کەبەیەکدا دەدەن، ئەگەر وا نەبوایە دەمەقاڵەش مەحاڵ دەبوو.

بەم چەشنە دژەکان ئاوان‌و ئەگەر قوڵتریش بڕوانین بە ئاسانی لەوە دەگەین کە دژەکان لەژیانداو، لە دنیادا هەن‌و، هیچ شتێکی ئەوتۆش لێکی جویێ نەکردوونەوە کە توانای لێ تێپەڕبوونی نەبێت. بەڵکوو لە گۆشەی پەیوەندییانەوە نەبێت لێ تێگەیشتنیشیان کارێکی مەحاڵە. بۆ نموونە کۆکردنەوەو لێدەرکردن لە ماتماتیکداو، کردارو بەرپەرچی کردار لە میکانیکدا پێکەوە هەن، بەوهێزەی کە پاڵ دەنێین بە بەلەمەوە، بەلەمەکەش پاڵ بە ئێمەوە دەنێت، هیچ کردارێکیش بەبێ بەرپەرچی کردار نییەو نابێت.

لەنێوانی دژەکاندا کە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریان، هەردەم جۆرە پەیوەندییەك دەردەکەوێت. هەرلەبەر ئەمەشە ((لێککەوتن)) و ((پێکدادان))و ((جیاوازی)) لە نێوانیاندا ڕوودەدەن، هەر کاتێك دژەکان پێکدابدەن یان پەیوەندییەکیان لە نێواندا ببێت ئەوا ناکۆکیش ڕوودەدات، چونکە ڕێبازو هێزەکانی دژ بەیەکترن کە بەیەکدا دەدەن. لەبەر ئەمە ناکۆکی بریتییە لە پەیوەندی نێوان دژەکان، بەڵام دژەکان بریتین لە هەندێك لایەنی ناکۆکی.

ئەگەر شت و مەك و دیاردەکان نەگۆڕدرانایەو تا هەتایە هەروەکو خۆیان بمانایەوە، ئەوا هیچ جۆرە دژایەتییەك نەدەبوو. هیچ

لایەنێك نەدەبوو کە هەندێکیان ئەوانی تر(نەفی) بکەن. بەڵام ئێمە دەزانین کەشت و مەك ودیاردەکان لە بزووتن و ئالۆگۆڕو پەرەسەندنێکی هەمیشەییدان، لەبەر ئەوە هەمیشە لە شتەکاندا لایەنی جۆربەجۆر دەردەکەوێت، هەندێکیان تافی خۆیان دەژین و پیر دەبن، بەڵام تازەیان تێیدا پێ دەگات و پەرەدەسێنێت. بە کورتی دەتوانین بڵێین لە دنیای پەرەسەندوودا هەمیشە لایەن و هێزی دژی یەکتر دەردەکەون و ئەمەش مانای ئەوەیە کە هەروا ناکۆکییەکانیش پەیدا دەبن. جا ئایا پەیوەندییان لەگەڵ یەکتردا چییە؟ لەوەی سەرەوە ووترا دەتوانین بگەینە ئەوە کەدژەکان لە پەیوەندی نێوان یەکتردا هەن. ئەم پەیوەندییەش زۆر توندەو لێك جوێ ناکرێتەوە، بەڕادەیەك دژەکان بەبێ ئەو پەیوەندییانە نابن، ئێمە ئەم پەیوەندییە ناو دەنێین یەکێتی دژەکان. میتافیزیکەکان دان بەم یەکێتییەدا نانێن، ئەوان لەو باوەڕەدان کە هەر دژێك لەو دژانە خۆی لە خۆیدا هەیەو پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تردا نییە. بەڵام ئەمە لە راستییەوە دوورە، با کارکردنی کارخانە یان کارگە، یان هەرەوەزییەك بکەینە نموونە:

لە هەر کارگەیەکدا هەندێك پارەو کەلوپەل بەخت دەکرێت وخەرجییەکی تایبەتی پێویستە بۆ هەڵسوڕانی کاروباری دامەزراوەکە، بەڵام هەر لەو کاتەشدا داهات و دەستکەوتێکی تایبەتی دەبێت لە پارەو لە بەرهەم و، هیچ کارگەیەك ناتوانێت بەبێ خەرجی داهاتی ببێت و شتێکی دەستکەوێت و پێویستە پارە خەرج بکات و بۆ کڕینی







کەلوپەل و ئامێروکەرەستەی خاوو پێداویستەکانی تر.

با نموونەیەکی تریش باس بکەین، وەك وتمان ژیانی ئاژەڵ و مرۆڤ لە دوو چەشنە کردەوەی دژی یەکتر پێك هاتووە، دوو جۆرە پرۆسیسی لێك جیاوازە: هەندێك شانە پەیدا دەبن و هەندێکی تر دەمرن ولەناو دەچن، بەڵام ئەو کەسە زۆر بە هەڵەدا چووە کە دەڵێت بەمەبەستی تەمەن درێژی پێویستە رێگەی مردن و لەناوچوونی شانەکان بگیرێت و تەنیا کاری نوێ بوونەوە بهێڵرێتەوە ئەو کاتە شانەکان هەر خەریکی نوێ کردنەوە دەبن، بێگومان ئەوەی ئەمە دەڵێت: وەك وتمان، هەڵەیەکی گەورە دەکات، چونکە ژیان خۆی لە دوو پرۆسیسی دژی یەکتر پێك هاتووەو مەحاڵە بتوانرێت لێك جوێ بکرێنەوە.

هەر کەس بیەوێت یەکێك لەو دوو دژە لە ناو بەرێت. ئەوی تریش لە ناو دەبات و بەم جۆرە ژیان لە ناو دەبات. چونکە ژیان خۆی یەك پرۆسیسی ناکۆکە.

میتافیزیکەکانی ئەم سەردەمە دەڵێن: لە کۆمەڵی سەرمایەداریدا هەندێك لایەنی ((باش)) و هەندێك لایەنی ((خراپ)) هەن جابەمەبەستی رزگارکردنی سەرمایەداری لەلایەن ((خراپەکان)) پێشنیاری ئەوە دەکەن کە لایەنە ((باشەکان)) پەرە پێ بدرێن و لایەنە ((خراپەکان)) لەناو ببرێت، گوایە بەم کارە دەتوانرێت کۆمەڵی ((پڕ لە خێرو خۆشیی گشتی)) بهێنرێتە دی. ئەمەش لەبیرکردنەوەی ئەو کەسە دەچێت کە دەیەوێت لە لەشی مرۆڤدا تەنیا دروست بوونی

شانە نوێیەکان بهێڵێتەوەو ڕێگەی لەناو چوونی شانە کۆنەکان نەدرێت، بەلاّم وەك چۆن ئەمە کارێکی مەحاڵە. هەروا کارێکی مەحاڵیشە بتوانرێت لە کۆمەڵی بۆرژوازیدا بهێنرێتەدی.

دژەکان لێرەدا یەك لە تەنیشتی یەکەوە نین، بەڵکو یەکیان گرتووە لە ناو یەکدا تێك چڕژاون و تێکڕا کۆمەڵێکیان پێك هێناوە کە پێی دەڵێین کۆمەڵی بۆرژواز. لە بەر ئەوەی ناتوانرێت لایەنێکی لە ناو ببرێت و لایەنێکی تری بمێنێتەوە، ڕابەرانی پارتی کرێکارانی ئینگلتەرا کە لەسەر حوکم بوون هەوڵیاندا وولاّت ((رزگار)) بکەن لە هەندێك لایەنی خراپ و خەوشی سەرمایەدار بەلاّم بێ ئەنجام بوو، ئەمەش ئاشکرایە کە لە پێناوی لەناوبردنی ((لایەنە خراپەکانی)) سەرمایەداریدا دەبێت سەرمایەداری خۆی لە ناو ببرێت و لەمەش بەولاوە هیچ ڕێگایەکی تر نییە.

بەم چەشنە یەکێتی دژەکان لەوەدایە کە بە چەشنێکی وا یەکیان گرتووەو پێکەوە لکاون ناتوانرێت لێك جوێ بکرێنەوەو هەموو پێکەوە یەك پرۆسیسی ناکۆکیان دروست کردووە. دوو دژ هەریەکەیان مەرجن بۆ مانەوەی ئەوی تریان و هەر یەکەیان لە بەر بوونی ئەوی تریان هەیە.

بەیەکدادانی کۆششی دژ بەیەك ململانێیە لە نێوانیانداو، لەبەر ئەوەی هەرشتێك لەدوو لایەنی دژ بەیەك پێك هاتووە. بە ئاسانی دەتوانین بگەینە ئەو باوەڕەی کە بەردەوام لە نێوانیاندا پێکدادان و ململانێ هەیە. جا ئایا هۆی ئەمە چییە؟





ململانێی نێوان دژەکان لەبەر ئەوەیە کە پێکەوە هاوپەیوەندن و یەکیانگرتووەو هەر لەو کاتەشدا یەکتری دەدەنە دواوەو هەندێکیان هەندێکی تریان(نەفی) دەکەن. لەم بارەشدا لێك کەوتن و پێکدادان و ململانێ هەر دەبێ ڕوو بدەن، ئەمەش مانای ئەوەیە لە هەر کوێ دژەکان یەکیان گرتبێ، ململانێشیان لە نێودا هەیە. دەبێ لە ململانێی دژەکان وا تێ بگەین کە ((خواستی)) هەر یەکێکیانە بۆ ئەوەی کە لە دیاردەیەکی تایبەتیدا بایەخی بە دەسەلاّت و تەواویان ببێت. دەبینین لە ڕاستیدا یەکێتی و ململانێی دژەکان هەیە. جا ئایا کامیان دەوری هەرە کاریگەر لە پەرەسەندندا دەگێڕن؟ ئەوەی دەوری هەرە کاریگەر لە پەرەسەندندا دەگێڕێت یەکێتی دژەکان نییە، بەڵکو ململانێی دژەکانە. ئەم ململانێیە بۆ ساتێکی کەمیش ڕاناوەستێت و پەیوەندی ئاڵوگۆڕی دژەکانیش هەر لەوێدا شاراوەتەوەو لە بەر ئەوەی دژەکان یەکتری دەدەنە دواوە. مانای وایە لە ململانێدان. لە بەر ئەوە کە ئەگەر یەکێتی دژەکان نیسبی و کاتی و ڕاگوزاربێت، ئەوا ململانێشیان، هەروەك لینین فێرمان دەکات، موتلەقەو، پەرەسەندن و جووڵانەوەش هەروان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ململانێی دژەکان سەرچاوەی پەرەسەندنی جووڵانەوەیە.

جا بۆ ئەوەی بە باشی لەمە تێ بگەین با سەرنجی چەند نموونەیەك بدەین، هەروەك لەمەوبەر دیمان چڵۆنایەتی نوێ لە ئەنجامی کۆمەڵ بوونی بەرەبەرەی ئاڵوگۆڕی چەندایەتییەوە پەیدا دەبێت، بەلاّم ئایا چی ئەم پرۆسیسە دەبزوێنێت؟ بۆ نموونە کاتێك





ئاو گەرم دەکرێت، بەو هۆیەوە خێرایی بزوتنەوەی بەشەکانی زیاد دەبێت کە ئاوەکە بەو هۆیەوە لەباری شلیدا بووە. لەپلەی گەرمایی رادەی کولاْندندا، ئەو هێزی راکێشانە ئەوەندە لاواز دەبێت کە ئاوەکە ئیتر لە باری شلەدا نامێنێتەوەو بەخێرایی دەبێت بە هەڵم، هەموو ئەمە بەهۆی ململانێی دوو هێزی دژ بەیەکەوە روو دەدات: لەلایەکەوە هێزی ڕاکێشانی بەشەکان، لەلایەکی تریشەوە ئەو هێزە پاڵیان پێوە دەنێت و بەو هۆیەوە بەشەکانی لە یەکتر جیا دەبنەوە.

ململانێی ئەم دوو هێزە بەردەوام دەبێت تا دەگاتە ئەو کاتەی ناکۆکییەکەیان چارەسەر دەکرێت. بازدانەکە سنوورێك دادەنێت بۆ ئەم یەکێتییەی نێوان دژەکان و، باری چلۆنایەتییەکی نوێ بۆ ناکۆکی نوێ پەیدا دەبێت: ئاوەکە دەبێت بە هەڵم. لە ئەنجامی ئەمەدا چارەی ناکۆکییەکە دەبێتە هۆی چلۆنایەتییەکی نوێ و، پەرەسەندن و بزوتنەوەو ئاڵوگۆر.

لە ناو کۆمەڵیشدا هەر بەم چەشنە روو دەدات، لە کاتێکدا کە ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵی سەرمایەداری دەبێتە هۆی رووداني شۆڕشی سۆشیالیست، ئەوا کاتی چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییانە هاتووە بە هۆی ململانێی دژەکان و چاری ناکۆکییان ئەوە کۆمەڵ هەنگاو دەنێتە پلەیەکی بەرزترو کۆمەڵی تازەی سۆشیالیست جێگای کۆمەڵی کۆنی بۆرژوازی دەگرێتەوە، بەم چەشنە بۆمان دەردەکەوێت کە ململانێی دژەکان، و چارەکردنیان سەرچاوەی پەرەسەندنی کۆمەڵە، بەم چەشنە ناوەرۆکی یاسای یەکێتی و ململانێی دژەکان لەوەدایە کە لە ناو هەموو







شت و مەك وپرۆسیسیەکاندا هەندێ لایەنی ناکۆکی هەن لە یەکێتییەکی بەتیندان و هەر لەو کاتەشدا لە ناکۆکییەکی بەردەوامدان ئەم ململانێی دژانە سەرچاوەی ناوخۆیی و هێزی بزوێنەری پەرەسەندنە، لینین ئەم یاسایەی ناوناوە، ناوەرۆك و ناووکی دیالەکتیك.

ئێستاش با خاسیەتی ناکۆکییەکانی ناو ژیانی کۆمەڵایەتی روون بکەینەوە.

ناکۆکی نێوان سەرمایەدارو کرێکارێك زۆر جیاوازە لە ناکۆکی نێوان دوو کرێکار کە بەرژەوەندی چینایەتییان یەکە. لە باری یەکەمدا، ناکۆکییەکان سەخت و، دژوارن. ناکۆکی چینایەتین، بەلاْم لەباری دووەمدا ناکۆکی نێوان دووهاوڕێییەکە لە کارکردندا. لەبەر ئەوە ڕێگای چارکردنیان جیاوازە، شێوەی یەکەمی ناکۆکییەکان پێیان دەوترێت دوژمنانەو، شێوەی دووەمیش پێی دەوترێت نا دوژمنانە. ناکۆکییەکانی دوژمنانە ئەو چەشنەن کە لە کاتێکدا دەبن ململانێی نێوان بەرژەوەندییەکان بە جۆرێك بن پێکەوە نەگونجێن، لەناو کۆمەڵیشدا ناکۆکی دوژمنانەی دژوار لە ناو هێزو چینە دوژمنەکاندا پەیدا دەبێت. هەر ئەو ناکۆکییانەن دەبنە هۆی پێکدادانی نێوان دەرەبەگ و جووتیار، بۆرژوازیو پرۆلیتاریاو گەلانی ژێر دەستەو ئیمپریالیستەکان.

بۆ روونکردنەوەی ئەمەش کۆمەڵی سەرمایەداری دەکەینە نموونە:کۆمەڵی بۆرژوازی باوی نەماوەو رۆژی بەسەر چووە. ئەم

کۆمەڵە بۆتە کۆسپی ڕێگەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی. لەم ڕۆژگارەشدا لەسەر بەرنامە نەبێت ناتواندرێت بەرهەم بە سەرکەوتوویی بەڕێوە ببرێت، ئەمەش لە سێبەری سەرمایەداریدا موڵکایەتی تایبەتی و ناکۆکی و بەربەرەکانێی ئابووری نێوان ئەم سەرمایەدارو ئەو سەرمایەدارو، ئەم شەریکەو ئەو شەریکە خاوەن دەسەڵاتن، ئەم چەشنە بەڕێوەبردنەی ئابووری دەبێتە مایەی پەشێوی بەرهەم هێنان و بێ بەرنامەیی و، نەبوونی ڕژێمێکی ڕێکوپێکی ژیانی ئابووری، هەر لەبەر ئەمەشە بە چەشنێکی(دەوری) لە کۆمەڵی سەرمایەداریدا تەنگ و چەڵەمەی زیادەی بەرهەم ڕوودەدات و، بێ کاری پەرە دەسێنێت و کۆمەلانی گەل توانای کڕینی کەلوپەل و کوتاڵیان نابێت، ئەمەش لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی بەرهەم هێنان و زۆربوون و بلاوبوونەوەی بێکاری. هەموو ناکۆکیەکانی تریش کە کۆمەڵی سەرمایەداری ئەمڕۆ وێران دەکەن و بەرەو ڕوخانی حەتمی دەبنەوە، بەم ناکۆکییەوە بەستراونەتەوە.

ناکۆکی و دوژمنایەتییەکی قووڵیش هەیە لە نێوان دەوڵەتانی ئیمپریالیزم و ئەو وولاتانەدا کە تازە سەربەخۆیی نیشتمانیان وەرگرتووەو یان لە پێناوی ڕزگاریدا خەبات دەکەن، گەلانی ئەفریقاو ئاسیاو ڕۆژهەلاتی نزیك و ئەمریکای لاتین نایانەوێ سەر شۆڕکەن بۆ تالآنچێتی ئیمپریالیزم و، لەپێناوی ڕزگاربوونیاندا لە خەباتدان.

ناکۆکی نێوان کارو سەرمایەو ناکۆکییەکانی نێوان گەلان و مۆنۆپۆلەکان و، گەنیوی ڕژێمی کۆلۆنیالیزم و ناکۆکییەکانی نێوان








دەوڵەتانی نیشتمانی(نەتەوەیی) تازە پێگەیشت و لەگەڵ دەوڵەتانی مەتروپۆلی کۆن وبەخۆدای هاتنی بە تەوژمی سۆشیالیزمی جیهان، هەموو ئەمانە ئیمپریالیزم ڕاماڵ دەکەن و وێرانی دەکەن و دەبنە هۆی لاوازکردن و پەکخستنی و مردنی. ئەمەیە رووی ڕاستەقینەی سەرمایەداری کە ناکۆکییەکانی ناوخۆیی شڕیان کردووەو ئەمە دوا ڕژێمی ڕەنج خۆری و چەوسانەوەیە بەرەو چاڵی مەرگ دەبەن.

جا کەواتە چۆن ناکۆکییەکانی دوژمنانە چارەسەر دەکرێن؟

ناکۆکییەکانی دوژمنانە بریتین لە ناکۆکی سەخت و ئاڵۆزی نێوان هێزو بەرژەوەندو ئامانج و بیروباوەڕە کۆمەڵایەتییەکانی دوژمن بە یەکتر کە دەبنە مایەی ناڕێکی و بەگژدا چوون و پێکدادان و چارەسەرکردنیشیان لە ڕێگای خەباتی توندوتیژەوە پێك دێت، لەڕێگای شۆڕشی کەمەڵایەتییەوە. هەرگیز ناکرێت ئەو ناکۆکییە دوژمنانەیە لە قەوارەو چوارچێوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە کۆنەکاندا چارەسەرکردنیان دەبێ بەڕێگای شۆڕشگێڕانە ئەو پەیوەندییانە لە ناو ببرێن بەلاّم ئایا ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە شێوەو ڕێگای چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی دوژمنانە هەمیشە هەروەك خۆیان دەبن؟ بێگومان نەو. . . . چونکە مەسەلەکە لە سەر ئەو هەلومەرج و ڕۆژگارە وەستاوە کە ناکۆکی دوژمنانەیان تێدا چارەسەر دەکرێت، بۆیە دەبینین لە هەر بارێکی مێژوویی جیاوازدا شێوەی جۆربەجۆر هەن بۆ چاری ئەو چەشنە ناکۆکییانە بۆ نموونە: ژمارەیەك لە ولاّتان لە خەباتێکی چەکدارانەی درێژخایەندا دژی

ئیمپریالیزم، سەربەخۆیی نیشتمانییان وەدەست هێناوە، بەلاّم هەندێکی تر لە خەباتێکی نەبەزانەی درێژی کۆمەلاّنی گەلدا ئەو ئامانجەیان هێناوەتە دی بەبێ خەباتی چەکدارانەی ڕاستەوخۆ.

بەلاّم ناکۆکییەکانی نا دوژمنانە، جیاوازییان لە ناکۆکی دوژمنانە لەوەدایە کە ئەمەی یەکەمیان ناکۆکی نێوان ئەو هێزە کۆمەلاّیەتییانەیە کەهەر لەو کاتەشدا بەرژەوەندی گرنگ و هاوبەشیان پێکەوە هەیە. بۆ نموونەی ئەم جۆرە ناکۆکییانە وەك: ناکۆکییەکانی چینی کرێکارو جووتیار، ناکۆکی نێوان کەسانی پێشکەوتوو کەسانی دواکەوتووی ناو ئەو کۆمەڵەی کە ژیانی خۆی لەسەر ڕێ و شوێنێکی نوێ پێك دێنێت.

لە کۆمەڵی سۆشیالیستیدا ناکۆکییەکانی نا دوژمنانە هەن کە نابنە هۆی قووڵ بوونەوەو بەتین بوونی ناکۆکییەکان تا رادەی دژایەتی، بەڵکو شتەکە بەپێچەوانەوەیەو بەرژەوەندی قووڵی گشتی و هاوبەش چینەکانی یەك خستووەو ناکۆکییەکان بارێکی نەرمیان وەرگرتووە لە بەر ئەوە ڕێگای چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکییانە لە ڕێگای چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی دوژمنکارانە جیاوازی زۆرەو ناکۆکییەکانیش خۆیان جیان، ناکۆکییەکانی نا دوژمنانە بەڕێگای شۆڕشەکانی کۆمەلاّیەتی و کودەتای سیاسی چارەسەر ناکرێت، بەڵکو بە ڕێگای پەروەردەکردن و رەخنە و رەخنە لە خۆگرتن، هەروا بە هەندێك ڕێ و شوێنی تر کە لەباری هەست پێکراوی هەر ولاّتێکەوە دێنە کایەوە.







لە کۆمەڵی سۆشیالیستیدا، لە کاتێکی باش و لە باری خۆیدا ناکۆکییەکان ئاشکرا دەکرێن و راستەوخۆ ڕێگای چارەسەرکردنیان پیشان دەدرێت، لە بەر ئەوە ئەو ناکۆکییانە نابنە پێکدادانی سەخت و گرانی نێوان و هێزو بەرژەوەندی دوژمن بەیەکتر، چونکە لە ڕۆژگارو سەردەمی کۆمەڵی سۆشیالیستیدا یەکێتی و هاو بەرژەوەندی هەیە و، یەکێتی ئایدیۆلۆژی و سیاسی هەمووکۆمەڵ بەهێز دەکرێت.

لە وولاّتانی تازە پێگەیشتووی رزگاربوو لە چنگی ئیمپریالیزم، لەسەر ڕێ و شوێنی پەرەسەندنی نا سەرمایەداری نەبێت ناتوانرێت هەموو ناکۆکییە کۆمەلاّیەتییەکان بە سەرکەوتوویی چارەسەربکرێن، نەبوونی ناکۆکی دوژمنانە لە کۆمەڵی سۆشیالیستیدا مانای وانییە کە هیچ جۆرە ناکۆکییەك نەبێت، لە ناو کۆمەڵی سۆشیالیستیدا ناکۆکی نا دوژمنانەیەو بە سەرکەوتووانە لەناو چوارچێوەی رژێمە کۆمەلاّیەتییەکەی خۆیدا، خۆیدا چارەسەر دەکرێت.

بەلاّم با بزانین ئاخۆ پەرەسەندن چۆن دەبێت و؟ بەکام ڕێبازدا دەڕوات؟ یاسای(نەفی کردنی نەفی) وەلاّمی ئەو دوو پرسیارە دەداتەوە.

## ٤- یاسای نەفی کردنی نەفی

هەموو دەزانین کە لە دنیای دەورو پشتماندا هەندێك دیاردەی وەك پیربوون، لەناوچوون و، مردن تووشی دەبین و ئاشکرایە کە هەموو شتێك سەرەتاو بەخۆدا هاتن و پێگەیشتن و پیربوون و لەناوچوونی هەیە. بەم چەشنە دەبینین ناوەرۆکی نەفی لەوەدایە کە هەموو شتێك تازە دەبێتەوەو پاشان پەکی دەکەوێت، دیاردەی کۆن لەناو دەچێت ودیاردەی تازە جێگای دەگرێتەوەو بە کورتی (نەفی) ئەوەیە کە دیاردەکە پەرەدەسێنێت و دەگاتە پلەیەکی نوێی بەرزتر.

جا بۆ ئەوەی بە باشی لەمە تێ بگەین دەبێ ئەوەش بزانین کە (نەفی) واتە پەککەوتنی دیاردەکان کە باویان نەماوەو بە زۆر چەشنە شێوە پێکدێت، بۆ نموونە ئامرازێك کۆن دەبێت و دەبێتە پارچە شکاو، ئەمەش نموونەیەکە بۆ نەفی کردن بەو مانایەی کە ڕۆژانە تووشی دەبین و باسی لێدەکەین خۆ ئەگەر خۆمان ئەو ئامرازە تێکشکێنین هیچ هەلومەرجێکی وا دروست نابێت کە بە ڕێگای کاری نەفی شتێکی نوێ پەرەبستێنێ. ئەم چەشنە نەفی کردنەش لەژیانی ڕۆژانەدا تووشمان دەبێت و هەندێ جار دەبێتە کارێکی پێویست. بەڵام ئاشکرایە کە هێڵی سەرەکی جووڵانەوەی مێژووی بریتییە لە دروست کردن.

ئەو شتانەش کە لە سروشت و کۆمەڵدا دەردەکەون بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار پیردەبن و شوێن بۆ دیاردەی تازەتر چۆڵ دەکەن








و ئەگەرچی لە رابردوودا ئەوشتە خۆی کە تازە بوو کۆنی نەفی کردووە. بەڵام ئەمڕۆ خۆی کۆن دەبێت و لەلایەن دیاردەو هێزی تازەترەوە نەفی دەکرێت و دەخرێتە کەنارەوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا نەفیکردنی نەفییە. جا لە بەر ئەوەش کە لە جیهاندا هێندە دیاردە هەن لە ژمارە نایەن. کاری نەفی کردنیش بەردەوام و بێ کۆتاییە واتە نەفیکردنی کۆن و دروست کردنی نوێ بەبێ ڕاوەستان پێك دێت.

با نموونەیەك باس بکەین لەم ڕووەوە: لە کاتی چاندنی کشتوکاڵدا تۆوەکە دەڕوێت، پێ دەگات و گەورە دەبێت و بەرهەم دەدات، لە کاتی چاندندا ئەو تۆوەی ناو گڵەکە لە ناو دەچێت و لە تۆوی دەکەوێتەوەو تووشی(نەفی) دەبێت. لەم تۆوە ڕووەکی تازە پێدەگات کە لە ئەنجامدا بەرهەم و تۆوی نوێ دەدات. تەواوی ئەم پێگەیشتنی بەرهەمە خۆی لە خۆیدا نەفی کردنی نەفییە. ڕاستە ئێمە لە ئەنجامدا هەر دەگەینەوە ئەوەی کە چاندوومانەو وەك دەڵێین چیمان چاندووە ئەوە دەدورینەوە، بەڵام ئەم دووبارە بوونەوەیە لەسەر بنچینەیەکی تازەیەو بەرزترە. خۆ ئەگەر خەڵکی چەندیان چاندووە هەر ئەوەندەشیان دەست بکەوتایە ئەوا زەوی کێڵان و چاندن هیچ سودێکی نەدەبوو، سەرەتا (تۆوکردن)و کۆتایی (درونەوەو بەرهەم کۆکردنەوە) لەم نمونەیەدا دووپلەی پەرەسەندنن کە لەڕووی چلۆنایەتییەوە لێك جیاوازن پلەیەکی سەرەتایی نزمو پلەیەکی بەرزن، لەئەنجامی ئەمەدا پەرەسەندن لە شوێنی خۆیدا

نامێنێتەوە، بەڵکو لە نزمەوە بۆ بەرز دەڕوات. بەم جۆرە، ناوەڕۆکی یاسای نەفی کردنی نەفی بەکورتی ئەمەیە: لە پرۆسیسی پەرەسەندنی هەر پلەیەکی بەرزتر پلەی ڕابردووی نەفی دەکاتەوەو لای دەداتو، هەر لەو کاتەشدا بەرزی دەکاتەوە بۆ پلەیەکی نوێو هەموو ناوەڕۆکێکی باشی لە پەرەسەندنێکدا دەپارێزێت.

نەفی کردنی نەفی لە دیالەکتیکدا نەفی کردنو پاراستنیش وەك یەك پێویست دەکات، بەڵام دیارە پاراستنی هەمووشتێکی باش و ئیجابی مەبەستەو لە دیاردە کۆنەکاندا بەبێ ئەمەش پەرەسەندن ناگونجێت. نەفیکردنی دیالیکتیکانە وەك لایەنی پەیوەندییە لەگەڵ پلەی پەرەسەندنی ڕابردوواو ئەنجامی ئەو پەرەسەندنەیەو لە ناوەڕۆکدا مانایی تێپەڕکردنە لە پەرەسەندنەکەی پێشوو نەك بەتەواوی لەناوبردنی. بۆ نموونە ئەوە باس دەکەین کە فەلسەفەی مارکسیزم هیچو لەبۆش پەیدا نەبووە، بەڵکو میراتگرو جێگری لێهاتووی هەموو شتێکی پێشکەوتووە کە لەمەوبەر بیری فەلسەفەی ڕابردوو دروستی کردووە. (جا کەواتە سروشتی پەرەسەندن کامەیە؟)

ئاشکرایە کەمرۆڤ لەسەرەتای هەڵسوڕانیدا شتومەکی کارکردنی دروست کردووەو لە پلەیەکی تایبەتی پەرەسەندندا کەلوپەلی بەردین شوێنیان چۆڵ کردووە بۆ کەلوپەلی لە میتاڵ دروستکراو، بەڵام هەرچییەکی باشو بەنرخ بووبێت هێشتوویەتییەوە، وەك توانای بڕینو شێوەی کەرەسەکە ((وەك تەوری بەردینو ئاسن))و شتی وا کە لە شێوەدا لەیەك دەچن.





دروستکردنی کەرەسەی ترو مەکینەو شتی وا پێشکەوتنێکی تازەبوو لە پەرەپێدانی کەرەسەی بەرهەم هێناندا. مەکینەی ڕستو چنینو نەفی کردنی خەرەکی دەستییەکە کۆن بەکار دەهات، بەڵام نەفی کردنێکی دیالەکتیکانەیە چونکە تاڕادەیەك مەکینەکەش لە بنچینەدا لەسەر شێوازی خەرەکە دەستییە کۆنەکە کاردەکات، لەتەکنیکدا هەمیشە ئەم مەسەلەیە هەر بەم چەشنەیەو هەموو نەخشو ڕێو شوێنێکی تازەی مەکینەکان نەفی کردنی ئامرازو مەکینە کۆنەکانن بەڵام ئەو شتە باشە دەپارێزن کە لەوەوبەر لەبەرهەم هێناندا بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە.

ئەمە سروشتو شێوەی هەر پەرەسەندنێکە کە لەئەنجامی نەفی کردنی نەفیدا پێك دێت، پلەی بەرزیش لەبەر ئەوە پلەی بەرزە چونکە تەواوی پەرەسەندن بەرز دەکاتەوەو لەهەموو لایەنێکەوە تەواوی دەکات، لەمەوە ئەنجامێکی گرنگمان دەست دەکەوێت: ئەو پەرەسەندنەی لە ئەنجامی نەفی کردنی نەفیدا پێك دێت سروشتێکی پێشکەوتنخوازانەی هەمیشە بەرەو پێش چووی هەیە.

بێگومان ئەم بە ئەنجام گەیشتنە بۆ پەرەسەندنی سروشت و کۆمەڵی مرۆڤایەتیش هەر ڕاستە. چونکە پەرەسەندن لە سروشتدا گواستنەوەو تێپەڕبوونە لە پلەیەکی نزمەوە، لە سروشتی بێگیانەوە بۆ پلەیەکی بەرزتر، بۆ سروشتی گیاندار، لەناو کۆمەڵیشدا ئەو ڕێگایەیە کە لە کۆمۆنی سەرەتاییەوە بڕیویەتی بۆ سۆشیالیزم کە پلەی یەکەمی کۆمەڵی کۆمۆنیزمە. لە پەرەسەندنی زانیاریشدا





مەسەلەکە هەر بەم چەشنەیە.

بەم جۆرە دەبینین لە هەر شوێنێك بێت پەرەسەندن ئاوایە: بەجۆرێکی سەربەرەو ژوور دەڕوات، لە نزمەوە بۆ بەرز، لەسادەوە بۆ ئاوێتە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا ناوەڕۆکی یاسای نەفیکردنی نەفییە بەڵام ئەو کەسانەی بە چەشنێکی ئایدیالیستانەی بۆرژوازییانە دەڕواننە جیهان، ڕووداوە مێژووییەکان بە شێوەیەکی جیاواز تێدەگەن کە سەرجەم ڕەشبینیو بە چاوی کەساسی ڕواننینە ژیانە.

هەندێك لە فەیلەسوفو زانا بۆرژوازییەکانی کۆمەڵایەتی، کە تەماشا دەکەن دنیای سەرمایەداری دەڕوخێت، ئاوا بوونی ئەم ڕژێمە کۆمەڵایەتیە وا دادەنێن کە تەنگو چەڵەی ڕۆشنبیریو بیروباوەڕو خولیای مرۆڤایەتییە بە گشتیو، ئەوەندەی بۆیان بکرێت باسی ((نوکلیار))و ((دوایی هاتنی شارستانی))و ((کۆتایی دنیا))و شتی وا دەکەن ئەمە لە کاتێکدا کە زانیاریو هەڵسوڕانی مرۆڤ هەموو ئەو لافو گەزافەی فەیلەسوفە بۆرژوازییەکان پووچ دەکەنەوە، پەرەسەندنی بەرەو ژوورو، پێشکەوتنخوازانەی سروشتو کۆمەڵی مرۆڤایەتی یاسایەکی جێگیری مەوزوعییە. سەرکەوتنەکانی وولاتانی سۆشیالیست لە پەرەپێدانی ئابووریو ڕۆشنبیریداو پرۆژەکانی بوژانەوە لەو ولاتانەی لە تەوقی ئیمپریالیزم ڕزگاریان بووە. ئەم ڕاستیە دەسەلمێنن کە باسمان کرد.

جا ئەگەر چی هەندێك جار وا دێتە بەرچاو کە ئەنجامی نەفی کردن گەڕانەوەیە بۆ کۆن، بەڵام لەڕاستیدا ئەمە هەر بە ڕواڵەتەو، لە







ناوەڕۆکدا وا نییە، چونکە ئەوەی لە تاقیکردنەوەدا ڕوویداوە دەوڵەمەندکردنی کۆنو بەرزکردنەوەیەتی بۆ پلەیەکی بەرزتر.

پەرەسەندنی ڕوو لە هەورازی سروشتو کۆمەڵ زۆرجار زەمبەلەکمان دێنێتەوە یاد. دەبینین زەمبەلەك ئەڵقەی زۆرە بەڵام هیچیان بەیەك ناگەنو دووبارە نابنەوە. هەروا ئەگەر بەسەر پێپیلکەیەکی بە پێچو دەورەدا سەر بکەوینو وا دەزانین کە لە ئەڵقەیەکدا دەسوڕێینەوەو بەرزنابینەوە بەڵام لە راستیدا وانییەو پلە بە پلە بۆ سەرەوە بە هێڵێکی وەك زەمبەلەکەدا ئەم بەراوردکردنە بە باشی ناوەڕۆکی یاسای(نەفیکردنی نەفی) مان بۆ ڕوون دەکاتەوە لە ژیانی ڕۆژانەدا وا باوە کە شتی نوێ ئەوەیە بۆ یەکەمجار دروست بکرێتو تازە پەیدا بێت. بەڵام مانای فەلسەفییانەی ئەم لێکدانەوەیە کەمێك جیاوازە، بۆ نموونە ئەگەر لە ڕۆژئاوا قوتابخانەیەکی فەلسەفەیی پەیدا بێتو ناوی قوتابخانەیەکی نوێی فەلسەفەی لێ بنرێت ئەبینین لەژێر پەردەی ئەو ناوەدا بیروباوەڕی کۆنی وا بلاودەکاتەوە کە لە مێژوو بێت باوی نەمابێت. بەمجۆرە ناکرێ ناوی بەسەرا ببڕین بەڵکو بەپێچەوانەوە کۆنەو دواڕۆژی نییەو،زۆرجار لە ژیاندا لە بەرگی نوێدا سەرهەڵدەداتو ئەمەش بلاوەو شێوەیەکە بۆ شاردنەوەی خەباتی کۆن لە دژی نوێ. با ئەم نموونەیەش باس بکەین:

ئاشکرایە ئیمپریالیزمی کۆن و شێوەکانی بەتەواوی ژێرکەوتن، بەڵام ئەوەتا دەبینین ئێستا ئیمپریالیستەکان دەیانەوێت بەشێوەیەکی تازە خۆیان بەسەر ولاتانی ڕزگاربوودا بسەپێننو ئامادەیی خۆیان

پیشان دەدەن گوایە بۆ ((یارمەتیدان)) ی دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو، بۆ ئەو مەبەستەش دامەزراوەو یەکێتی شتی وا دروست دەکەن، بەڵام لە ڕاستیدا ئیمپریالیزمی نوێ هیچ لەوی کۆن باشتر نییەو گەلانیش زۆر باش ئەمە دەزانن و لەسەر خەبات بەردەوامن لە دژی ئیمپریالیزمی نوێ.

ماتێریالیزمی دیالەکتیك وا لە نوێ دەگات دیاردەیەکە پەرەسەندنی بەرەوژوورو بۆ بەرەوە دەردەبڕێت. نوێ پێشڕەوە، پێشکەوتنخوازە، پەیوەندییەکی پێویستی لەگەڵ تازەبوونەوەو لەگەڵ پەرەسەندندا لە نزمەوە بۆ بەرز هەیە جا ئایا پەیوەندی نێوان دیاردە کۆن و تازەکان چییە؟

پێشەکی دەبێ ئەوە بڵێین کە نوێ بەبێ پەیوەندی و دوور لە کۆن پەیدا نابێت، بەڵکو هەر لە کۆنەکەدا یان تۆوی نوێ یاخود هەلومەرجی پێویست بۆ پەیدابوونی نوێ پێك دێت و، ئەوەندەی کە نوێ پەرەدەسێنێت و بەخۆیدا دێت ئەوەندەش کۆن لاوازو بەهێز دەبێت، نوێ هەمیشە نەفیکردنی دیالەکتیکانەی کۆنە. لە ناوەندی ململانێی دژەکاندا پەیدا دەبێت. پەیدا بوونی نوێ شتێکی حەتمییەو، ئەمە یاسای پەرەسەندنی مێژووە، ئەمڕۆ بە تەواوی ئەمەمان بۆ دەسەلمێنێت کەوا دەبینین لە سەر دارو پەردووی ڕژێمی کۆنی ئیمپریالیزم دەوڵەتی تازە پێگەیشتوو دامەزراون، ئەم دەوڵەتانە هێزێکی تازەی بەکارن لە خەباتدا دژی ئیمپریالیزم.








## ٥-واتاکانی دیالەکتیکی مارکسی واتاکانی فەلسەفە چین؟

مرۆڤ ناتوانێت دەست بەرداری لێ تێگەیشتنە گشتیەکان ببێت بۆ نموونە فیزیازانەکان لە خاسیەتەکانی هەموو چەشنە لەشێك دەکۆڵنەوە وەك مانەوەیان لە بارێکی سەرەتایی راوەستاندا یان جووڵانەوەی ڕێك و پێك و هاوسەنگ، بەڵام ناکرێ هەر بەوەندە بەس بکەن چونکە بە ناچاری ئەم پرسیارەمان دێتە پێش: بۆچی لە هەموو لەشەکاندا ئەم خاسیەتانە دەردەکەون و شتی هاوبەشیان چییە؟بەم جۆرەو لەسەر بنچینەی لێکۆڵینەوەی خاسیەتی هەندێك شت، فیزیازانەکان لێ تێگەیشتنێکی گشتی دادەڕێژن کە ئەویش ((هێزی بەردەوام بوونە))، دەبێ هەر ئەو شتەش بەرامبەر بارستایی(كتلة) بووترێت- کە پێوانەی راوەستاوی لەشەکانە لێرەدا هەر تەنیا لێکۆڵینەوەی بارستایی هەندێك لە شتەکانیش بەس نییە. بەڵکو پێویستە بیروڕایەکی گشتی دەربارەی بارستایی بە شێوەی گشتی دابڕێژرێت و هەر لەسەر ئەم پێودانگەش لە فیزیکدا لێ تێگەیشتنێکی گشتی پێك دێت کە ئەویش ((ووزە))یە.

بەڵام ئاخۆ ئەم واتانەی کە هەن بە تەنیا بەسن بۆ گشت زانستەکان؟

هەریەکەیان لە لێ تێگەیشتنە گشتییەکان دەکۆڵنەوەو لەسنووری

ئاگاداری خۆیاندا. بەلاَم خۆ ئێمە دەزانین کە لە دنیادا گشتی ترین خاسیەتی شت ومەك و دیاردەکان هەن، ئەوەی کە ئەم لێ تێگەیشتنە گشتییانە دادەڕێژێت فەلسەفەیە.

گشتی ترین خاسیەتی شتەکانیش لە واتاکانی فەلسەفەدا خۆیان دەنوێنن، لەو واتانەدا کە لە لای ئێمە ناسراون وەك ((مادە))و ((جوولانەوە))و ((شوێن))و ((کات))و ((چلۆنایەتی))و ((چەندایەتی))و ((ناکۆکی))و شتی وا. . . . واتەکانی فەلسەفە گشتی ترین لێ تێگەیشتنن. بەم جۆرە دەبینین کە مەحاڵە تەنیا بەو واتانە بەس بکرێت کە لە لایەن فیزیك و کیمیاو زانیارییە تایبەتییەکانی ترەوە دادەنرێن، لە پرۆسیسی زانستدا هەندێك واتەی فەلسەفەیی دروست دەبن بۆ دەربڕینی گشتی ترین خاسیەتی دیاردەکانی ئەم جیهانە، وا لەمەولاش لە هەندێك واتە ورد دەبینەوە وەك: هۆو ئەنجام، پێویست و سەربەستی، ناوەڕۆك و شێوە.







## هۆو ئەنجام

ئێمە دەزانین کە هیچ دیاردەیەك نییە لە خۆڕاو بەبێ هیچ هۆیەك پەیدا بێت ئەمەشمان بە تەجروبە بۆ دەرکەوتووە. هەر شتەیان لەوەی پێشووی برەو دەسێنێت، یاخود لە شتی ترەوە، هیچ شتێکیش لە هیچ پەیدا نابێت و هەموو دیاردەیەك سەرچاوەی هەیە و ئەو شتەی هەیە کە لێوەی پەیدا دەبێت. بەمەش دەوترێت ((هۆ)) بەم چەشنە دەبینین ((هۆ)) ئەو شتەیە کە هان دەداو، دروست دەکاو، بەرهەم دێنێت، دیاردەیەکی تر دەژێنێتەوە، ئەوەش کە بە تەئسیری هۆیەکە دروست دەبێت پێی دەوترێت ((ئەنجام)) بۆ نموونە، کاتێك جووتیار مەرەزەو لۆکە پەین دەکات و ئەم پەینە دەبێتە هۆی ئەوەی بەرهەمیان زۆرتربێت. ئەمەش مانای وایە پەینەکە بووە بەهۆ، بەلاَم زۆر بوونی بەرهەمەکە ئەنجامە.

بەم چەشنە ئەم دوو واتایە(هۆ)و(ئەنجام)، پەیوەندی دوو دیاردە دەردەخەن کە یەکێکیان پێی دەوترێت هۆو بە چەشنێکی حەتمی دیاردەیەکی تر پەیدا دەکات کەپێی دەوترێت ئەنجام. بە پەیوەندییەکەش دەوترێت پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجام.

ئەم پەیوەندییەی لە نێوان پەینەکەو بەرهەمە زیادەکەیدا پەیدا دەبێت بە چەشنێکی سەربەخۆیە لە هۆشمەندی مرۆڤ و خۆی لە خۆیدا لە راستی و لەناو سروشتدا هەیە. لەم نموونەیەوە روون دەبێتەوە کە هەموو پەیوەندییەکی هۆکاری لەلایەن ئەو شتانەوە

دێنە کایەوە کە خۆیان بە چەشنێکی واقیعی هەن لە بەر ئەمە گرنگترین خاسیەتی پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجام ئەوەیە کە بە چەشنێکی مەوزوعی، واتە سەربەخۆ لە خواست و ئارەزووی مرۆڤ هەیە.

ئەوخاوەن بیروباوەڕانەی کە دەبینن لە سروشت و کۆمەڵدا هۆکارییەکی گشتی بە مەرج هەیە بۆ گشت دیاردەکان و بە جۆرێکی سەربەخۆ لە مرۆڤ پێیان دەوترێت(حەتمییەکان) یان جەبرییەکان (CECERMINISTES) بەم جۆرە ئەمانە گشت حەتمییەو بەپێی ئەم یان ئەو یاسایە هەن، هەر شتێکیش لە جیهاندا روو دەدات پێویستەو دەبێ بە جۆرێکی حەتمی روودبدات.

حەتمییەکان بە درێژایی مێژووی فەلسەفە لە خەباتدان دژی نا حەتمی، هەموو چەشنە ئایدیالیستەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە مرۆڤ خۆی لە پێناوی(حەسانەوە) دا هۆکاری داهێناوە، بۆ ئەوەی ((بەشێوەی دیاردەکانی گەردوون)) رێکوپێك بکرێت. بۆ نموونە ئەوە بوو فەیلەسوفی ئایدیالیستی خۆیی بیرکلی بیروباوەڕی هۆکاریی بەرپەرچ دایەوە. هەروا ئایدیالیستەکانیش لە ناوەرۆکدا هەوڵی ئەوەیاندا دەستیان کرد بە ئینکارکردنی ئەوەی هۆکاریی بە چەشنێکی مەوزوعی بێت.

ئایدیالیستەکان بیروباوەڕی خۆیان دەربارەی سروشتی خۆکردنی هۆکاری بەم چەشنە بەڵگە بێ بنەوانە پشت ئەستوور دەکەن کە بۆ نموونە دەڵێن: مۆمی داگیرساو هەموو جارێك ئەگەر دەستی لێ بدرێت







دەست دەستووتێنێت، بەلام لافی ئەوە دەدەن گوایا ئەمە دەگونجێت کە یەك ملیۆن جار رووبدات، بەڵام لەوانەیە لە ملیۆن و یەکەمی جاردا بە جۆرێکی تر بێت و ئەو راستییەی کە مۆمی داگیرساو بووە هۆی سووتاندن تا ئێستا مانای ئەوەی نییە کە مۆمەکە هۆی سووتاندنە.

ئەوان دەڵێن ئەم دیاردەیە مۆمی داگیرساو وسوتاندن، شان بە شانی یەك هەن و بەڵام ناکرێ لەمەوە بگەینە ئەوەی کە پەیوەندییەکی هۆکاری لە نێوانیاندا هەیە بێگومان ئەم چەشنە بەڵگانەی ئایدیالیستەکان بۆش و بەتاڵن. چونکە وەنەبێ ئێمە تەنیا پشت بە بینین فەرمان بەسەر هۆیەکدا بدەین. نەخێر بەڵکو ئێمە لەسەر بنچینەیی تەجرەبە و هەڵسوڕان لێی دەکۆڵینەوەو بەو رێگەیە بۆمان دەردەکەوێت کە بۆچی بە جۆرێکی پێویست ئاگر دەبێتە هۆی سووتاندن.

لە جیهاندا پەیوەندییەکانی هۆکاری ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن. بەڵام وەنەبێت هەموویان دەورگێڕانیان چوون یەك بێت. هەیانە پەیوەندی سەرەکین و پێویستە لەوانی تر جیا بکرێنەوە.

جا ئایا چۆن ئەمەمان بۆ دەکرێت؟

ئەگەر بمانەوێت بزانین هۆی نەڕوانی تۆوێك چییە؟ بێگومان زۆر هۆی ئەو نەڕوانەمان دێتە پێش، بەڵام دوای لێکۆڵینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەندێ هۆی سەرەکی هەن و ئەم هۆیانە ئەوانی دیکەش دیاری دەکەن. لەوانەیە تۆوەکە بە هۆی کەمی گەرماوە، یان زۆری شێدارییەوە. یان کاتی تۆوکردن و باش بوونی تۆوکردنەوە. . .

هتد نەڕوانێت.

بێگومان ڕوونکردنەوەی هۆی سەرەکی کارێکی گرنگە چونکە مۆڵەتی ئەوە دەدات کەبە چەشنێکی کاریگەری کار بکاتە سەر ئەو ئەنجامەی پێویستە. بەڵام ئەمەش بە هیچ جۆرێك مانای وانییە کە گوێ نەدرێتە هۆیە نا سەرەکییەکان. بەڵکو پێویستە ئەو هۆیانەش دەربخرێن و ئەگەر بوونە کۆسپی ڕێگە دەبێ لابخرێن جا لەبەر ئەوەی هۆئەنجام  دروست دەکات، لە نێوانیاندا پەیوەندییەکی تایبەتی هەیە.

بەڵام میتافیزیکەکان بە چەشنێکی یەك لایی لە مەسەلەی کارتێکردنی هۆ لە ئەنجام تێدەگەن. بەڵام ئاخۆ ئەنجام کار دەکاتە سەر هۆ؟ میتافیزیکەکان ناتوانن وەڵامێکی راستی ئەم پرسیارە بدەنەوە، چونکە ئەوان دوو دژ لێك جیادەکەنەوە، هۆ لە ئەنجام جیادەکەنەوە. ئەوان بەم چەشنە دەڵێن: ئەم دیاردەیە یان هۆ دەبێت یاخود ئەنجام، جا ئەگەر وەك هۆ دەرکەوێت ئەوا پاشان ناتوانێت ببێتە ئەنجام بەڵام ئەمە راست نییە. چونکە لە نێوانی هۆو ئەنجامدا تێکەڵ بوونێکی تەواو هەیە، جا ئایا پێکهاتنەکەی چۆنە؟ لەم نموونەیەی خوارەوەدا ئەمە ئاشکرا دەکەین: مادەو بوون هۆشمەندی دەخەنەوە، بەڵام هۆشمەندی خۆیشی کار دەکاتە سەر بوون و بە چەشنێکی کاریگەر لە راستی دەوەستێت، ئالێرەدا بەڕووی کارلێککردنی هۆو ئەنجام دەردەکەوێ. بەڵام ئاخۆ ئەوەی کە وترا مانای وانییە کە هۆو ئەنجام بە چەشنێکی یەکسان بۆ یەکتری مەرجن؟ بێگومان. . . . نەو، چونکە لە پەیوەندی نێوان هۆو







ئەنجامدا هەمیشە (هۆ- سبب) دەوری کاریگەر دەگێڕێت.

وە هەر ئەو ئەم پەیوەندییە تایبەتییەی نێوان هۆو ئەنجام دیاری دەکات، بەڵام ئەنجام دەورێکی گرنگی هەیە، سەرەڕای ئەوەش پاشکۆیە. تێگەیشتنی ئەمە بایەخێکی گەورەی هەیە، ئەوەش گرنگە کە بزانین چی دابنێین بە هۆ لە پەیوەندییەکی تایبەتی نێوان هۆیەك و ئەنجامێکداو، چی دابنێین بە ئەنجام، هەروەها بۆ زانیاری ئەوەش گرنگە کە ئەم مەسەلەیەش بزانرێت.

ئایا مادە هۆشمەندی دیاری دەکات یان بە پێچەوانەوە؟ ئەمەش دیارە مانای ئەوە نییە بتوانرێت کارتێکردنی ئەنجام لەسەر هۆ پشت گوێ بخرێت.

سەرەڕای ئەوەی لە سەرەوە وتمان کارلێککردن مانایەکی تریشی هەیە کە دەتوانین لەم نموونەیەی خوارەوەدا روونی بکەینەوە:تراکتۆر لە گاسن باشتر زەوی دەکێڵێت و ئەو زەوییەش کە باش کێڵدرابێت بەرهەمی چاکتری دەبێت، فەلاحیش ئەگەر بەرهەمی باشی ببێت خۆراك و ئازوقەی چاکتری دەبێت هەروەها بەم جۆرە. . . لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو زەوییەی بەباشی کێڵدراوە بۆ تراکتۆرەکە دەبێتە ئەنجام، بەڵام دەشبێتە هۆی  زۆر بوونی بەرهەمەکە، ئەمەش خۆی لە جیاتی هۆیەك دەبێت بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی گەل. بەم چەشنە دەبینین کۆمەڵێك پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجام دێتە پێشمان.

جا ئێمە ئەگەر باش بیر لەم کۆمەڵە پەیوەندییەی نێوان هۆو

ئەنجام بکەینەوە، دەبینین لە کۆمەڵێکدا دیاردەی لەگەڵ یەك هاوپەیوەند پێك هاتوون، نابێ بە چەشنێکی جیاوازو دووره پەرێز تەماشای هەر هۆیەك یان ئەنجامێك بکەین، بەڵکو بەپەیوەندییان لەگەڵ ئەو دیاردانەدا کە دروستیان کردوون، یان لێیانەوە دروست بوون، ئا لەو کاتەدا دەبینین کە ئەو شتە خۆی هەر لەیەککاتدا هۆیەو ئەنجامیشە. هۆیە بۆ ئەو دیاردەیەی کە دروستی کردووە بەم چەشنە دەردەکەوێت کە هۆو ئەنجام لێك جودا نین، دژی یەك نین، بەڵکو دوو ئەڵقەن لە یەك زنجیرەی ئاڵۆزی ئەو شت و دیاردانەی کە لەگەڵ یەکدا تێکرا دەلکێن. بەم جۆرە هەروەك ئەنگلس دەڵێت:

لە جیهاندا پێکەوە لکانێکی گشتی هەیەو لەوەدایە کە هۆو ئەنجام بەردەوام جێگا گۆرکێ دەکەن، ئەوەی کەلە شوێن و کاتێکی تایبەتیدا هۆیە لە شوێن و کاتێکی تردا دەبێتە ئەنجام و هەروا بە پێچەوانەشەوە. بیروباوەڕی مارکسیزم – لێنینیزم دەربارەی هۆکاری بایەخێکی گەورەی هەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی زۆر چەشنە پروپوچ.

ئەوانەی باوەڕیان بە پروپووچ هەیە زۆر جار دوو دیاردە دەبەستنەوە بە پەیوەندی نێوان هۆو ئەنجامەوە، لەمەشدا تەنیا لە نیشانەکانی دەرەوە تێ هەڵدەچن، لەسەر بناغەی ئەوەی کە تەنیا لە رووی کاتەوە پێکەوەن، هەر چەندە لە راستیدا هیچ پەیوەندی هۆکاریان لە نێواندا نییە، کاتێك مرۆڤە لە هۆیەکانی راستەقینەی دیاردەیەك تێدەگات و پروپووچ دەخاتە لاوە، تەنیا ئەو کاتە هەموو ترسێکی دەڕوات و پروپووچیش خۆی پێ ناگیرێت، بۆنموونە:







لە کۆندا کاتێك خەڵکی بۆ گەشت و گوزار دەچوونە ئەفریقا لافی ئەوەیان لێ دەدا گوایە لە ((ئاسمان)) باخی بەهەشتی زۆر گەورەیان دیووە هەندێك جاریش باسی دیتنی کەشتی ئاسمانییان دەکرد کە کەشتییەوانیان وەك تارمایی لەسەر بووە، دوای ئەوە هەموو شتەکانیان لەبەرچاو ڕەوییوەتەوە. دەبێ ئەو شتانە چی بووبن؟ پێش ئەوەی هۆیەکەیان بزانرێت زۆر چەشنە درۆو دەلەسە لەم رووەوە بلاّودەکرانەوە، بەلاّم زاناکان لە پاشدا هۆیەکانی ئەم دیاردەیەیان دۆزییەوەو بۆیان دەرکەوت کەلە وولاّتە گەرمەکاندا کە ئاوو هەوای هێمنە خەستی و چڕوپڕی هەوا(کثافة الهواء) زۆرترەو شتێکی وەك ئاوێنەیەکی مەزن لە ئاسماندا پێك دێنن، ئەمەش ئەو شتانە پێچەوانە دەکاتەوە کەلەسەر زەوی و لەناو دەریادا هەن.

وەك باخ و دارستان و کەشتی و شتی وا. . . . . هتد کەواتە ئەو خەڵکە باخی بەهەشت و کەشتی ئاسمانییان نەدیوە، بەڵکو شتەکانی سەر زەوی و ناو دەریایان لەبەر چاو پێچەوانە بوونەتەوەو وا هاتوونە بەر چاو وەك لە ئاسماندابن. بەم چەشنە هەر بە دۆزینەوەی هۆیەکانی ئەم دیاردەیە هەموو ترس و سامەکانیش ڕەوینەوە.

بەم جۆرە دوو واتەی هۆو ئەنجام تێگەیشتین و زانیمان چەند بایەخدارن. بەلاّم دەبێ ئەوەش بخەینە پێش چاو کە هۆیەکان زۆرن و جۆربەجۆرن، هەندێکیان دەبنە هۆی دیاردەی پێویست و هەندێکیشیان دەبنە هۆی دیاردەی ڕێکەوت.

## پێویست و ڕێکەوت

جارێکیان زانای فەرەنسایی ئەنتوان باکریل (١٨٥٢- ١٩٠٨) تۆزێك رادیۆم لە زانای بەناوبانگی فیزیك بییر كوری (١٨٠٩- ١٩٠٦) وەردەگرێت بۆ ئەوەی لە دەرسێكدا پێشانی قوتابییەكانی بدات، رادیۆمەكە لە بۆرییەكی شووشەدا دەخاتە ناو گیرفانی بەروانكەكەیەوە، باكریل دوای چەند رۆژێك تەماشا دەكات لە راستی بۆرییە رادیۆمەكەدا پێستی لەشی وەك شێوەی بۆرییە كە سوور بۆتەوە، ئەم رووداوە رێكەوت بووە هۆیەك بۆ لێكۆڵینەوەی كارتێكردنی تیشكی رادیۆم لەسەر ئەندامی مرۆڤ، جا ئاخۆ ئەگەر ئەو رێكەوتە نەبووایە مرۆڤ هیچی نەدەزانی دەربارەی توانای تێكوپێكدەری رادیۆم و ئەو نەخۆشییەی لە تیشكەكەیەوە دادەكەوێت؟

لەم رووەوە دوو جۆرە بیروباوەڕ هەیە، هەندێك دەڵێن هەموو شتێك لەم دنیایەدا پێویستەو هیچ شتێك نییە بە ڕێكەوت بێت، بەڵام هەندێكی تر هەن بە پێچەوانەوە دەڵێن هەموو شتێك لەم دنیایەدا بە ڕێكەوتە. جائایا كامیان لەسەر هەقن و ڕاست دەڵێن؟

ئەم دوو تاقمە هیچ لایەكیان لەسەر هەق نین و راست نالێن، چونكە هەردوو لایان رێكەوت و پێویست لێك جیا دەكەنەوە، بۆ نموونە باوەڕمان دەربارەی ئەوەی كە رۆژ دوای شەو هەڵدێت و بەیانی







دێت لەسەر چی پێك هاتووە؟ ئەم باوەڕە لە ئەنجامی چاودێری كردندا پەیدابووە، لەسەر تەجرەبەی چەندان سەدە پێك هاتووە، لەسەر زانینی یاسایەكانی سروشت دروست بووە، بەدوای یەكدا هاتنی شەوو رۆژ بە هۆی سووڕانەوەی زەوییەوەیە بە دەوری خۆیدا، هەروەها بەدوای یەكدا هاتنی كاتەكانی ساڵ بەهۆی سووڕانەوەی زەوییەوەیە بە دەوری رۆژدا.

ئەم واتە فەلسەفییە ((پێویست)) بەڵگەی ئەو پەیوەندییە ئاڵوگۆڕە هەمیشەییەی نێوانی دیاردەكانە ((پێویست)) ئەوە نییە كە لەوانە بێ رووبدات یان نا، بەڵكو دەبێ هەر رووبدات، چونكە لە ئەنجامی چەند هۆیەكی بنەڕەتی و قووڵەوە پەیدا بووە، لەبەر ئەوە لە ناوەندی سروشتی ناوخۆیی دیاردەكانەوە هەڵدەدات.

بەڵام ئاخۆ ڕێكەوت هەیە؟ لێرەوە دەتوانین بۆ روونكردنەوەی باسەكەمان چەند نموونەیەك باس بكەین: پیاوێك لە رووداوێكی ئۆتۆمبیلدا بەردەكەوێت و، ڕێكەوتی ناهەموار ژیانی لەبەر دەبڕێت، جا ئاخۆ بۆچی بەم چەشنە دیاردانە دەڵێن ڕێكەوت؟

رووداوی ڕێكەوت لەوانەیە رووبدات و لەوانەشە روو نەدات، جا ئایا ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەوە وەستاوەو هەر دەبێ بە رووداوێكی ئۆتۆمبیل كۆتایی بێت؟بێگومان. . . . . نەو. ناكرێ ئەم چەشنە رووداوانەش بە رووداوی پێویست ناو ببرێت، چونكە ڕێكەوتن و، تەواوی رێبازی ناوخۆیی پەرەسەندنی ئەو دیاردەیە نەبۆتە هۆی ئەوەی روویداوە.

کاتێك وولاتی سۆڤیەت بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا ڕێگای بەرەو ئاسمانی دووربڕیو لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٧ دا یەکەمین مانگی دەستکردنی هەڵدا، هەندێك لە پڕوپاگەندە گێڕانی بۆرژوازی لە ڕۆژئاوا لافی ئەوەیان لێدەدا گوایا ئەمە ئەنجامی سەرکەوتنێکی بە ڕێکەوت و تاقانەیە. جا ئاخۆ ئەمە ڕاستە واتە؟ نەخێر وا نییە، ئەم سەرکەوتنە خۆی لەناو ڕژێمی سۆشیالیستیدا بوو، لەو بایەخە گەورەیەدا کە وولاتی سۆشیالیست، بە پەرەسەندن و پێشخستنی زانیاری و تەکنیك دەدرێت.

هەڵدانی مانگی خۆکرد، بەڵگەیە بۆ پێشکەوتنی تەکنیکی سۆڤێتی و، ئەو دەستکەوتە گەورانەی زانستی سۆڤیەت لە لقەکانی وەك ماتماتیك و فیزیك و کیمیاو میتالگەریدا دەستی خستووە، هەروا بەڵگەی ڕژێمی پێشکەوتوانەی زانیاری فێربووە لە یەکێتی سۆڤیەت، جا ئیتر ئەمە چ جۆرە ڕێکەوتنێکە؟ ((ڕووداوی ڕێکەوت، بۆیە ڕێکەوتە چونکە لە سروشتی ئەو پرۆسیسە تایبەتییەوە نییە کەلە ئارادایە))، بەڵام مانگی خۆکرد ئەنجامی تەواوی مێژووی پەرەسەندنی یەکێتی سۆڤیەتە.

جا بۆ ئەوەی بزانین ئەم دیاردەیە یا ئەو دیاردەیە ڕێکەوتە یان پێویست، دەبێت ئەوە روون بکرێتەوە کە ئایا لەبەر هۆی ناوخۆیی یان دەرەوە روویداوە.

بۆ نموونە ئایا وێرانبوونی باخێکی میوە بە هۆی ڕەشەباوە ڕێکەوتە یان پێویست؟ ڕاستە ڕەشەبا هۆی تایبەتی خۆی هەیە. بەڵام





ئایا دەبوو بە ناچاری ببێتە هۆی وێرانکردنی باخەکە؟ نەخێر، چونکە وەك ئاشکرایە ڕەشەبا بەبێ هۆ ڕوو نادات، بەڵام ئەو هۆیانە بۆ باخەکە هۆی دەرەوەو ڕاگوزارن، لە هەلومەرجی سەرەکی ڕواندنی باخەکەوە هەڵنەقوولاون، لەبەر ئەوە ڕووداوەکە خۆی بەرێکەوت بووە، وێران بوونی باخەکە بە تەواوی مسۆگەر نەبووەو کاری ئەم ڕەشەبایە بەرامبەر بەو باخە ڕێکەوت بووە، هەر چەندە ئەم چەشنە ڕێکەوتە زۆر جار ڕوودەدات.

لەمەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ڕێکەوت و پێویستییەك پێچەوانەی یەکترن، بەڵام ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە هیچ شتێك نەبێت پێکەوە کۆیان بکاتەوە؟ فیزیائیەکان لەم بارەیەوە دەڵێن: ئەوەی پێویستە ناکرێ ڕێکەوت بێت، ئەوەش ڕێکەوتە ناکرێ پێویست بێت، بەڵام ئایائەمە وایە؟ نەخێر. . لە ڕاستیدا زۆر شت هەیە لەژیان و لە ڕاستیدا بوونەتە هاوبەش لە نێوانی ڕێکەوت و پێویستدا. هەردووکیان پەیوەندیان زۆر بەهێزەو مەحاڵە لێك جوێ بکرێنەوە، دەبێ مرۆڤ هەمیشە بتوانێت لە دوای ڕێکەوتەوە پێویست ببینێت، ئەو یاسایە ڕەچاو بکات کە ڕێکەوتی لەسەر پێك دێت.

لەمەی سەرەوەی بۆمان دەردەکەوێت کەلەناو سروشت و کۆمەڵدا ((تەنیا)) دیاردەی پێویست یاخود ((تەنیا)) دیاردەی ڕێکەوت نییە، بەڵکو هەردووکیان لە ڕاستیدا پێکەوەن و تێکچڕژاون، پێویستە هەمیشە لەشێوەی ڕێکەوتدا دەردەکەوێت، بۆ نموونە بە ڕێکەوت نییە کە خورما لە شوێنی گەرمدا دەڕوێت، بەڵام ئەوەی کە هەر دارە





ئەوەندە گەلای هەیەو گەلاکان بەم شێوەیەو گەورەییەن، لەسەر ئەوە وەستاوە کە دیاردەکانی بەڕێکەوت زۆربن، لە باران بارینەوە تا دەگاتە ڕەشەباو شتیوا. لەمەوە بە باشی دەردەکەوێت کەڕێکەوت و پێویست پێکەوە و تێک چرژاون میتافیزیکەکان لەو باوەڕەدان کە دیاردەی پێویست هۆی هەیە، بەلام ڕێکەوت هیچ هۆیەکی نییە!بەلام ئاشکرایە دیاردەیەك بەبێ هۆ نابێت و دیاردەی ڕێکەوتنیش هۆی هەیە.

جا ئایا جیاوازییان چییە؟

هۆیەکان لە دیاردەی پێویستدا وەك شتێکی ناوخۆیی دەردەکەون، بەلام لەدیاردەی ڕێکەوتدا شتێکن لە دەرەوە. بۆ نموونە کەمی خواردەمەنی و ئازووقە بۆ دانیشتوانی وولاتانی دواکەوتوو پەیوەندی بە لاوازی پەرەسەندنی ئابورییەوە هەیە کە لەو وولاتانەدا لە میراتی رابردووی ژێر دەستەیی ئیمپریالیزمە. ئەمەش هۆیەکی ناوخۆیی کەم بوونی ئازووقەیە لەو وولاتانەدا. بەلام لەوانەیە هەندێك جاریش بە هۆی لافاو، بورکان، یاخود گێژەلۆکەو شتی واوە، کە هۆی دەرەوەن، ئازووقە بێتە کەم بوون.

بەم جۆرە لێ تێگەیشتنی ڕێکەوت بە چەشنێکی دیالەکتیکی ئەو ڕاستییە دان پیادەنێت کە هەموو شتێك لە جیهاندا هۆی هەیە و پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوانی ئەو هۆیانەدا کە ڕێکەوتن و، دەتوانرێت نەبن، لەگەڵ ئەو هۆیانەدا کە ڕێکەوتن و، دەتوانرێت نەبن، لەگەڵ ئەوە هۆیانەدا پێویستن و، لە پرۆسیسەکانی ناوخۆیی و پەرەسەندنی دیاردەکانەوە هەڵقولاون. لەبەر ئەوە وانییە وەك







میتافیزیکەکان بیر دەکەنەوە، کە هەر دیاردەیەك هۆکاری ببێت پێویستە بێتە کایەوە.

ماتێریالیزمی دیالەکتیك دان بەوەدا دەنێت کە هەموو شتێك لە دنیادا هۆی هەیە. ڕێکەوتیش بڕیار دەدات کە هەیە. زانیاری بایەخێکی سەرەکی دەدات، بەڕوونکردنەوەی پێویست و یاسای دیاردە پەرەسەندووەکان. چونکە دەبێت ڕێبازی پەرەسەندنیان دەربخات.

زانای سۆڤیەتی بەناوبانگ ئیڤان فلادیمیرو ڤیچ میچورین (١٨٥٥-١٩٣٥) زۆر بە توندی لە دژی ئەو زانایانە خەباتی کرد کە پشت بە ڕێکەوت دەبەستن نەك بە لێکدانەوەی یاساکانی پەرەسەندنی سروشت. زانای ناوبراو گوتویەتی ئێمە ناتوانین چاوەڕوانی خەلات و بەخشینی سروشت بکەین، ئەرکی زانیاری ئەوەیە ئەم خەلات و بەخشیشە لە سروشت بپچڕێت.

هەموو جیۆلۆجیەك دەزانێت کە زاناکان بۆیان نەدەکرا زۆر دۆزینەوە جێبەجێ بکەن ئەگەر هەروا کوێرانەو بێ بەرنامە دەستیان بە پشکنین بکردایە، بۆ پشکنینی سەرکەوتووی جیولۆجی پێویستە لە یاسایەکانی پێکهاتنی توێژاڵی زەوی بکۆڵنەوەو لە هەڵسوڕانی بەکردەوەدا ئەو یاسایانە بکرێنە رابەر، ئەو کاتە پشت نابەستین بە ((ڕێکەوتی باش)) بە مسۆگەری لە دۆزینەوەی سامانە بە نرخەکانی ژێر خاکدا سەردەکەوین.

جا لەبەر ئەوەی دیاردە ڕێکەوتەکان، لەوانەیە رووبدەن و لەوانەشە روو نەدەن، ئاخۆ دەتوانین لێیان بکۆڵینەوە؟ ئەو یاسایانە

کامانەن کە ئەم دیاردەو ڕێکەوتانە سەر شۆڕیان بوون؟ بە مەبەستی وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە لە سەرەتادا ئەم تاقیکردنەوە بچووکە سەرنج دەدەین:

درهەمێك دەهاوێژن. دیارە یان بە خەتا یان بە شێرا دەکەوێتەوە. . . پێشەکی ناتوانین بزانین بەخەتا یان بەشێرا دەکەوێتەوە. . بەلام بۆ نموونە ئەگەر پەنجا هەزار جارێك درهەمەکەمان هەڵدا دەبینین نزیکەی ٢٥٠٠٠ جار بە شێرداو ٢٥٠٠٠ جاریش بە خەتدا دەکەوێتەوە.

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کەلەم بوارەشدا جۆرە یاسایەك هەیە. یاسا ئەو دیاردانەیە کە بە ڕێکەوت ڕوو دەدەن. با نموونەیەکی دیکە سەرنج بدەین، ئایا خێزانێکی تایبەتی کوڕیان دەبێت یان کچ؟ ئەمە لە سەرەتادا وا دێتە پێش چاو کە سەر شۆڕی هیچ چەشنە یاسایەك نییە، لەوانەیە لە هەندێك خێزاندا هەر کوڕ لە دایك ببن و لە هەندێکدا تەنیا کچ، بەلام پاش چاودێری خستنە سەر ژمارەیەکی زۆر لە خێزانەکان یاسایەکی تایبەتی دۆزراوەتەوە: لە دایکبوونی کوڕو کچ بە پێی ئەم نیسبەتەیە:١٠٥ کوڕ بەرامبەر ١٠٠ کچ لە دایك دەبن.

ئەم ڕاستیانە چیمان بۆ دەسەلمێنن؟ ئەمانە ئەوە دەردەخەن کە ڕژێم، و یاسای دیاردە ڕێکەوتەکان لە ژمارەیەکی کەمی تەماشاکردن و چاودێری کردندا دەرناکەون، بەلام کە ژمارەیەکی زۆر ڕاستی سەرنج بدەین بە ئاشکرا دەکەونە بەرچاو. ئەم یاسایانەش ناونراون (یاسایەکانی سەر ژمێرە) واتە یاسایەکاین بەشێکی تەواوی دیاردە







ڕێکەوتەکان.

ئەمەش مانای وایە دەتوانین لە دیاردە ڕێکەوتەکان بکۆڵینەوەو بگەینە دۆزینەوەی یاسای بوونیان. فیزیکی ئەم سەردەمە پاش لێکۆڵینەوەی جوولانەوەی ئەلکترۆنەکان و لە شۆکەکانی ناو ئەتۆم ئەوەی دۆزیوەتەوە کە جوولانەوەی ئەو لە شۆکانەی بەچاو نابینرێت بەپێی یاساکانی سەرژمێر دێن و دەچن.

بەم چەشنە دەڕوانین زانیاری ئەم سەردەمە تەنیا لە دیاردە پێویستەکان ناکۆڵێتەوەو بەس، بەڵکو لە دیاردە ڕێکەوتەکانیش دەکۆڵێتەوە کە ئەمەش لە کاری ڕۆژانەدا بایەخی خۆی هەیە.

زۆر چەشنە ڕێکەوت خێرو خۆشی مرۆڤیان تێدایەو زۆریش مەینەت و بەسەرهات و کوێرەوەری، وەك ڕەشەباو گێژەلۆکەی بیابانەکان، بێ بارانی، لافاو، لەگەڵ زۆر لێقەومانی تری سروشت کرد، بەلام زانیاری هەوڵ دەدات لەسەر بنچینەی لێکۆڵینەوەیە پێویستی یاساکانیان رادەیەکیان بۆ دابنێت. جا چۆن دەتوانرێت رادە بۆ کارو ئەنجامی شتێك دابنرێت کە لەلایەن مرۆڤەوە ناکرێت بێ گومان مەحاڵە هەمیشە بتوانرێت ڕێگەی ڕێکەوت بگیرێت، بەلام دەتوانرێت و پێویستیشە ڕێگە لە ئەنجام و کارە خراپەکانی بگیرێت، بۆ نموونە تا ئێستا نەتوانراوە ئەو ڕێکەوتانە لەناو ببرێن کە کار دەکەنە سەر ئالوگۆڕی ئاوو هەواو دەبنە هۆی وێرانیو تیاچوونی کشتوکاڵ. بەلام کەمکردنەوەی کاریگەری ئەو ڕێکەوتە ناخۆشانە شتێکە لە توانادایە چونکە کاریگەرەکەیان لەسەر ئەو هەلومەرجە وەستاوە کە تێیدا

دەردەکەون، بۆیە پێویستە هەلومەرجێکی وا پێك بهێنرێت کە چەند لە توانادا بێت کارو کاریگەریی ڕێکەوتی خراپ و تێکوپێکدەر کەم بکرێتەوە یان بە تەواوی لەناو ببرێت.

ئەمەش بە تایبەتی بۆ ئابووری کشتوکاڵ زۆر گرنگە، چونکە زۆرتر پشت بە ئاڵوگۆڕی ئاوو هەوا دەبەستێت وەك لەوەی پشت بە پیشەسازی ئەستوور بکات، ئاودێری کێڵگەکان و بەپەین کردنیان و بەکارهێنانی ڕێو شوێنی کشتوکاڵ و شتی وا دەبنە هۆی پاراستنی کشتوکاڵ لە ڕێکەوتی زیان بەخش.

بەم جۆرە دەبینین مرۆڤ دەستەوپاچە نییە لەبەردەم کاریگەریی ڕێکەوتە ناخۆش و زیان بەخشەکاندا و دەتوانێت هێزی تێکدەریان پەك بخات و یاخود بگەیەنێتە کەمترین ڕادە.

هەروا مەسەلەی ئازادی زۆر بە توندی لەگەڵ واتەی (پێویست) هاوپەیوەندەو لێرە بەدواوە دەربارەی(پێویست و ئازادی) شتێك روون دەکەینەوە.








## پێویست و ئازادی

مێژوو سەلماندویەتی کە سەرکەوتنی سۆشیالیزم بەسەر سەرمایەداریدا پێویستییەکی مێژووییە، هەروا لە رۆژگاری ئەمڕۆدا پێکەوە ژیانی بە ئاشتی نێوان هەردوو رژێمی سۆشیالیست و سەرمایەداری پێویستیەکی مێژووییە. جا ئایا شتێك کە خۆی بەپێی پێداویستی سروشت و مێژوویی پەیدابوونی حەتمی بێت رەنج و تەقەلای پێ دەوێت و هەوڵدان هیچ سوودی دەبێت بۆ پەیدابوونی؟ لە بارەی ئەم مەسەلەیەوە بەدرێژایی چەندان سەدە وتوێژو دەمەقاڵێ بووە لە نێوان قەدەرییەکاندا(ئەوانەی باوەڕیان بە قەزاو قەدەر هەیە) و لە نێوان ئیرادەییەکاندا(لایەنگیرانی باوەڕی ئیرادەیی).

ئیرادەییەکان دەڵێن گوایە مرۆڤ دەوری کاریگەری هەیە لە پەرەسەندنی جیهانداو(هەر لەبەر ئەمەش بە ئیرادەییەکان ناو دەبرێن) چونکە گوێ نادەنە هەلومەرجی مەوزوعی و، یاسای مەوزوعی و، پێویستی مێژوویی، لە ئازادیش وا تێدەگەن کە کۆت نەکردنی ئیرادەو خواستی مرۆڤایەتییە، بەلاَم ئەم رایە چەوتە، چونکە هیچ شتێك نیە لە دنیادا بەبێ هیچ هۆیەك دروست بێت و کاری خۆی بکات. لەبەر ئەمە هەروا ئیرادەی مرۆڤیش ناتوانێت پشت بە هیچ شتێك نەبەستێت و خۆی چۆنی دەوێت وا بکات.

بیروڕای (قەدەرییەکان) بە پێچەوانەی ئەمەوەیەو باوەڕیان بە

قەدەر هەیەو لەو باوەڕەدان هەموو شتێك لە جیهاندا پێشەکی بڕیار دراوەو مرۆڤ ناتوانێت هیچ بگۆڕێت(لەبەر ئەمەش ناو نراوە قەدەرییەکان).

به واتای قەدەرییەکان دەبێ مرۆڤ تەمەڵ بێ خۆ، ئەگەر مرۆڤ بەپێی باوەڕی ئەوان بکات، دەبێ دەستەوسات کونجی قەناعەت بگرێ و هیچ نەکات و ئەمەش هەست کردن بە قەزاو قەدەر دێنێتە ناوەوە. بۆیە ئەم جۆرە تیئورییە باوەڕی کۆمەلآنی خەڵکی بەهێزی خۆیان بە توانای گۆرینی رژێمی کۆنەپەرست و چەوسێنەرانە لە ناو دەبات. مرۆڤ ئەگەر سەرنجی ئەم نموونەیەی خوارەوە بدات باش تێ دەگات کە هەڵوێستی قەدەرییەکان لە دیاردەکانی جیهاندا چەند زیان بەخشە. کەسانی وا هەن لە رۆژئاوا دەیانەوێت ئەوە(بسەلمێنن) کە شەڕەکان و پێشبڕکێ لە خۆ چەکدارکردندا شتێکی حەتمی و قەدەرییەو هەروا دەبێ، بەلآم لە ڕاستیدا وانییەو، بە سیاسەتی خەبات لە پێناوی پاراستنی ئاشتیدا کە یەکێتی سۆڤیەت و وولآتانی تری دەوڵەتە تازە سەربەخۆکان لە سەری دەڕۆن، دەتوانرێت رێگەی هەڵگیرسانی شەڕی تازەی جیهانی بگیرێت.

لەبەر ئەمە هەردوو باوەڕی ئیرادەییەکان و قەدەرییەکان هەڵەن و دەیانەوێ بە رێگایەکی میتافیزیکی چاری مەسەلەکە بکەن، تەنیا دان دەنێن بە ئازادیدا یان تەنیا بە پێویستدا. یاخود هەموو شتێك بە هۆی هەڵسوڕانی سەربەستانەی مرۆڤەوە پێك دێت و ئەو کاتەشە پێویست توانای بوونی نابێت. یاخود هەموو شتێك بە فەرمانی





فەلسەفەی مارکسیزم

پێویست دێتە کایەوە. ئەو کاتەش ئازادی بوونی نابێت. بناغەی پێکهاتنی ئەم باوەڕە ئەوەیە گوایە ئازادی لەگەڵ پێویستدا ناگونجێت.

جا کەوابوو چاری راستی مەسەلەکە کامەیە؟ لەژیانی رۆژانەدا، زۆر جار لە وشەی(ئازادی) وا تێدەگەن کە ئەو شتەیە هیچ کۆتێکی لەسەر نییە. بۆیە هەندێ جار وا بیردەکەنەوە کە پێویست و، یاسا، ئازادی دەداتە دواوە، لەبەر ئەوەی پێویست و، یاسا، هەن، ئەوا چەشنە ((کۆتێکیش))و ((تەگەرەش)) هەن! ئەمەش مانای وایە کە ئازادی نابێت. بەم جۆرە چاری گیروگرفتی ئازادی مانای چارکردنی ئەم مەسەلەیە دەگرێتەوە.

ئاخۆ دەشێ مرۆڤ ئازاد بێت، لە کاتێکدا سەر شۆرە بۆ یاسایەکانی پێویستی سروشت؟

با لەم نموونەیەوە دەست پێ بکەین: گەیشتنە ئاسمانی دوور لەسەر دەرچوون لە یاسای ڕاکێشان و وەستاوە کەوا دێتە بەرچاو وەك مرۆڤی بەزەوییەوە ((بەستبێتەوە)). بەلآم ئایا دەتوانرێت ((بەبێ پەیرەوکردنی)) ئەو یاسایەو، بێ گوێ پێدانی، هاتوچۆی ئاسمانی دوور بکرێت؟ نەخێر. . . لە توانادا نییە.

بۆ ئەوەی کەشتی ئاسمانی بگاتە خولگە(المدار) دەبێ بە خێراییەك بەرزبێتەوە کە هێزی نێوەندی پاڵپێوەنەری لە هێزی راکێشانی زەوی گەورەتر بێت (ئەمەش بە خێراییەك کە دەبێت پتر بێت لە هەشت کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا).

زانایان توانیان کەشتی و مانگی دەستکرد رەوانەی ئاسمانی دوور

بکەن. ئەمەش نەك بێ گوێ دانە  یاسایی ڕاکێشانی گشتی، بەڵکو لەسەر بناغەی لێکۆڵینەوەی قووڵی کارتێکردنی ئەو یاسایە.

کاتێك زاناکانی سۆڤیەت ساروخیان بۆ مانگ نارد، گومان لەوەدا نییە پشتیان بەستووە بە یاسای ڕاکێشانی گشتی. ساروخەکە ئەوەندە خێرابوو کە بەو هۆیەوە توانی لە سنووری هێزی ڕاکێشانی زەوی دەربازبێت و دوای ئەوە هێزی ڕاکێشانی مانگ ناچاری کرد لەسەر مانگ بنیشێتەوە. ئەم نموونەیە بە تەواوی هەڵەی ئەوانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە ئەگەر سەر شۆڕی یاسایەکانی پێویست بێت ئازادیمان لە دەست دەچێت و لەبەر ئەوە بێ ڕێگایەك دەگەڕێن تا لەو یاسایانە دەربازبن و خۆ ڕزگار بکەن لەو ((پێویستەی ئازادی کۆتکردووە)) ئەو کەسانە وا لە ئازادی تێ دەگەن کە ڕزگار بوون بێ لە یاسایەکان. ئەمەش ڕاست نییە.

-جا ئایا ئازادی ڕاستەقینە کامەیەو لە کوێدا بە ڕوونی دەردەکەوێت- ئاخۆ ئەوەیە کە هیچ یاسایەك ((نەناسرێت)) یان ئەو یاسایانە بناسرێن و سوودیان لێ وەربگیرێت؟ وەڵام ئاشکرایە: ئازادی ڕاستەقینە لەوەدایە یاسایەکان بناسرێن و سوودیان لێ وەربگیرێت. لینین ئەم باوەڕەی بەم چەشنە دەربڕیوە: پێویست هەتا نەناسرێت هەر کوێرە. بەڵام ئەگەر پێویست ناسرا، ئەگەر یاسا شارەزای بووین و بۆ قازانجی خۆمان بەکارمان هێنا ئەوا دەبینە فەرمانڕەوای سروشت، ئەنگلس لە کتێبی ((ئەنتی دوهرنگ)) دا دەنووسێت: ((ئازادی لەو سەربەخۆییە بە خەیاڵەدا نییە کە لە یاسایەکانی سروشت بێ، بەڵکو







لە زانینی ئەم یاسایانەدایە، لەو توانایەدایە کە لەم زانینەوە دەست دەکەوێت بۆ ئەوەی بەپێی بەرنامەی یاسایەکانی سروشت وا لێ بکەین کە لە پێناوی ئامانجی دیاریکراودا کاربکەن)).

ئەم قسەیە بۆ دیاردەکانی سروشت و ژیانی کۆمەڵایەتیش وەك یەك ڕاست و دروستن لە پێش دەرکەوتنی مارکسیزمدا، یاسایەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی نەناسراوبوون. مرۆڤ هەروا کۆیلەی پێداویستی مێژوویی بوون، بەڵام مارکسیزم ئەو یاسایانەی دەرخست و ناسی. ئەمەش یەکەمین هەنگاو بوو بۆ ئەوەی ڕەنجکێشانی چەکدار بەم جۆرە یاسایانە بە ئازادی چارەنووسی خۆیان پێکەوە بنێن و ژیانیان لەسەر شێوازێکی نوێ و بەپێی پێویستی مێژوویی دروست بکەن.

ئازادی مرۆڤ وا لە ناسینی یاسایەکانی پەرەسەندنی سروشتو کۆمەڵدا، لە بەکارهێنانی شارەزاییانەی ئەم یاسایانەدا لە هەڵسوڕانی بەکردەوەدا، وە ناشگونجێت ئازادی مرۆڤ لە سنووری پێویست تێپەڕ بکات. فەیلەسوفە بۆرژوازیەکانی ئەم زەمانە لەو باوەڕەدان مرۆڤ کاتێك ئازادە کە بتوانێت هەر چەشنە چالاکییەکی دەوێن بۆخۆی هەڵبژێرێت، بەبێ ئەوەی گوێ بداتە هیچ شتێك.

لە ڕاستیدا ئەم چەشنە ئازادییە هەر نییە، ئەمەش بە ئاشکرا لە چیرۆکی ئەو گفتوگۆیەدا ڕوون دەبێتەوە کە لەنێوان پەروانەی هەوایی و میلی موغناتیسی قیبلەنمادا ڕوویداوە.

پەروانەی هەوایی بەخۆ هەڵکێشانێکەوە دەڵێت:

-من ئازادم، بە ئارەزووی خۆم بە هەموو لایەکدا دەسوڕێمەوە، هەر ڕۆژەی بە چەشنێك دێم و دەچم. . بەڵام تۆ هەر جۆرێك هەڵتسوڕێنن هەر بە لایەکدا دەسوڕێیتەوە.

میلی موغناتیسی وەڵامی دەداتەوە:

-ئای لەو چەشنە ئازادییەی تۆ هەتە! تۆ بە ئارەزووی خۆت بەم لاولادا هاتوچۆ ناکەیت. هەوا گەمەت پێ دەکات و دەکەوێتە جووڵە- ئازادییەکەت تەمەنی کورتەو لە هەڵکردنی بایەکەوەیە بۆ بایەکی تر. نزیکترین با هەڵکات کارت تێ دەکات. بەڵام من چاوەڕوانی هەڵکردنی با ناکەم و هەمیشە ئەو ڕێبازەی خۆم دەپارێزم و هەر لەسەر یەك ڕێبازم. بەهۆی ئەم ڕێبازەوە لە هەموو شوێنێك ڕێگای ڕاست پیشان دەدەم. ئەگەر پیاو بە وردی سەرنجی ئەوەی وترا بدات، زەحمەت نییە کە بە باشی ئەوە تێ بگات کە ناگونجێت بەهیچ جۆرێك وا لە ئازادی تێ بگەین کە بریتییە لەوەی مرۆڤ چۆنی دەوێ وا هەڵسوڕێت، بێ ئەوەی گوێ بداتە هیچ شتێك.

هەندێك هەن لە وڵاتە سەرمایەدارەکاندا لەو باوەڕەدان کە گوایە شێوەی بیرکردنەوەی بە ئازادی تەواوی هەڵبژاردووەو، حەزو ئارەزووکردن و ڕەوشت و نەریتی ئەنجامی ((ئازادی شەخسی))ن، بەڵام لە ڕاستیدا خۆی کۆیلەی ئەو هەلومەرجەو ئەو غەریزەو ئارەزووانەیە کە لە ئەنجامی مولکایەتی تایبەتییەوە پەیدا بوون و تەواوی شێوازی ژیان و گۆش و پەروەردەی دەکات. لەمەشدا ((ئازادی شەخسی)) هەر سێبەریشی نییە، بەو چەشنەی زانایانی بۆرژوازی







پاکانەی بۆ دەکەن. لێرەدا هەموو شتێك سەر شۆڕو ڕاوەستاوی پێویستە. ئەم پێویستەش لە زروفی سەرمایەداریدا وەك هێزێکی نابینای کۆمەڵایەتی دەردەکەوێت و دەکرێ لەگەڵ ڕەشەبادا بەراوردی بکەین.

بەڵام ئازادی کە پشت بە زانستی پێویست دەبەستێت لە زروفی سۆشیالیستدا، ئەوە شتێکی ترە، لێرەدا یاسایەکان وەك هێزی نابینای کۆمەڵایەتی کار ناکەن، چونکە هەڵسوڕانی مرۆڤ لەسەر تێگەیشتنێکی قووڵی یاسایەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی پێك هاتووە.

دوژمنانی مارکسیزم لافی ئەوە لێ دەدەن کە گوایە لەبەر ئەوەی مارکسیزم وا تەماشای پەرەسەندنی جیهان دەکات کە ئەنجامی کارتێکردنی یاسای مەوزوعییەو سەربەخۆیە لە خواست و هۆشمەندی مرۆڤ ئیتر بە ناچاری دەگاتەوە باوەڕی (قەدەری)و، ئینکارکردنی هەڵسوڕانی سەربەستانەو کاریگەری مرۆڤ. ئەوان بەو قسەیە دەیانەوێ بڵێن مارکسییەکان وا لە پەرەسەندنی جیهان تێگەیشتوون وەك پرۆسێسێکی قەدەری بێت و پێشەکی بڕیار درابێت. ئەگەر مارکسییەکان لەگەڵ ئەمەشدا، باسی هەڵسوڕانی کاریگەری مرۆڤ بکەن، ئەوا خۆیان لەگەڵ باوەڕەکەیان دەخەنە ناکۆکییەوە.

ڕەخنە لێگرانی مارکسیزم دەڵێن: جا ئەگەر چارەسەرکردنی سۆشیالیستانە کارێکی حەتمی بێت، ئیتر تێکۆشانی لە پێناودا بۆچییە؟ تەنیا پێویستە چاوەڕوانی ئەو چارەسەرکردنە بکرێت، چ پێویستە حزب ڕێك بخرێت و سەرکەوتنی سۆشیالیزم ساز بکرێت؟

رەخنـەلێگرانی ماركسیزم دەڵێن: ئاشكرایە كە هیچ كەسێك حزب دانامەزرێنێت لە پێناوی رۆژگێراندا. . . !!

ماركسیزم- لێنینیزم نە لە دوور نە لە نزیكەوە پەیوەندی هەیە لەگەڵ ئەم چەشنە لێ تێگەیشتنە هیچ و پووچەدا. ماركسیزم بەو مانایە دانی نەناوە بە پێویستی سەركەوتنی سۆشیالیزمدا كە لە خۆراو بە چەشنێكی ئۆتۆماتیكی بێت. مەسەلەكە ئەوەیە كە پێویستی دیاردەكانی سروشت لە بنەرەتەوە جیاوازە لە پێویستی دیاردەكانی كۆمەڵایەتی. پێویست لە پەرەسەندنی كۆمەڵایەتیدا بە جۆرێك دێتە دی كە جیاوازە لە هاتوچۆی رۆژو شەو یان بەهارو هاوین چونكە ئەو چەشنە دیاردانەی سروشت بەبێ بەشداری مرۆڤ روو دەدەن. بەڵام لەناو كۆمەڵدا، هەموو شتێك بەرهەمی كاری دەستی مرۆڤە، بەرهەمی هەڵسوڕانی بەكردەوەو شۆڕشگێڕانەی بەرهەم هێنەرانەیە. بەڵام ئاخۆ ئەمە مانای ئەوە بێ كە پێویستی كۆمەڵایەتیو، یاسایەكانی پەرەسەندنی كۆمەڵایەتی دەستكردی مرۆڤن؟ بێگومان نەو. . . پێویستی كۆمەڵایەتی شتێكی مەوزوعییەو، هەروەك پێویستی لە سروشتدا، بەڵام جیاوازییەكی بنەرەتیان هەیە، هەروەك لەمەوبەر دیمان. لەناو سروشتدا پێویست هیچ لەسەر چالاكی مرۆڤ نەوەستاوە. بەڵام لە ژیانی كۆمەڵایەتیدا چالاكی مرۆڤ لە ریزی ئەو مەرجانەدایە كە هێنانەدی و دەركەوتنی پێویستیان لەسەر وەستاوە، جا ئەگەر مرۆڤ هەوڵ نەدات یان بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجەی دەیەوێت بەردەوام و بێ كۆڵدان و بێ پشوو كۆشش نەكات ئەوا







هەوڵدانەكە هێندە نابێت لەو كاتەدا كە پێویستە ئامانجەكە بێنێتەدی.

بۆ نموونە ئاخۆ دەتوانرێت بە بێ خەباتی گەرمی كۆمەڵانی فراوانی گەل لە دژی شەڕ بەربەستی روودانی بكرێت؟ بێگومان. . . . نەو. . . . جا ئەگەر هێزە ئاشتیخوازەكان سست بن و كار نەكەن ئەوا هێزە رەشەكانی شەڕ دیارە زووتر دەكەونە جم و جوڵ و پێكەوە ژیانی بە ئاشتی دەكەوێتە مەترسییەوە. لەبەر ئەوە بڕیاردانی ئاشتی و یان راكێشانی مرۆڤایەتی بۆ ناو كارەساتی جەنگێكی تازەی جیهانی لەسەر گەلان خۆیان و لەسەر تێكۆشان و هەڵسوڕانیان وەستاوە.

باوەڕبوون بەوەی كە شەر شتێكی قەزاو قەدەرەو شتێكی حەتمییەو هەر دەبێ رووبدات، كارێكە دەبێتە مایەی لاوازكردنی چالاكی گەلان لە خەباتدا لە پێناوی ئاشتیدا دەبێتە هۆی پشت ساردكردنەوەی هێزە ئاشتیخوازەكان بەڵام هەست كردن بەوە كە شەڕ بەرپابوون قەزاوقەدەر نییە و شتێك نییە كە هەر دەبێت رووبدات، بە پێچەوانەوە دەبێتە هۆی یارمەتیدانی بەرین بوونی ریزی ئاشتیخوازان و هاندانی تێكۆشەران بۆ خەبات لە پێناوی ئاشتیدا.

بەم جۆرە پێویستی مێژوویی، هەڵوێستی چالاكانە لە رووداوەكانی جیهان نادات دواوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە، ئەوە دەسەپێنێت كە، ماركسیزم بایەخێكی گەورە دەدات بە هەڵسوڕان و چالاكی كاریگەرو ئازادی مرۆڤ، بەم هەڵسوڕانە دەوترێت هۆی خۆبەخۆیی ((العامل الذاتي)) واتە ئەو هێزانەی پشت بەخۆ

دەبەستن، پشت دەبەستن بە خەڵك و هەڵسوڕانی چالاك و زانست و توانایان دەربارەی ڕێکخستنی کاروبار.

دەورگێڕانی هۆی خۆیی، دەورگێڕانی چالاکی سەربەست و کاریگەری گەل، لە ڕۆژگاری دامەزراندنی سۆشیالیزم و کۆمۆنیزمدا بە چەشنێکی هەست پێکراو پتر دەبێت، بەڵام ئەم چالاکییە کاریگەرەی خەڵك، خۆی لەسەر بناغەی زروفی مەوزوعی دامەزراوەو پێی گەیشتووە.

فەیلەسوف و زانا کۆمەڵایەتییە بۆرژوازییەکان مانای ئازادییان شێواندووە. ئەوان گشت مەسەلەکە دێننەوە سەر گەیشتنە ((ئازادی گیان)) ئەوان دەڵێن:

کۆیلە بەو کۆت و پێوەندکراو، بەڵام ئەگەر بزانیت ئەو ژیانەت ئازاری گیانت نادات، کەواتە سەربەستیت. لافی ئەوەی لێ دەدەن گوایا لەناو کۆمەڵی بۆرژوازیدا هەمووان ئازادن، کەس زۆر لە کرێکار ناکات کە کار بکات و سەرمایەداریش ناچار نییە کاری بداتێ، کرێکار دەتوانێت بچێت بۆ لای سەرمایەدارو، خۆی سەر پشکە دەشتوانێ نەچێت. نەك هەر هێندەو بەس، بەڵکو ئایدیۆلۆژی ئیمپریالیزم ناوێکی تریشی بەسەر وڵاتانی سەرمایەداریدا بڕیوەو ناوی لێ ناون ((جیهانی ئازاد))! بەڵام با بزانین ئەوەی بە جیهانی ئازاد ناوی دەبەن لە ڕاستیدا ئازادە؟

بۆ ئەوەی مرۆڤ ئازاد بێت پێویستە لە هەلومەرجی ژیانی کۆمەڵایەتیشدا خۆی دەسەڵاتداربێت جا ئایا لە کۆمەڵی







سەرمایەداریدا کە لەسەر چەوسانەوەو زۆرداری دامەزراوە ئەمەی لە تواناداییە؟

مێژوو پیشانی داوە کە ئازادی لە کۆمەڵێکدا چەوسانەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤ و زۆرداری نەتەوەیی‌و ئیمپریالیستی تێدا بێت خەوو خەیاڵەو فریودانی گەلە. لە هەر شوێنێك موڵکایەتی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەم هێنان هەبێت کە ئەنجامەکەی چەوسانەوەی مرۆڤە لەلایەن مرۆڤەوە، ئەوا ڕەنجکێشان ئازاد نابن، چونکە لە ڕۆژگارێکی وادا ئازادی گەل لەسەر بنەڕەتێکی مەوزوعی و ڕاستەقینە پێك نەهاتووە، ئەو چەشنە ئازادییە بۆ گەل هیچ بایەخێکی نابێت و تەنیا رووکەش دەبێت، گەل هیچ کەڵکی لێ وەرناگرێت و تەنیا چەوسێنەران ئازاد دەبن.

ئەو ئازادییەی لەسەر بنکەیەکی مادەیی پێك نەهاتبێ، تەنیا ئازادی وەك بیرێك، لە گوڵێك دەچێت بەبێ ڕەگ‌و ڕیشەو بێ خاك. . هەر چەندە جوان‌و قەشەنگ بێت بەخێرایی هەڵدەوەرێت‌و وشك‌و سیس دەبێت، هەروەك لینین فێرمان دەکات، ناکرێت ئازادییەکی ڕاستەقینە بەکردەوە لە کۆمەڵێکدا هەبێت کە لەسەر دەسەڵاتی پارەو پول دامەزرابێت‌و، کۆمەڵانی گەل دووچاری کلۆڵی بووبن‌و، چنگێکیش دەوڵەمەندو خواپێداو لە ژیانی تەمبەڵیداو بەسەر ڕەنجی خەڵکی ترەوە بژین.

ڕەنجکێشان تا خۆیان دەسەڵات نەگرنە دەست‌و کۆمەڵێکی نوێی دوور لە چەوسێنەران‌و زۆرداران دانەمەزرێنن ئازادی سیاسی‌و

کۆمەڵایەتییان دەسگیر نابێت. مرۆڤ هەست بە ئازادی خۆی ناکات تاوەکو بنچینەی مادی هێنانە دی ئامانجو کۆششەکانی نەیەتەدیو تەنیا کۆمەڵی سۆشیالیستە کە ئەو بنچینەیە بۆ خەڵکی کارگەر دابین دەکات، هەر لەبەر ئەمەش بوو ئەنگلس باسی ئەوەی کرد کە سۆشیالیزم بازێکە لە دنیای پێویستەوە بۆ دنیای ئازادی. تەنیا لە هەلومەرجی سۆشیالیستدا، مرۆڤ دەتوانێت ڕێبازی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بخاتە ژێر چاودێری خۆییو بە ئازادی چارەنووسی خۆی هەڵسوڕێنێت.

تەجرەبەی مێژوویی لەمەڕ دامەزراندنی سۆشیالیزم لە یەکێتی سۆڤیەتو، وڵاتانی تری سۆشیالیست ئەو بۆچوونەی ئەنگلس دەسەلمێنێت، لەژێر سێبەری سۆشیالیزمدا مرۆڤ ترسی کار لە دەست چوونو، ترسی دوا ڕۆژو، چەوسانەوەو ئازاردانی نەتەوەیی نییە، ئەمە لە وڵاتانی سۆشیالیستی هاتۆتە دی. بەڵام پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بە ڕێگای ڕزگاربوونیدا لەم سنورەدا ناوەستێت. دامەزراندنی کۆمەڵی شیوعی بەرزترین پلەیە بۆ ڕزگاربوونی مرۆڤ لە هێزە سەربەخۆییەکانی سروشت.

گشت هەلومەرجێکی پێویستیش لە پێناوی کاری داهێنەرانەی سەربەستداو، لە پێناوی پەرەسەندنی هەموو تواناو شارەزاییەکی مرۆڤدا پێك دێت. بەمەش لەدوا کۆسپو ڕێگری بەردەمی مرۆڤایەتی تێپەڕ دەکرێت بۆ چوونە دنیای ئازادی ڕاستەقینەوە.







## ناوەڕۆكو شێوە

هەموو شتومەكو دیاردەیەك خاسیەتێكی چلۆنایەتی تایبەتی هەیەو، سەرانسەری ئەو خاسیەتانە ناوەڕۆکی شتەکە پێك دەهێنن. بۆ نموونە ناوەڕۆکی کتێبێك ئەو ڕووداوو کەسو بیروباوەڕانەی تێدا باس کراون، بەڵام شێوەکەی بریتییە لە زمانی نووسینەکەیو وێنەو شتی وا کە لەلایەن دانەرەکەوە بەکاردەهێنرێن، بۆ ئەوەی بە چاکترین شێوە ناوەڕۆکەکە دەر ببڕێت.

بەم چەشنە دەبینین کە ناوەڕۆك هەر دەبێ شێوەیەك بپۆشێتو بەبێ ئەو شێوەیە کە لەگەڵیدا بگونجێت ناوەڕۆکیش نابێتو بوونی لە توانادا نییە. بەم چەشنە هەموو شتێكو دیاردەیەك، نەك هەر ناوەڕۆك بەڵكو شێوەشی هەیە. شێوە بریتییە لە ڕێکو پێکخستنو، پێکهاتنی ناوەڕۆك کە دەبێتە هۆی بوونی ناوەڕۆك. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە شێوەو ناوەڕۆك یەکیان گرتووە، هەردووکیان لەهەموو شتو مەكودیاردەیەکدا

پێکەوەنو بە توندی یەکیان گرتووە. لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە کایەوە.

ئایا هەر یەکێك لەم دوو واتایە(شێوەو ناوەڕۆك) چ دەورێك دەگێڕن؟ لەم یەکێتییانەدا کامیان ڕێ پیشاندەرو ئاراستەکەرە؟

مرۆڤ دەتوانێ بە ئاسانی تێ بگات کە شێوەی هەر شتێك یان

دیاردەیەك لەسەر ناوەڕۆك وەستاوە: ئەمەش لەم نموونەیەی خوارەوەدا ڕوون دەبێتەوە، شێوەی هەرەوەزی جوتیاران هەر لە خۆڕا نییە بەڵكو ڕادەی پەرەسەندنی بەرهەمی كشتوكاڵی دروستی دەكاتو لەبەر ئەوە پێویستە لەگەڵیدا بگونجێت. بەم پێیە لە چەند وڵاتێكی ڕزگاریخوازدا شێوەی تایبەتی بۆ هاوكاری جوتیاران دروست دەبێت: یەكێتییەكانی هاوكاریو هەرەوەزیو هەرەوەزییەكانی كەلوپەل و هێنانو فرۆشتنو شتی وا. . ئەمەش مانای ئەوەیە كە ناوەڕۆك شێوەی دیاریكراو پێك دێنێت.

وەنەبێ كە لەبەر ئەوەی شێوە سەربە ناوەڕۆكە ئیتر هەر ناوەڕۆكێك تەنیا یەك جۆرە شێوەی تاقانە دروست دەكات. ئەمەش بە ئاشكرا لە هەندێ نموونەی ژیانی كۆمەڵایەتیدا ڕوون دەبێتەوە. چونكە لەو نموونانەدا هەمیشە شێوە لە ناوەڕۆكێكەوە هەڵدەقوڵێت كە بەستراوە بە باری ڕۆژگارێكی مێژووی تایبەتییەوە. بۆیە هەرگیز ناگونجێت كە تاقە یەك شێوەی نەگۆڕی هەبێت.

شۆڕشە نیشتمانییەكانی وڵاتانی ژێر دەستە، كە ناوەڕۆكی وەرچەرخانێكی كۆمەڵایەتین بە زۆر شێوەی جۆربەجۆر پێك دێن. دەگونجێت بە ئاشتی بن یان بەبێ ئاشتی. لە ڕەوتی شۆڕشیشدا لەوانەیە هەندێك شێوەی كۆنی فەرمانڕەوایی بەكاربهێنرێن بۆ ئەوەی خزمەتی گەلیان پێ بكرێتو ناوەڕۆكێكی نوێیان تێدا جێگیر بكرێت.

بەڵام ئەگەر شێوە سەر شۆڕی ناوەڕۆك بێت، ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە شێوە هیچ دەورێكی نەبێت؟نەو. . . بێگومان







ناتوانرێت لە بایەخی شێوە كەم بكرێتەوە. چونكە هەر چەندە سەر بە ناوەڕۆكە، بەڵام كاریگەرانەش كاری تێ دەكات، با كە هەر نەبێ ئەم نموونەیە باس بكەین: مامۆستایەك وانەیەك دەڵێتەوە، پێشەكی زۆر چەشنە زانیاریو ڕاستی لە بارەی بابەتی وانەكەوە كۆ دەكاتەوەو ئاگادار دەبێت، بەڵام شێوەی وانە وتنەوەكەی وشكو ناخۆشو بێ بایەخ دەبێتو بە چەشنێكی لاواز بابەتەكە باس دەكات. جا ئاخۆ ئەم شێوەیە كار دەكاتە سەر ناوەڕۆكەكە؟ بەڵێ، بێگومان ناوەڕۆكەكە بە گران دەگاتە گوێگران. مامۆستایەكی تر هەر ئەو زانیارییە لەو بابەتەدا بە چەشنێكی زیندوو بە باشیو ڕاستو ڕەوان دەخاتە پێش چاوی قوتابییەكان. بێگومان ئەنجامی ئەم جارە زۆر جیاواز دەبێت. گوێگرەكان بە باشی لە وانەكە دەگەن.

بەمجۆرە بۆمان دەردەكەوێت كە نەك تەنیا ناوەڕۆك كار دەكاتە سەر شێوە، بەڵكو بە پێچەوانەشەوە شێوەش كاردەكاتە سەر ناوەڕۆكو، لەوانەیە ئەم كارتێكردنەش دوو لایی بێت، ئەگەر شێوە لەگەڵ ناوەڕۆك بە چاكی جووت بێت ئەوا دەبێتە هۆی پەرەپێدانی ناوەڕۆك، بەڵام ئەگەر لەگەڵ ناوەڕۆك جووت نەبێت دەبێتە كۆسپو ڕێگری پەرەپێدانی. بەڵام شێوەی هەمیشە دەورێكی كاریگەری هەیە، كار دەكاتە سەر ناوەڕۆك، یان یاریدەی پەرەسەندنی دەدات یاخود دەبێتە كۆسپی ڕێگەی پەرەسەندنی.

لەم نموونانەوە ڕوون دەبێتەوە كە ئێمە ناتوانین لە هەڵسوڕانی بە كردەوەدا دەوری كاریگەر بە تەنیا بدەینە پاڵ ناوەڕۆكو شێوە

فەرامۆش بکەین، دەبێ کاریگەری هەردووکیان هەست پێ بکەین. تەنیا ئەوەندە پێویست نییە وانەکە لە ناوەڕۆکدا باشو بەکەڵك بێت، بەڵکو پێویستە وتنەوەکەشی خۆشو ڕوونو باش بێت لە بارەی شێوەوە، ئەمەش مانای وایە کە شێوە یاریدەی ناوەڕۆك دەدات بۆ پێشکەوتنو پەرەسەندن.

بەلام ئایا چۆن دەتواندرێ ئەوە بزاندرێ کە شێوە دەبێتە کۆسپی ڕێگەی ناوەڕۆك؟

ئەمە کارێکی گران نییە ئەگەر ئەوە ڕەچاو بکەین کە هەموو شتێك لە حاڵەتی پەرەسەندندایە، بۆیە هیچ کاتێك ناوەڕۆك لە ڕادەیەکدا ناوەستێت، بەڵکو پەرەدەستێنێت. هەروا شێوەش لە پەرەسەندندایە، بەڵام زۆرتر جێگیرو کەم جووڵەترەو لە ناوەرۆکەکەی دوادەکەوێت، شێوەو ناوەرۆك دوو دژی یەکترن. کاتێك ئەم دژایەتییە پەرەدەسێنێت و دەبێتە ناکۆکی نێوان شێوەو ناوەرۆك ئەوا دەبێ ڕادەیەکی بۆ دابنرێت.

داهێنانی نوێ لە سەرەتادا لە شێوەیەکی کۆنەوە سەر هەڵدەدا، بۆ نموونە، یەکەم ئۆتۆمبیلێك کە دروستکرا هەر وەك عەرەبانە بوو، بەلام ئەو کاتە هات کە شێوەی کۆن بووە کۆسپی ڕێگەی پەرەسەندنی چلۆنایەتی نوێی ئۆتۆمبیل، بووە ڕێگری ناوەرۆکی تازەی. شێوەی کۆنی ئۆتۆمبیلەکەی ڕێگر بوو لە پێش تیژ ڕەویدا تا ئۆتۆمبیلەکە شێوەی وای بۆ دروستکرد کە بتوانێت بە خێرایی بڕوات.

هەروا لە ژیانی کۆمەڵایەتیشماندا ڕووبەڕووی چارکردنی ئەو







ناکۆکییە دەبێتەوە کە لە نێوان شێوەو ناوەڕۆکدا هەیە. بۆ نموونە شێوەی حوکمرانی سەرۆك عەشیرەت و بنەماڵە گەورەکان لە چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆدا کەوتە ناکۆکییەوە لەگەڵ ئەرکەکانی دامەزراندنی ژیانی نوێدا، بۆ ئەمەش پێویست بوو لە جێگەی ئەو شێوەیە شێوەیەکی نوێ بێتە کایەوە، لە جیاتی ئەوە نوێنەرانی حکومەت و حزب و دەستە ناوخۆییە هەڵبژێردراوەکان بێنە کایەوە.

جا ئایا بە کام ڕێگا ناکۆکییەکانی نێوان شێوەو ناوەرۆك چارەسەر دەکرێن؟ ئەم ناکۆکیانە لە زۆر ڕووی ژیاندا بە ڕێگای جۆربەجۆر چارەسەر دەکرێن، بە ئاشتی یان بێ ئاشتی و بە گوێرەی کات و شوێنی دیاریکراو.

لە هەلومەرجی کۆمەڵی سۆشیالیستداو لەو وڵاتانەدا کە ڕێگای پەرەسەندنی نا سەرمایەداریان گرتۆتەبەر، ئەم ناکۆکیانە بە ڕێگای ئاڵوگۆڕی بەرەی شێوە کۆنەکان پێك دێت، ئەمەش بە دەست پێشخەری حزب و دەوڵەت. بێگومان ئەوانەی دەورگێرانی شێوە پتر لە ڕادەی خۆی دەبینن و لە دوای شێوەوە ناوەرۆك نابینن، زیانێکی گەورە لە مەسەلەکە دەدەن، بۆ نموونە وێنەکێشی وا هەن جۆرە وێنەی وا دەکێشن کە هیچ ناوەڕۆکێکی تێدا نییە. هەروا لە خۆڕا پەڵە بۆیە نارێك دادەنێن و تابلۆکەیان ئامادە دەبێت. ئەمە لە هونەردا ئەوپەڕی شێوەگەرییە (الشکلیە) کە پێی دەڵێن هونەری بێ ناوەرۆك ((الفن التجریدی))، بەلام بۆ هونەری ڕاستەقینە پێویستە شێوەی بەرزی هونەری بە تەواوی لەگەڵ ناوەرۆکی قووڵدا جووت بێت.

شێوەگەری تەنیا لە هونەردا دەرناکەوێت و بەس، بەڵکو هەروا لە هەڵوێستدا بەرامبەر بەکارکردن و هەروا لە ئاستی خەڵکیشدا، شێوەگەری لە هەر کوێ بێت شتێکی زیان بەخشە، کەسێکی شێوەگەر نەمرۆڤی گیاندارو پرتەو، نە پێداویستییەکانی ڕەچاو ناکات، پیاوی شێوەگەر لە کاروبارو هەڵسوڕانی ژیاندا هەر بیرۆکراتییە کە هەر مەسەلەیەکی زیندووی بکەوێتە ژێر دەست وشکی دەکاتەوەو گیانی لەبەر دەبڕێت. هەر لەبەر ئەمەشە پێویستە لە دژی شێوەگەری خەبات بکەین.

بەم جۆرە لە بەشەکانی ئەم باسەدا لە یاساو واتە بنچینەییەکانی دیالەکتیکی ماتریالیزم بکۆڵینەوە.

هەرچی پەیوەندی بە ووتەی گەوهەرو دیاردەشەوە هەبێت چاکتر وایە لەسەر ڕۆشنای پەیوەندییان لەگەڵ تیئوری زانستدا لێیان بکۆڵینەوە. جا لێرەدا ئێستا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە: ئایا زانیاری بە کام ڕێگا ئەم پەیوەندی و یاسایانەو گەوهەرمان پێ دەناسێنێ و ڕوونیان دەکاتەوە؟ ئەم مەسەلەیە لەبەشی ئایندەدا باس دەکەین.







# بەشی پێنجەم

## تیئوری زانست لە ماتێریالیزمی دیالەکتیکدا

## گەوهەرو دیاردە

بەپێی زانیاری و هەڵسوڕانی بەکردەوە بۆمان دەرکەوتووە کە هەموو شت وەك و ماتەرێکی ئەم جیهانە دوو لایەنی هەیە، لایەنی ناوخۆیی کە لای ئێمە شاراوەیەو لایەنی دەرەوەی کە هەست پێکردنمان لێی ئاگادارین، هەر کاتێك ئێمە بەهۆی ئەندامەکانی هەست پێکردنەوە شارەزای شت وەك دەبین لە سەرەتادا تەنیا بە هەست کردنمان هەندێك ڕواڵەتی دەرەوەی ئەو شتانە دەرك پێ دەکەین. واتە ئەوەی لە سەرەتادا دێتە پێشمان دنیای دیاردەکانە.

بەڵام زانیاری و هەڵسوڕانی مرۆڤ بە گشتی مەسەلەکە تەنیا لە ڕادەی هەست پێکردن و باسکردنی هەندێك دیاردەو ڕاستی و ڕووداودا ڕاگیر ناکەن، بەڵکو دەیانەوێت یاسای گەوهەری جێگیری دیاردەکان و هۆیەکان و گشت پەیوەندییەکانی ناوخۆییان بدۆزینەوە. یاسایەکانی سروشت و کۆمەڵ ڕاستەوخۆ بە هەست پێکردن نازانرێن و لەگەڵ دیاردەکاندا ناگونجێن.

دۆزینەوەی پەرەسەندنی یاسایانەی پرۆسیسەکان مانای زانینی سروشتی ناوخۆیانە، واتە چوونە ناوەوەو گەیشتنە ئەوەی دیاردە

جۆربەجۆرەکان پێکەوە دەبەستێتەوەو، دەیانکاتە یەك و دۆزینەوەی شتی سەرەکی و بنچینەیی لە ناویاندا.

لە دوای جۆربەجۆریو دیاردەکانەوە، گەوهەر هەیە کە بریتییە لە پەیوەندی ناوخۆیو بناغەو یاسای پەرەسەندنیان. بۆ نموونە لە کۆمەڵی سەرمایەداریدا، هەندێك دیاردە دێنە پێش چاو، وەك تەنگوچەڵەمە، بێکارین هەژاری رەنجکێشان، وێران بوونی باری جووتیاران، مانگرتنەکان و خۆپیشاندان لە دژی زۆرداری مۆنۆپۆلەکان و شتی لەم جۆرە، لە دوای ئەم دیاردانە گەوهەری سەرمایەداری هەیە کە ئەویش بریتییە لەوەی سەرمایەداری ڕژێمی ڕەنج خۆری و چەوسانەوەیە. بەم جۆرە دەبینین گەوهەر دەربڕینی پەیوەندی ناوخۆی جیهانی مەوزوعییەو، بناغەی جۆربەجۆری دیاردەکانەوە، بەلاّم دیاردەکان دیمەنی گەوهەرن، شێوەی دەرەوەی دەرکەوتنی گەوهەرن.

بەم جۆرە دەبینین کە گەوهەر شتێك نییە لە پێش دیاردەکانەوەو بە سەربەخۆیی لەوان هەبێت، گەوهەر دیاردەو لایەنی جۆراوجۆری هەر راستییەك دەردەخەن، گەوهەرو لایەنی ناوەوەو بنچینەیی دەخاتە بەرچاو، بەلاّم دیاردە لایەنی دەرەوەو راستەوخۆ.

نابێ لە یەکێتی گەوهەرو دیاردە وا تێ بگەین کە راستەوخۆ جووت دەبن و وەك یەك دەبن. چونکە ئەگەر وەك هەمووشتێك لەسەر رووی دیاردەکاندا بوونایە، ئەوا دەتوانرا بە جارێك و بە شێوەیەکی راستەوخۆ یاساکانی پەرەسەندنی سروشت و کۆمەڵ







بدۆزرێنەوەو دەربخرێن، بەلاّم شتەکە وانییە: زانینی گەوهەر ئیش و کارو ڕەنجێکی زۆر ئالۆزی زانایەکانی پێ دەوێت وپێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستانە هەیە کە لەسەر بناغەی هەڵسوڕانی بەکردەوە پێك بێت.

بۆ نموونە: وا دێتە پێش چاو کە ڕۆژ بە دەوری زەویدا دەسوڕێتەوەو زەوی وا دێتە بەر چاو کە بێ جووڵەیە بەلاّم ئەمە پێچەوانەی ئەو گەوهەرەیە کە بە زانیاری و تەجرەبە دۆزراوەتەوەو لە ڕاستیدا زەوی بە دەوری ڕۆژدا دەسوڕێتەوە.

لە ژیانی کۆمەلاّیەتیشدا، هێزەکانی کۆنەپەرستی کە بەرەو نەمان دەڕۆن، بەزۆری هەر بە ئارەزوو بە ئەنقەست گەوهەر دەشێوێنن و ئاوەژووی دەکەنەوە.

بۆ نموونە: دەبینین ئیمپریالیستەکان ئامادەن ((یارمەتی)) ئەو ولاّتانە بدەن کە لە کۆتی ئیمپریالیزم رزگاریان بووە بەلاّم لە ژێر پەردەی ولاّتانە کە پەرەسەندنیان لاواز بکەنە کۆیلە بە مەبەستی بوژاندنەوەی ئیمپریالیزم بە چەشنێکی تر، لێرەدا لەرووی ژیری و هۆشمەندییەوە گەوهەری ئیمپریالیزم دەپۆشرێت و گزی تێدا دەکرێت: لە بەرگی ((دۆستی)) گەلاندا دەخرێتە پێش چاو، بە تایبەتی ئەو گەلانەی کە پەرەسەندنیان لاوازە.

ئایدیالیستەکان گەوهەرو دیاردە جوێ دەکەنەوە، باشترین نموونەش لەم بارەیەوە فەلسەفەکەی(ئەمانویل کانت)ە. کانت راستی دابەش کردووە بە دوو دنیای دیاردەکان و گەوهەرەکانەوە. ئەم لەو

باوەڕەدایە کە مەحاڵە بتوانرێت دنیای گەوهەرەکان یاخود وەك ئەو ناوی نابوو ((خودی شتەکان)) بناسرێت. بە پێچەوانەی ئەمەوە ماتێریالیزمی دیالەکتیك ئەوە دەسەلمێنێت کە لە توانادایە گەوهەری شتەکان و، یاسایەکانی پەرەسەندنی جیهان بزانرێت.

زانست هێزێکی یەکجار مەزنە، کەسێك خۆی بە زانست چەکدار بکات بەزینی بۆ نییە، خۆ ئەگەر نەمانزانیایە چی لە دنیادا روو دەدات، توانای ئەوەشمان نەدەبوو تێیدا بژین و کاربکەین. ئەگەر زانست نەبووایە دەستکەوتەکانی بلیمەتی مرۆڤایەتی کارێکی مەحاڵ دەبوو، نەدەتوانرا مانگی دەستکردو ساروخی ناو گەردوون و وزەی ئەتۆم و شتی دیکە بەرهەم بهێنرێت و نەدەتوانرێ هەندێ شتی دیکە بکرێت کە ڕواڵەت یەکجار سادەو ساکار دێنە بەرچاو.

سەرەڕای هەموو ئەمانە کەسانی وا هەن لافی ئەوە لێ دەدەن کە مرۆڤ توانای نییە باری سەرنجێکی راستەقینە دەربارەی جیهان پەیدا بکات و بیناسێت.

پێشینان دەڵێن زانست رووناکییە، بەلاّم دیارە هەموو کەس حەزی بە رووناکی نییە. رووناککردنەوەی جیهان بە ئەقڵی مەزنی مرۆڤ مانای بینینی زۆر شتە لە جیهانداو زانینی زۆر شتە دەربارەی جیهان و توانای ئیشکردنێکی زۆر لە ناویدا.

ئەوانەش کە تاریکی بلاّودەکەنەوەو گەل دەچەوسێننەوە. هەموو تێکڕا بەگشت جۆرێکیانەوە لەمە دەترسێن، چونکە مرۆڤی ڕزگار بوو لە کۆیلایەتی و سیاسی و هەموو جۆرە کۆیلایەتییەك دەبێتە ئاغای







خۆی ولەسەر ڕێنوێنی زانست ژیانی خۆی بنیات دەنێت. بە ڕێکەوتیش نییە کە ئەو گەلانەی کۆتی ئیمپریالیزمیان داماڵییەوەو زۆردارانی فەرەنسایی و ئینگلیزو ئەمریکایی و ئەوانی دیکەیان وەدەرناوە، یەکەوڕاست راپەڕیون بۆ نەهێشتنی نەزانین و نەخوێندەواری  روویان کردۆتە زانست. بەلاّم کەسانی واش هەن کە باوەڕیان بە زانستی ئێمە نییە. جا ئاخۆ ئەو کەسانە کێن؟

هەندێك لە فەیلەسوفە ئایدیالیستەکان لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە توانای ناسینی جیهان نییە. ئەمانە ناونراون نەزانینەکان، لایەنگرانی نەزانین(اللاادریة- ئاگنوستیچیزم) ((١)) لایەنگرانی نەزانین دەڵێن توانای زانین و شارەزابوونی جیهان نییە. فەلسەفەی بۆرژوازی ئەم چەرخەش بە جۆرێکی فراوان ئەم باوەڕە بلاّودەکاتەوە.

با بزانین بەلگەی ئەم نەزانانە بۆ سەلماندنی باوەڕیان چییەو ئایا بنچینەیەکی هەیە؟ ئاشکرایە کە تەنیا بە هۆی ئەندامەکانی هەستکردنەوە نەبێت ناتوانرێت جیهان هەست پێ بکرێتو بناسرێت، وەك بینین، بیستن، دەست لێدان. . هتد. بەلاّم ئەوان دەڵێن ناکرێت پشت بەم هەست پێکردنانە ببەسترێت. چەندان جار ئەندامانی هەست پێکردن هەڵیانخەڵەتاندووین، کەوچکێکی چا لەناو پەرداخێکی پڕ لە ئاودا وا دێتە بەرچاومان وەك شکابێت و یان خواربووبێتەوە، خانوو لە دورەوە بچووك دێتە بەرچاو، بۆیە ناکرێ بەم ئەندامانەی هەست پێکردن باوەڕ بکرێت، ئەمەیە باوەڕو بە ئەنجام گەیشتنی نەزانییەکان، جا ئایا لە راستیدا ئەمە بەو جۆرەیە

کە ئەوان تێی گەیشتوون؟

ئەگەر باوەڕ بە قسەی ئەو نەزانیانە بکەین دەبێ وا بیربکەینەوە کە مرۆڤ توانای هیچی نییە جگە لەوەی کە دەڕوات و بە جۆرێکی دەستەوسان تەماشای شتەکانی دەوروپشتی دەکات، بەلاّم لە گەوهەردا کارەکە بەو چەشنە نییە. مرۆڤ لە جیهاندا تەماشاکەرێك نییەو بەس بەڵکو کاریگەرو دروستکارە. . . لە کارکردندا، لە پەیڕەوکردنی بەکردەوەدا هەرچی لە توانادا پێویست بێت دەست مرۆڤ دەکەوێت بۆ سەلماندن و راستی دەرخستنی ئەوەی ئەندامانی هەست پێکردن بۆمان دەردەخەن و بۆ گەیشتنە گەوهەری شتەکەو رۆچوونە ناو قووڵایی دیاردەکانەوە کە لێیان دەکۆڵینەوە.

لەو نموونەیەدا کە باسمان کرد تەنیا بە دەرهێنانی کەوچکەکە لەناو ئاوەکە بۆمان دەردەکەوێت کە نەشکاوەو خوار نەبۆتەوە. بەم چەشنە دەبینین کە ئەوەی چاری مەسەلەی توانای زانینی جیهان دەکات بریتییە لە پەیڕەو کردن و، هەڵسوڕانی بەکردەوەو، ژیان لەکاتی ئیشکردن و، هەڵسوڕاندا بۆ بەرهەمهێنان مرۆڤ دەرفەتی دەبێت کە بۆ ناو گەوهەرو قووڵایی دنیای دەوروپشت رۆبچێتە خوارەوەو شارەزای بێت و بیناسێت. بەلاّم ئاخۆ خەڵکی چۆن زانست دەربارەی جیهان پەیدا دەکەن؟

لینین لە کتێبەکەیدا ((ماتێریالیزم و باوەڕی رەخنەی بە







تاقیکردنەوە)) [*]، ئەم رێبازەی فەلسەفە بەم چەشنە باس دەکات:

(ناگنوسیس) وشەیەکی لێکدراوی یۆنانییە نا:مانای(نە) دەگەیەنێت. گنۆسیسك: مانای دەرك پێکردن یان زانستە. (نەزانییەکان). دەڵێن نازانین ئەگەر راستییەکی مەوزوعی هەبێت و هەست پێکردنەکانمان دەربخەن و وێنەی بکێشن، ئێمە رای دەگەیەنین کە زانینی ئەمە لە توانادا نییە

---

[*](ڤ. ئی. لینین، دانراوەکان، چاپی رووسی، بەرگی ١٤، لاپەرە ١١٥).

## پلەکانی زانست

گریمان ئێمەیان نارد بۆ لێکۆڵینەوەو فێربوونی کاروباری هەرەوەزی، ئایا لە کوێوە دەست بەم لێکۆڵینەوەیە دەکەین؟ بێگومان لە کۆکردنەوەی هەندێك ڕاستییەوە، ژمارەی ئیشکەرانی هەرەوەزییەکە، چۆنیەتی پەیڕەوکردنی ڕێوشوێنی کشتوکاڵی ئەو بەرهەمە چییە کە چنیویانەتەوە، ڕێکخستنی کاروبار چۆن بووە. . هتد. . دوای ئەم شتانە دەتوانین بگەینە ئەنجامێکی تایبەتی دەربارەی ژیانو کاروباری هەرەوەزییەکە.

لە هەر مەسەلەیەکی تریشدا دەبێ بەم جۆرە بکەین، هەر کەسێك هەوڵی دۆزینەوەو زانینی یاسایەکانی سروشت بدات لە سەرەتادا ڕاستییەکان کۆ دەکاتەوە. ئەمەش یان بەهۆی تاقیکردنەوە، یاخود بە ڕێگای بینین دەبێت و، هەمیشە بەڕێگای ئەندامەکانی هەستکردنەوە پێك دێت. ئەمەش پلەی یەکەمی زانستە- زانستی هەست پێکردن یاخود سەرنجدانی زیندووانە.

کاتێك کۆمەڵێکی تەواو ڕاستی کۆ دەکرێتەوە، بەژیری خۆمان دەست بە لێکۆڵینەوەو بەراوردکردنیان دەکەین لەناو یەکتردا دەگەینە هەندێك ئەنجامی تایبەتی. ئەمەش پلەی دووەمی زانستە: زانستی ئەقڵی، یان مەنتیقی، یاخود بیرکردنەوەی ڕووت. . . بەڵام هەردوو پلەی یەکەم و دووەمی زانست لەسەر بنچینەی هەڵسوڕانی بەکردەوە








پێکدێن. ئێمە لە پەیڕەوکردنەوە، لە هەڵسوڕانی بەکردەوەو، لەژیانەوە، ڕاستییەکان وەردەگرین بۆ شیکردنەوەیان. بە پێچەوانەشەوە ژیان و هەڵسوڕانی بەکردەوەو، پەیڕەوکردنیشی پێویستیان بەو ئەنجامانە هەیە کە ئێمە دەیان گەینێ و لەو ڕاستییانەوە دەستیان دەخەین کە بۆ ئێمە زۆر پێویستن بۆ ئەوەی، بۆ نموونە: کاروباری ئەم هەرەوەزییانە چاك بکەین کە لێیان کۆڵینەوەو تا بەرهەمی کشتوکاڵی زۆرتر بەرهەم بێت.

بەم جۆرە پرۆسیسی زانست لە زانستی هەستپێکردن و زانستی مەنتیقی پێك دێت کە هەردوو لایان لەسەر بنەڕەتی پەیڕەوکردن و هەڵسوڕانی بە کردەوە پێکهاتوون- لینین نووسیویەتی دەڵێت ((لە سەرنجدانی زیندووانەوە بۆ بیرکردنەوەی ڕووت و لەوێشەوە بۆ پەیڕەوکردن، ئەمەیە ڕێگای دیالەکتیکانەی زانینی ڕاستیو، زانینی واقعی مەوزوعی))

سەرنجێکی ئەم ڕووداوە بدەن کە لەمێژووی زانیاریدا ڕوویداوە: جارێکیان نەخۆشێکیان گەیاندە نەخۆشخانە کە هەموو ئەندامە سەرەکییەکانی هەستپێکردنی لەکار کەوتبوو: توانای بینین و بیستن و بۆنکردن و چەشتنی نەمابوو، تەنیا لەسەر پێستی یەك دەستی توانای هەست پێکردنی مابوو، ئەمەش تاقە هۆیەك بوو بۆ وەرگرتنی زانست دەربارەی دنیا، بەڵام دەبێ ئەو زانستەی لەم ڕێگەیەوە پێی گەیشتبێ تا چ ڕادەیەك کەم بووبێت! ئەم نەخۆشە هەموو کاتێك هەروەك بوورابێتەوە وابوو، جا ئایا ئەم ڕووداوە چی دەسەلمێنێت؟

ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئەندامەکانی هەست پێکردن وەك ڕێگا وان بۆ گەیاندنی زانست لەمەڕ جیهانی دەوروپشتمان بە ئەقڵی مرۆڤ، کارتێکردنی دنیای دەرەوە لە سەری بە ڕێگەی ئەندامەکانی هەستکردنەوە بێ ئەوە ناتوانین هیچ شتێك دەربارەی جیهان بزانین.

لە کاتی نەمانی ئەندامێك لەو ئەندامانەی هەستپێکردن مرۆڤ دەتوانێت، ئەگەر چی بە نیوەچڵیش بێت، بە ئەندامەکانی تر جێگای بگرێتەوە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ لە هەموو ئەو ئەندامانە بێبەش بوو ئەوا دەستەوسان دەبێ‌و ناتوانێت لە ڕاستی بکۆڵێتەوەو ناشتوانێت دەربارەی جیهان هیچ شتێك بزانێت. هەست پێکردن ئەنجامی کارتێکردنی شتەکانی جیهانی دەرەوەیە لە ئەندامەکانی هەستمان. هەر لەبەر ئەمەشە کە زانستی ڕاستەقینەی تەواومان دەربارەی جیهانی دەورو پشت دەداتێ.

بەڵام ئاخۆ چۆنی دەسەلمێنین کە هەست پێکردن زانستی ڕاستیمان دەربارەی جیهان دەداتێ؟ ئەوەی ئەمە دەسەلمێنێت پێش هەموو شتێك پەیڕەوکردن‌و زانستی بەکردەوەمانە. خۆ ئەگەر هەست پێکردن و زانستی راستەقینەی نەداینایە ئەوا مرۆڤ لە راستیدا نەی دەتوانی کەڵك لەشتەکانی جیهانی دەرەوەی وەربگرێت. لە حاڵێکی وادا لەوانەیە ئەو شتانەی هەستکردنمان بەسوود بەخشیان دابنێت بۆ لەش زیان بەخش بن بۆی یان بە پێچەوانەوە.

بۆ نموونە، ئەگەر مرۆڤ تەماشای شتێکی کرد، وەك چاوی وێنەی بگرێت وایە، خۆ ئەگەر شتەکە دەبزوتەوە ئەوا لەسەر پەردەی







چاویش وێنەی ئەو شتە بە جووڵاوی دەردەچێت، ئەگەر شتەکە نەدەبزوت ئەوا وێنەی ئەو شتە بە نەجووڵاوی دەردەکەوێت. چاو لەم حاڵەدا ئەوەی لە جیهاندا ڕوودەدات وێنە دەگرێت و پێچەوانەی دەکاتەوە، گشت ئەندامەکانی تری هەستپێکردنیش هەروا دەکەن. دەردەکەوێت کە نەزانییەکانی ((ئاگنوسیچیست)) بە هەڵەدا چوون لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە ئەندامەکانی هەستپێکردن شایەتی باوەڕ پێ نەکراون.

بەڵام ئاخۆ چار چییە لەوەدا کە هیچ گومانی تێدا نییە هەندێك جار ئەندامەکانی هەست پێکردن هەڵماندەخەڵەتێنن؟ لێرەدا مەسەلەکە بەم جۆرەیە: ئەگەر تەنیا بەهۆی هەستکردنەوە جیهانمان بناسیایە، لە ڕاستیدا تەنیا دیوی دەرەوەی شتەکانمان دەزانی‌و، ئەم لایەنەش هەندێك جار هەڵخەڵەتێنەرە. ئێمە لەسەر بناغەی ئەندامەکانی هەست پێکردنمان وای دادەنێیین کە ((ڕۆژ هەڵدێت و ئاوا دەبێت)). بەڵام هەروەك دەزانین ئەمەش هەڵخەڵەتاندنە. هەر لەسەر ئەم بناغەیە وای دادەنێین کە ئاوی ناو پەرداخێك ((وەك فرمێسك پاك و بێ گەردە)). بەڵام لە راستیدا وا نییەو، بە هەزاران گیانداری وردیلەی تێدایە کە پێیان دەوترێت میکرۆب. بەڵام ئێمە بە هۆی بیرکردنەوەوە دەتوانین لەو شتانەی کە ئەندامەکانی هەستپێکردن ئاگادارمان دەکەن سەرنج بدەین و وردبینەوەو بکۆڵینەوە. مرۆڤ بە ڕێگای بیرکردنەوە زۆر دوورتر لە ئەندامەکانی هەستپێکردن دەڕوات ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئەقڵی مرۆڤ، لە

كاتێكدا باوەڕ بە هەست پێكردن دەكات و سوودی لێ وەردەگرێت دەتوانێت قووڵتر لەو هەستپێكردنە ڕۆبچێتە ناوەوەو پتر بزانێت.

ئایا دەورگێڕانی بیركردنەوە لە شارەزابوونی جیهاندا چییە؟

سەرنجی ئەم نموونەیە بدەن، فڕۆكەوانێك بەسەر خاكی یەكێتی سۆڤیەتدا دەفڕێت. هەموو جارێك سەرنج دەدات كە جووڵانەوەی عەقرەبی قیبلەنمانی موگناتیسی لەسەر ناوچەیەك بە جۆرێكی ئاسایی نییەو كاتێك فڕۆكەكە دەگاتە سەر ئەو ناوچەیە لەسەر هێڵی باكوو- باشوور لادەدات- لەسەر ڕۆشنایی ئەم ڕووداوانە زاناكان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی كە لەوانەیە لە ژێر زەوی ئەو ناوچەیەدا ئاسنێكی زۆر هەبێ كە عەقرەبی قیبلەنماكە لاردەكاتەوە، دوای پشكنین ڕاستی دەركەوتو ئاسن لەو ناوچەیەدا دۆزرایەوە.

ئاشكرایە كە ئەگەر بە هۆی ئەندامەكانی هەستپێكردنەوە ئەو ڕاستیانە دەست نەكەوتنایە، كەس نەی دەتوانی بزانێت لەو ناوچەیەدا سامانێكی وا بەنرخ هەیە. جا ئەگەرچی بە هۆی هەستپێكردنەوە گەیشتوونە ئەو ئەنجامە، بەڵام وەنەبێ تەنیا بە هەستپێكردن خۆی ئەوە پێك هاتبێت بە هەستكردن دەتوانرێ ئەوەی دەبینرێتو دەبیسترێت ڕاستەوخۆ بزانرێت. . هتد. . بەڵام زاناكان ئاسنیان نەدیوە، بەڵكو ئەو بەسەرهاتە سەیرەی عەقرەبەكەیان سەرنجداوە، واتە ئەوەی نیشتە سەر ڕووی دیاردەكان، لە كاتێكدا ئاسنەكە لە قوڵای زەویدا شاردراوە.

ئەقڵی مرۆڤ كارێكی گەورەو ئاڵۆزی لەسەر بووە تا بە ئەنجام







گەیشتنێكی پێویست لەم ڕاستیانەوە وەربگرێت. بەو شێوەیە مرۆڤ بەهۆی بیركردنەوەوە دەگاتە ئەنجامێك دەربارەی گەوهەرو، پەیوەندییەكانی ناوخۆ، واتە دەربارەی یاسایەكانی پەرەسەندنی دیاردەكان، جا ئەگەر هەستەكان ڕاستەوخۆ مرۆڤ بەوشتانەوە ببەستنەوە كە هەن، ئەوا بیركردنەوە بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ جیهانی دەرەوە دەردەخات، ئەمەش مانای ئەوەیە كە بە ئەنجام گەیشتنەكانی ئەقڵی لەسەر بناغەی ئەو شتانەی ناڕاستەوخۆ دەست دەكەون، دادەڕێژرێن، بۆ نموونە: بۆ ئەوەی كە بزانرێت ئایا مرۆڤ دەتوانێ بە سواری كەشتییەكی ئاسمانی بەرز بێتەوە بێ ئەوەی ژیانی تیا بێت، لە سەرەتادا بە هۆی ئاژەڵەوە تاقیكردنەوە دەست پێكراوە. ئەوە بوو سەگ دەخرایە ناو ساروخ و كەشتییە ئاسمانییەكانەوە. لەسەر بناغەی تاقیكردنەوەی بەڵگەدار زاناكان

گەیشتنە ئەوەی توانای بەرزبوونەوەی مرۆڤ بۆ ئاسمانی دوور هەیە، ئەمەش دوابەدوای ئەوە بە هۆی پاڵەوانێتی كەشتییەوانە ئاسمانییەكانەوە سەلمێندرا.

بەبێ ڕووداوە ڕاستییەكان هیچ بە ئەنجام گەیشتنێك نابێت. ڕووداوە ڕاستییەكان ئەو هەوایەن كە زانایان هەناسەی تێدادەدەن. ئەم ڕووداوانەش بە هۆی هەست كردنەوە دەزانرێن، بە هۆی ئەندامەكانی هەستپێكردنەوە.

جا ئایا لە ڕووداوە ڕاستییەكانەوە (الوقائع) چۆن ئەنجامەكان دادەڕێژرێن؟

بە ئەنجام گەیشتن بە هۆی پوختەو پاڵفتەکردنەوە لە کاتی بیرکردنەوەدا پێك دێت. ئەم خاسیەتەش لەوەدایە کە بیرکردنەوە لە هەموو شتێکدا نیشانە سەرەکییەکانو، گەوهەریە ڕووتەکان، لە ناو ڕووداوە ڕاستییەکاندا، کۆدەکاتەوەو، بەمەش لێ تێگەیشتنو بیروباوەڕی گشتیو وێنە دروست دەکاتو دەگاتە داڕشتنی هەندێك ئەنجام کە بۆ کۆمەڵێك دیاردە بایەخێکی گەورەیان هەیە.

هەستکردن هەموو شت و ڕووداوێکی ڕاستی کە پێویستن دەداتە ئەقڵ، ئێمەش لە سەر بناغەی ئەوانە بە ئەنجام گەیشتن و پوختەو بالفتە پێك دێنن و، ئەمەش پلەی ئەقڵیی زانستە. بە بێ هەست کردن مێشك، ئەقڵ، ژیری، هیچ کارێکیان نییەو بەبێ کاری مێشکیش زانستی هەست پێکراو نابێت. بەم جۆرە، زانستی بە هەست پێکردن و زانستی بە ئەقڵ دوو قۆناغی یەك پرۆسێسن لە زانستدا کە لێك جیاناکرێنەوەو لەسەر بنچینەی پەیڕەوکردن و هەڵسوڕانی بەکردەوە پێك دێت. ناتوانرێت هیچ کامێکیان لەوی تر جیابکرێتەوە، هەر چەندە لە مێژووی فەلسەفەدا زۆر جار تەقەلای لەم جۆرە دراوە.

هەندێك فەیلەسوف هەن دەڵێن مرۆڤ تەنیا بەهۆی ئەقڵەوە جیهان دەناسن، نەك بە هۆی شتێکی ترەوە، بۆیە ئەم فەیلەسوفانە ناونراون(ئەقڵیاران)، چەند فەیلەسوفی تر هەن کە بە پێچەوانەوە لافی ئەوە لێ دەدەن گوایا جیهان بەهۆی ئەندامەکانی هەست پێکردنەوە دەناسرێت و ئەمانەش ناونراون(هەستیار).

ناتەواوی ئەقڵیاران لەوەدایە کە ئەوەی لەلایەن هەستەوە بدرێت،







یان تاقیکردنەوەی تایبەتی بێت دەیدەنە دواوەو گوێی پێ نادەن. بەڵام لە ڕاستیدا ئەقڵ هیچ زانستێکی تازە نادات ئەگەر دەوڵەمەند نەبێ بە تاقیکردنەوەی تایبەتی و باری سەرنجدان لە شتومەك و دیاردەکان لەسەر بنچینەی زانستی هەست پێکردن کە لە پەیڕەوکردنی بەکردەوەدا دەست دەکەون.

بەڵام ئەو کەسەش بە هەڵەدا چووە کە وەکو هەستیارەکان لافی ئەوە لێ بدات گوایە تەنیا تاقیکردنەوەی تایبەتی و هەستپێکردنی ڕاستەوخۆی واقیع بەهۆی ئەندامەکانی هەستپێکردنەوە دەتوانێت زانستمان دەربارەی جیهانی دەرەوە پێ ببەخشێت.

دواجار. . . . ئێمە لەو بڕوایەداین کە ناتوانرێت دەورگێرانی یەکێك لە پلەکانی زانست پتر لە خۆی گەورەتر بخرێتە روو، دەورگێرانی ئەو پلەیەی تریش داپۆشرێت، لە پرۆسیسی زانستدا، زانستی هەستپێکردن و زانستی ئەقڵی یەك چەشنە بایەخیان هەیە و هیچیان بەبێ ئەوی تریان نابن، لەمەشەوە دەگەینە ئەنجامێکی گرنگ دەربارەی یەکێتی تیئوری و پەیڕەوکردن.

## دەورگێڕانی پەیڕەو کردن لە زانستدا

زانستی هەست پێکردن و زانستی عەقڵی لە مەیدانی پەیڕەوکردن و لەکاتی هەڵسوڕانی بەکردەوەدا تەواو دەبن، ئاخۆ ئەگەر مرۆڤ هیچ کاری نەکردایە نەی دەتوانی هیچیش فێرببێت، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو توانای مانەوەو ژیانیشی نەدەبوو، کاتێك مرۆڤ لە دنیای ئاژەڵ جیابوونەوە، هیچ زانستێکی تیئۆرییان دەربارەی پەرەسەندنی سروشت نەبوو، بەلاّم ڕەنجیان دەدا، بەدوای خۆراکیاندا دەگەڕان و خانوویان دروست دەکردو فێری جل و بەرگ دروون بوون. لەکۆڕی تاقیکردنەوەی ژیانی ڕۆژانەشدا هەموو ئەو شتانە فێربوون کە لە کێشەو ململانێیاندا لەگەڵ سروشت پێویستیان بوون.

ئەمەش بە تاقیکردنەوەی ڕۆژانە دەرکەوتووە. مرۆڤ کە لە دایك دەبێت هیچ شتێك نازانێت، بەرەبەرە کە ڕووبەڕووی دیاردەکانی دەوروپشتی دەبێت و لە کۆڕی پەیڕەوکردن و هەڵسوڕانی ڕۆژانەدا زانست فێر دەبێت کاتێك منداڵی ساوا دەست بۆ ئاگر دەبا نازانێت خاسیەتی ئاگر چۆنە، بەلاّم کە دەستی چزا بە ئاگرەکەدا زووبەزوو بە تاقیکردنەوە دەزانێت ئاگر چۆنەو خۆی لێ دوور دەگرێت و ئاوا زانستێکی تایبەتی فێر دەبێت.

بێگومان ئەمەش مانای وانییە کە جگە لە تاقیکردنەوەی تایبەتی خەڵك خۆی ئیتر هیچ شتێکی تر پەیڕەو ناکرێت، ئاشکرایە کە لە







هەڵسوڕان و ژیانماندا تەنیا سوود لە تاقیکردنەوەی خۆمان وەرناگرین و بەس، بەڵکو هەروا لە تاقیکردنەوەی کەسانی دیکەشەوە، لە تاقیکردنەوەی کۆمەلاّیەتی تەواوی مرۆڤایەتییەوە فێردەبن.

پەیڕەوکردنی کۆمەلاّیەتی بریتییە لە سەرجەمی هەڵسوڕانی مرۆڤ کە لەو ڕێبازەیاندا کار دەکەنە سەر دنیای مادی و دەی گۆڕن، لەمەش مەبەستمان ئەمانەیە:چالاکی بەرهەمهێنان، خەباتی چینایەتی، جوولاّنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی، دامەزراندنی سۆشیالیزم، تاقیکردنەوەی زانیاری. . . هتد. هەموو ئەو زانستانەی وەرگیراون و لەمەولاش وەردەگیرێن لە پەیڕەوکردنی کۆمەلاّیەتی مرۆڤایەتییەوەن. ئەمەش لە مێژووی زانیارییەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێت.

بۆ نموونە چۆن ئەندازیاری پەیدا بوو؟ لە دێر زەمانەوە کە خەڵکی زەویان دەکێلاّو خانوویان دروست دەکرد پێویستیان بە پێوانەیەکی تایبەتی دەبوو بۆ زانینی پانایی‌و شێوەی زەوییەکەیان‌و بۆ ئەمەش بەرەبەرە ڕێگای گشتی پێوانەیان دۆزییەوە کە بەهۆیەوە دەتوانین پێوانەی هەر پارچە زەوییەك بزانن کە لەسەر شێوەیەکی تایبەتی بێت وەك سێ گۆشە، چوارگۆشە. . هتد.

هەموو زانیارییەکی دیکەش هەر بەم جۆرە پەیدا دەبێت‌و پوختەیەك دەبێت بۆ پەیڕەوکردن.

بەم چەشنە زانستی زانیاری‌و تیئۆری لە پەیڕەوکردنەوە پەیدا دەبن کە ئەمیش بنچینەی زانستە.

پەیڕەوکردنو، هەڵسوڕانی بە کردەوە، تەنیا بنچینەی زانست نین، بەڵکو هەروەها هێزی بزوێنەری زانستیشن. بۆ نموونە، ئەگەر ژیان ئەرکی دۆزینەوەی باشترین ڕێگای زەوی چاندن بخاتە پێش، ئەوا ئەم ئەرکەی کە لە پەیڕەوکردنەوە دێتە ناوەوە دەبێتە هاندەرێکی گەورە بۆ پەرەپێدانی زانیاری کشتوکاڵ.

لینین فێرمان دەکات کەباری سەرنجی ژیان، باری سەرنجی پەیڕەوکردن، چالاکی بە کردەوە، ئەمانە دەبێ باری سەرنجی یەکەمین و بنچینەیی تیئۆری زانست بن.

بەڵام ئاخۆ ئەمە لە چالاکی بەرهەم هێنەرانەو شۆڕشگێڕانەدا لە بایەخی تیئۆریو زانیاری کەم ناکاتەوە؟

لە ڕێ لادەرەکانی دوژمنانی مارکسیزم هەوڵی سەلماندنی ئەوە دەدەن گوایا مارکسییە – لێنینیەکان کە باسی بایەخی یەکەمین پەیڕەوکردن دەکەن بۆ زانست، بەوکارە دەورگێڕانی تیئۆری دەدەنە دواوەو نکۆڵی لێ دەکەن. ئەوان مارکسییەکان بە ((گیانێکی زانستانەی تەنگەبەر)) و بە ((پشت گوێ)) خستنی تیئۆری گوناهبار دەکەن. بەڵام ئەمە لە نووکەوە هەڵبەستراوە. حزبە مارکسییە- لێنینییەکان بە گشتی بایەخێکی گەورەیان داوەو ئەدەنە تیئۆری.

لینین فێری کردوین کە تیئۆری ڕێگای پەیڕەوکردن ڕۆشن دەکاتەوە.

هەر لەبەر ئەمەشە کە ((تەنیا)) دان پیانانی بایەخی پەیڕەوکردن، یان ((تەنیا))دانپیانانی تیئۆریی شتێکی سەیرو دوورە







لە ماتێریالیزمی دیالەکتیك.

لە نێوانی تیئۆری و پەیڕەوکردندا ((پراکتیك)) یەکێتییەکی دیالەکتیکانە هەیە و ناتواندرێت لێکجیا بکرێنەوە. تیئۆری لە پەیڕەوکردنەوە پەیدا دەبێت و هەر لەو کاتەشدا خزمەتی دەکات و دەوڵەمەندیشی دەکات، تیئۆری بەبێ پەیڕەو کردن نابێت و هەروەها پەیڕەو کردنی شۆڕشگێڕانەش بەبێ تیئۆری شۆڕشگێڕانە کارێکی مەحاڵە. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بۆ نموونە، لە توانادا نییە کەسێك شارەزاییەکی بەتواناو تیئۆری زانێکی باش بێت ئەگەر دوور لە چالاکی بە کردەوەو بەرهەمدار خوێندنی تەواو کردبێت. بەڵام ئەگەر شارەزایەك لە بەرهەم هێناندا خۆی ماندوو بکات و هەوڵ بدات و لەوێوە تاقیکردنەوەو نەریتی تایبەتی دەستگیر بێت. ئەوا ئەو کاتە زانیاری تیئۆرییانەی ڕەگ و ڕیشەی بەهێزو قووڵ دەبێت و ژیانیش خۆی ئەمەی سەلماندووە.

بەم جۆرە دەگەینە ئەوە کە یەکێتی نێوان تیئۆریو پەیڕەوکردن بە ئەنجام گەیشتنێکی زۆر گرنگەو لە تیئۆری مارکسیانەی زانستەوە پوختە کراوە. خەڵکی بەرەبەرەو لاپەڕە بە لاپەڕە کتێبی سروشت دەخوێننەوەو دەزانن.

بۆ نموونە، ماوەی چەندان چەرخ ئەو دیوەکەی مانگ بە نەزانراوی مایەوە، تا ڕادەیەکی وا کە فەیلەسوفی وا هەبوون بە ئاشکرا دەیانوت مرۆڤ ناتوانێ نهێنیەکانی ئەو دیوەکەی تری مانگ بزانێ. بەڵام پاشان دەرکەوت کە بەم جۆرە نەبوو. سۆڤیەتییەکان

کەشتییەکی ئاسمانی ئۆتۆماتیکییان دروستکرد کە توانی بە دەوری مانگدا بسووڕێتەوەو وێنەی ئەو دیوەکەی تری بگرێت. ئەم سەرکەوتنەی زانیاری بەرپەچدانەوەیەکی تری نەزانییەکانە، جا ئێستا ئیتر کێ لەوەدا باوەڕ بە نەزانیەکان دەکات کە دەڵێن گوایە ((سنوور)) ی زانست هەیە. لە کاتێکدا کە مرۆڤ گەیشتە ئاسمانی دوورو تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر ڕادەی زانستەکانی خۆی دەربارەی گەردوون بەرین کرد.

مرۆڤ لە زانستی سروشتدا چەپەر لە دوای چەپەر دەشکێنێ‌و ڕۆژ بە ڕۆژ زۆرتر دەزانێت و، گەشبینی هەرە گەورەو پرشنگداری فەلسەفەی مارکسیزم- لینینیزم و سروشتە زیندووە چەسپاوەکەی و باوەڕی قووڵ و بەرینی بە عەقڵی مرۆڤیش هەر بەم توانای زانینەوە بەستراوە.

لە هەموو ئەمانەوە دەگەینە ئەم ئەنجامە کە زانستیی مرۆڤایەتی پەرەدەسێنێت و لە زانینەوە بۆ زانین دەچێت، لە زانینی نا تەواوەوە بۆ زانینی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تەواوترە.

ئێمە کە جیهان دەزانین، ئەمە مانای وایە کە ڕاستی دەربارەی دەزانین و خاوەنی زانستیی راستەقینەین.





## ڕاستی چییە؟

لە ژیانی ڕۆژانەماندا ئاشکرایە کە مەبەستمان لە زانستی ڕاستەقینە ئەو زانستەیە خەیاڵ ڕێکی ناخات، بەڵکو بە تەواوی لەگەڵ ئەوەدا دەگونجێت کەلە ژیانی خۆیدا هەیە. ڕاستی شتێکە کە ڕاست و دروست بێت و بە تەواوی پێچەوانەی هەڵەو ناتەواوی و چەوتی بێت. هەر ووشەیەك ئەگەر دەربارەی شتێك بێت کە لە واقیعدا نەبێت و لە ژیانی راستەقینەدا نەبێت و ئەوا درۆو دەلەسەیەکی ئاشکرایە. ئا لەسەر ئەم بناغەیە بە چەشنێکی مادی لە ڕاستی دەگەین.

بەم جۆرە، لەبەر ئەوەی زانستەکانی مرۆڤ تا لەگەڵ واقیعدا نەگونجێت نابێتە ڕاستی، هیچ کات پشت بە حەزو ئارەزووی کەس نابەستێت. گرنگترین بیرێکی مەوزوعێتی ڕاستیش هەر بەمەوە بەستراوەو ئەم باوەڕەش بۆ یەکەمین جار لەلایەن فەلسەفەی مارکسیزم و- لینینیزمەوە هێنرایە ناوەوەو شیکرایەوە.

لینین لە کتێبەکەیدا ((ماتیریالیزم و ڕەخنەی بە تاقیکردنەوە)) باسی کردووە کە ڕاستی مەوزوعی لەسەر خودی مرۆڤ یان مرۆڤایەتی نەوەستاوە. جا ئاخۆ چۆن لەمە تێ دەگەین؟ ئایا راستی بریتی دەبێت لە سروشت، هەر لەبەر ئەوەی کە سروشت خۆی بە چەشنێکی مەوزوعی هەیە، واتە سەربەخۆیە لە مرۆڤ و مرۆڤایەتی؟ بێگومان نەو. . . تێگەیشتنی ڕاستی مەوزوعی بەم شێوەیە هەڵەیە. ئەوەی





کە هەیە نە دەبێتە ڕاستی و نە دەبێتە درۆ. . هەر هەیەو بەس، ئەوەی کە لەوانەیە ڕاستی یان درۆ بێت زانست و بیروڕاو باری سەرنجی ئەو خەڵکەیە دەربارەی ئەو شتانەی کە هەن نەك دەربارەی ڕاستی خۆی.

لێرەدا دوور نیە ئەم پرسیارە بێتە ناوەوە، ئەگەر ڕاستی بریتییە لە زانستەکانی خەڵك، ئەی کەواتە بۆچی وای دەسەلمێنین کە لەسەر مرۆڤ و مرۆڤایەتی نەوەستاون؟ ئاخۆ مرۆڤ بەکارو لێکۆڵینەوەی زانیارییانەی خۆیان ئەم یان ئەو زانستە زانیارییانە پەیدا ناکەن؟ هەندێك کەس هەن بەم جۆرەی خوارەوە دەدوێن و دەڵێن:لەبەر ئەوەی راستی بەبێ مرۆڤ نابێت، هەروا ڕاستی مەوزوعیش نییە، ڕاستی هەمیشە خۆییەو بە مرۆڤەوە بەستراوە، بەڵام بێگومان ئەمە ڕاست نییە.

ڕاستە بەبێ مرۆڤ ڕاستی نابێت، بەڵام ئەوەی ناوەڕۆکی پێك دێنێت لەسەر مرۆڤ نەوەستاوە. وەنەبێ حەزو ئارەزووی خەڵکی ڕاستیی قسەو بیروباوەڕیان دیاری بکات، بەڵکو گەنجان و جووتبوونی ئەو قسەو بیروباوەڕانە لەگەڵ واقیعی مەوزوعیدا، لەگەڵ ئەوەی لە جیهاندا بە سەربەخۆ لە مرۆڤ هەیە راستییەکەی دیاری دەکات. هەر لەبەرئەمەشە لینین دەڵێت ڕاستی مەوزوعی لەسەر مرۆڤ و مرۆڤایەتی، واتە لەسەر حەزو ئارەزووی خەڵکی نەوەستاوە. چونکە مرۆڤ ڕاستی پەیدا ناکات، بەڵکوو بە گونجاوی لەگەڵ ئەوەی لە واقیعی مەوزوعیدا هەیە دەردەبڕێت.







لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوە کارێکی گرنگە لە هەڵسوڕانی کارو کردەوەماندا، لە ژیانی ڕۆژانەماندا پشت ببەستین بە قسەو گفتوگۆیەك کە لەگەڵ واقیعدا بگونجێت. بەڵام ئاخۆ زامنی ڕاستی ئەو زانستانەیان و گونجانی لەگەڵ واقیعدا چییە؟ پێوانەی ((مەقایس)) راستی زانستەکانمان کامەیە؟

هەندێك لە فەیلەسوفەکان لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بیرێك کاتێك دەبێتە راستی کە ئەگەر بە کەڵك و سوود بێت بۆ مرۆڤ. ئەم فەیلەسوفانە خۆیان ناوناوە بەهانەییەکان، لایەنگرانی باوەڕی کردەوەیی و، پراگماتیزم. (پراگماتیزم- ووشەیەکی یۆنانییە- پراگما بەمانای کار، کردەوە). پێوانەی ئەو راستییە ئەمانە باسی لێ دەکەن مەوزوعی نییە بەڵکو زاتییە، چونکە ئاشکرایە کە لەوانەیە هەندێك جار تیئوریەکم یان بیروباوەڕێکی درۆو ناهەموار بۆ کەسێك یان تەنانەت بۆ چینێکی تەواویش زۆر بە کەڵك و سوودبێت.

بۆ نموونە، بیروڕای ناهەمواری ئاشکرای نامەو دەورگێرانی ئیمپریالیز بۆ بڵاوکردنەوەی ((شارستانی)) و ((ئاوەدانکردنەوە))کە زۆر بە سوودە بۆ چەوسێنەرانی گەلی زەحمەتکێش کەچی درۆو ساختەبازیشە.

بەڵام ئاخۆ تیئورییە ڕاستەکان بە کەڵك نین؟ئایا حوکمەکانی ریاچیات و فیزیا خزمەتی ئامانجەکانمان ناکەن؟ هیچ گومان لەوەدا نییە کە بۆ خەڵکی بەسوودن، وەنەبێ ئەم تیئورییانە لەبەر ئەوە ڕاست بن چونکە بەسودن. بەڵکو بەپێچەوانەوە لەبەر ئەوە بەسوودن

چونکە ڕاستن بەچەشنێکی ڕاست و دروست دنیای واقیع دەخەنە ڕوو.

فەیلەسوفی ترهەن دەڵێن ڕاستی ئەوەیە کە هەموو خەڵکی یان زۆربەیان پەسەندی بکەن، ئەوانە ئەم بۆچوونە بە پێوانەی ڕاستی دادەنێن. . . بەلاّم ئەم پێوانەیەش خۆییە، لەوەدا چ جیاوازییەکی ئەو تۆ نییە ئەگەر ڕاستی بەپێی حەزو ئارەزووی هەندێك کەس یان خەڵکێکی زۆر دابنێین، کاتی وا دەبێت نەك تەنیا هەندێك کەس، بەڵکو زۆر کەسیشی تێدا چەواشە دەبن.

جا کەواتە ئەو پێوانەیەی ڕاستی کامەیە کەلەسەر حەزو ئارەزووی خەڵك و لەسەر بیروباوەڕیان نەوەستابێ، ئەو پێوانە مەوزوعییە کامەیە؟ ئەو پێوانەیە پەیڕەوکردنی کۆمەلاّیەتییە.

تاقە ڕێگای ڕاستەقینەی زانینی ڕاستی یان چەوتی بیروڕاو تیئورییەکان و باری سەرنجمان، بریتییە لە هەڵسوڕان و کاروکردەوەی خەڵکی. مارکس لەم ڕووەوە نووسیویەو دەڵێت:لەسەر مرۆڤ پێویستە ڕاستی و بەهێزی بیروباوەڕی خۆی لە پەیرەوکردنداو بەکردەوە بسەلمێنێت.

جا ئەگەر بەپەیڕەوکردن ڕاستی ئەو زانستەمان دەربکەوێت کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی واقیعدا دەستمان کەوتوون،

ئەوا مانای وایە ڕاستییەکی تەواون و جێگای گومان نین. لە ناردنی ساروخی سۆڤیەتدا بۆ مانگ حیسابێکی یەکجار وردکرابوو، تەنانەت دەقیقەو چرکەش حیساب کرابوون، کاتێك ساروخەکە گەیشتە مانگ وبە تەواوی لەو جێگایەو لەو کاتەدا کەوتەوە







کەپێشەکی بۆی دیاری کرابوو، ئەمەش بەشێوەیەکی زانستانە ڕاست و دروستی حیساب و لێ وردبوونەوەی زانایەکانی سۆڤیەتی سەلماند، بەلاّم ئەو تیئورییانەی کە لەبەر تاقیکردنەوەی ژیان و، لەپەیڕەوکردندا خۆیان ناگرن، ئەوا بەپێچەوانەوەن و، درۆو دەلەسەو چەوتن، بۆ نموونە:هیچ کامێك لەو تیئورییانە خۆیان لەبەردەمی ژیان و پەیڕەوکردندا پێ ناگیرێت کە دەیانەوێ بەرقەراریو هەمیشەیی ڕژێمی سەرمایەداری ئیسپات بکەن. لەلای زۆر میللەت پەیڕەوکردن ئەم جۆرە تیئورییانە ڕامالّ کردووەو بەتیئوری درۆو چروك وچەوتی دەرخستوون.

ئایا لەبەرچی بەهۆی پەیڕەوکردنەوە ڕاست ودروستی زانستەکانمان تاقی دەکەینەوە؟بۆ تێگەیشتنی ئەمە دەبێ ئەوەی خوارەوە لەبەر چاو بگرین، ئێمە تەنیا هەر لەبەر شت زانینێکی لەخۆڕایەو بێ سوود خۆمان سەرقاڵی زانین واقیع ناکەین، بیروڕای داهێنەرێك یان زانایەك تەنیا ئەو کاتە بەنرخ دەبێت کە توانای ئەوەی دەبێت لە ژیاندا بهێنرێتەدی، بەلاّم ئاخۆ دەتوانرێت هەموو بیرێك بهێنرێتە دی؟نەو. . . بێگومان. . تەنیا بیرێکی ڕاست و دروست دەهێنرێتەدی. توانای پەیڕەوکردنی بیری درۆزن و چروك وچەوت نییە، چونکە لەگەڵ واقیعدا ناگونجێت. هەر لەبەر ئەمەشە ئێمە بەرێگەی پەیڕەوکردن بە(پراکتیك) زانستەکانمان تاقی دەکەینەوە.

دواجار. . . ئەوەی لەگەڵ واقیعدا دەگونجێت ئەوەیە کە پەیڕەوکردنی بەکردەوە سەلمێندراوەو هەر بەم هۆیەشەوە دەتوانرێت

بەکردەوە بهێنرێتە دی. بۆ نموونە لە کاتی هەڵسەنگاندنی چالاکی بەرهەم هێنەرانەو کردەوەو چالاکی ئابووری و سیاسیماندا، دەبێ تەنیا یەك پێوانە ڕابەرمان بێت: ئەنجامەکانی کردەوەیی ئەم هەڵسوڕان وچالاکییەمان چییە؟ لە حاڵێکی وادا ژیان خۆی باشترین حەکەمە. جا ئەگەر واقیع خۆی هەموو حیساب وپێشبینی و بۆچوونەکانمانی دایە دواوەو بەرپەرچی دایەوە، ئەوا دەبێ ئازابین و بێ دوو دڵی دەست بەرداریان بین، دەبێ زانستەکانمان قووڵ بکەینەوەو جۆرێکیان لێ بکەین کە لەگەڵ تاقیکردنەوەو پەیڕەوکردندا بگونجێن، بەڵام ئەگەر سەرکەشی بکەین و بەکەللە ڕەقی حیساب بۆ ڕووداوی ڕاستیی ژیان نەکەین، ئەوا هەمیشە دەکەوینە بارێکی شلۆقەوە.

بەم جۆرە خەڵکیش هەموو کات پەیڕەوکردن و کردەوەیان کردۆتە پێوانە بۆ ڕاستی بە مەبەستی زانینی نرخی هەموو پەیمان و بەڵێن و قسەیەك، کاروکردەوە باشترین تاقیکردنەوەن.

ئا بەم جۆرە ڕوونمان کردەوە کە پەیڕەوکردنی بەکردەوە پێوانەی ڕاستیەو سەرچاوەی زانست و ئامانجێتی. ئێستاش دەبێ ئەو مەسەلەیە ڕوون بکەینەوە کەچۆن ڕاستیی مەوزوعی دەزانین؟ ئایا بەیەك جار هەمووی، یان بەش بەشی دەی زانین؟ زانیاری بەتێکڕای توانای ئەوەی نییە پرۆسیسی زانست ((کۆتای)) پێ بهێنێت. مێژووی زانیاری شایەتە کە هیچ ڕاستییەکی زانیاری بەیەکجار نەدۆزراوەتەوە، بەڵکو بەرەبەرەو هەنگاو لە دوای هەنگاو بووە، بۆچی؟هەموو کەسێك







بۆ لێکۆڵینەوەی سروشت سوود لەو شتانە وەردەگرێت کە دەتوانێت لەناو کۆمەڵدا دەستیان بکەوێت، کاتێك بووە کەزانایەکان هیچ شتێکیان نەبووە، تەنانەت تەرازوو، یان گەرمی پێویشیان نەبووە چ جای میکرۆسکۆب و تەلەسکۆب. . . هتد. ئەمەش بێگومان توانای ناسینی جیهانی کەم کردۆتەوە، بەڵام ئێستا زانیاری گەلێك ئاپەراتی یەکجار ئاڵۆزو سەرسوڕهێنەری هەیە. جا ئاخۆ هیچ گومانیش لەوەدا هەیە کەلەدوا ڕۆژدا ئاپەرات (جیهاز)ەکان زۆرترو وردو بەتواناو چاکتر دەبن و، مرۆڤیش زۆر لە ئێستا پتر لە سروشت شارەزا دەبێت؟

بەڵام، لەبەر ئەوەی کە هیچ زانستێکی تەواوی نییەو لەبەر ئەوەی هەموویان نیسبین، ئایا ڕاستیی تەواوی هەموو لایی هەیە کە دەوری گشتی شتێکی دابێت

هەندێك لە فەیلەسوفەکان لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێن:ڕاستیی تەواوی‌و تێکڕایی نییە، ئەوەی کە هەیە نیسبییە، لە زانستماندا هەموو شتێك ڕاگوزارە، هەمووشتێك لە ڕۆیشتندایەو هیچ شتێك نییە هەمیشەیی بێت، ئەو فەیلەسوفانە ئاوا دەڵێن و لەبەر ئەوە پێیان دەوترێت نیسبییەکان.

هەندێك فەیلەسوفی تر هەن بەشێوەیەکی تر دێنە گفتارو دەڵێن ئەو ڕاستییانەی کە کۆن دەبن و پێویستیان بە ڕاستکردنەوەو لێکۆڵینەوەی پتر هەیە بۆ هیچ جۆرێك ڕاستی نین. ئێمە تەنیا ڕاستییەك دەناسین کە تەواوو بێ کەم و زیاد بێت. بەم فەیلەسوفانەش دەوترێت دوگماتیەکان. واتە باوەڕ بەستووەکان. لای

ئەمان باوەڕو، حوکمەکانیان ناگۆڕدرێت و تاهەتایەو بۆ یەکجاری دراون.

ئەم فەیلەسوفانە دەڵێن:مەحاڵە گومان لەوە بکرێت کە ئەنجامی لێکدانی٢×٢=٤، ئەم ئەنجامە ئیتر تاهەتایە هەر ٤ دەبێت و، کۆکردنەوەی هەرسێ گۆشەکەی سێ گۆشە هەمیشە دەکاتە دوو گۆشەی ((ئائمە))و، پاریس لەفەرەنسادایە، ئەمانە راستی هەمیشەیین و، کۆتایین، واتە راستی تەواون.

جا، ئاخۆ ئەم چەشنە راستیانە هەن، بەڵێ وایە. . . ئەم جۆرە راستییانە هەن. بەڵام لەو زانیارییانەدا کە بە تایبەتی دەربارەی سروشتی بێ گیانن، بۆ نموونە لەریاچیات و زانیاری ئەستێرەناسی و میکانیکدا، لە راستیدا دەتوانرێت لەم زانیارییانەدا ئەم جۆرە راستیانە رەچاو بکرێن، وەکو٢×٢=٤، تەنانەت لەم زانیارییانەشدا کەپێیان دەوترێت زانیاری وردەکاری هەموو حوکمەکان هەمیشەیی نین و بەو جۆرە نین کە باوەڕکەران بیری لێدەکەنەوە. لە زانیاری فەلەك و فیزیك و کیمیادا کەبە سەدان پێشبینی هەن کە پەرەسەندنی ئایندەی زانیاری بەرپەرچیان دەداتەوە.

بەلاَم تۆ بلێی ڕاستیی ئەو زانیاریانەی هەمیشەیی ئاوەها نەبێت کەلەدوا ڕۆژیشدا بەدرۆ نەخرێتەوە!ماتێریالیزمی دیالەکتیك دان بە بوونی ئەم چەشنە راستیەدا دەنێت، بەلاَم بۆ تێگەیشتنی ئەمە دەبێ پێش هەموو شتێك ئەوە بیربخەینەوە کە لینین باسی کردووەو دەڵێت، راستیی خۆی پرۆسیسە. ناکرێت وا لە راستی تێبگەین کە هەموو







سروشت تەواو دەکات و گشت شتێك دەگرێتەوە. پرۆسیسی هەست پێکردنی راستی تەواو کارێکی سەرپێیی‌و بەپەلە نییە، بەڵکو رێگایەکە بۆ زانست کە زۆر ئاڵۆزو، مێژوویی، بێ کۆتاییە. مرۆڤایەتی هەرگیز ناتوانێت ئەم رێگایە ببڕێت و بە تەواوی بگاتە کۆتایی.

لە ڕێگەی کۆکردنەوەی ڕاستییە نیسبییەکانەوە پرۆسیسی هەست پێکردنی ڕاستییە تەواوەکان پێك دێت. پەرەسەندنی زانست لەوەدایە کە ئەم راستیە نیسبییانە بەرەبەرە کۆدەبنەوەو مرۆڤ لە زانینی هەموو سروشت و دیاردەو یاسایەکانی نزیك دەکەنەوە. هەر وەك چۆن هەموو شتێك لە گشت بەشەکانی پێك دێت، هەروا ڕاستیی تەواویش لە ڕاستییە نیسبییەکان پێك دێت ئەمەش لە پرۆسیسی پەرەسەندنی زانستدا کۆتایی نییە.

ئەم چەشنە تێگەیشتنەی ڕاستیی تەواو بەوەی کە بریتییە لە کۆمەڵێك ڕاستیی نیسبی لە پرۆسیسی پەرەسەندندا- لە دژی ئەوە ئاڕاستەیە کە بە چەشنێکی میتافیزیك. ڕاستیی تەواو لە نیسبی جوێ بکرێتەوە. ئێمە لەوەدا کە لە زانستماندا ڕاستییە نیسبیەکان دەزانیین، هەر لەو کاتەشدا لەمەوە بەشێکی نرخداری راستیی تەواومان دەستگیر دەبێت.

کە هەرنەبێ با ئەم نموونەیە بکەینە بەڵگە: دوو هەزار ساڵ پتر لەمەوبەر واگومان دەبرا کە هەموو لەشەکان لە لەشی وردیلەی تر پێك هاتوون کە دابەش نابن و پێیان دەوترێت گەردیلە- ئەتۆم. ئێستا زانیاری ئەوەی سەلماندووە کە ڕاستە لەشەکان لە ئەتۆم پێك دێن

بەلام ئەتۆمیش دابەش دەبێت، ئەمەش مانای وایە کە گومان بردنەکەی پێشینیان راستییەکی نیسبی بوو. بەلام ئەو ڕاستییە هەندێك ڕاستیی تەواویشی تێدابوو کە ئەوەیە ئەتۆمەکان هەن بەلام ئەم ئەتۆمانە لە گەردیلەی بچوکتر پێکهاتوون، ئەمەش وانییە کە لەم رووەوە زانیاری هەموو توانایەکی خۆی بەخت کردووەو تەواوە. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە جۆرێکی قوولتر لەشێوەی پێکهاتنی ئەتۆم دەکۆڵنەوەو هەر دەبێ تیئۆری ئەتۆم پەرەبسێنێت.

لەمەوە دەبینین لە هەموو ڕاستییەکی نیسبیدا چەند بەشێك ڕاستی تەواو هەیە.

بەمجۆرە بەرەبەرە بەهۆی زانینی راستییە نیسبییەکانەوە دەتوانین ڕاستیی تەواو بزانین. هەموو ڕاستییە نیسبییەکانیش، لە پەرەسەندنی خۆیاندا، زانستێکی تەواوی قوولّ و بەرینمان دەربارەی هەموو سروشت یان لایەنێکی (واقعی مەوزوعی)دەدەنێ

ماتێریالیزمی دیالەکتیك فێرمان دەکات کە ڕاستیی هەمیشە هەست پێکراوە. ڕاستی هەست پێکراو ئەو ڕاستییەیە کە بە جۆرێکی ڕاست ناوەڕۆکی دیارە تایبەتییەکان و. ڕۆژگاری پەرەسەندنیان دەخاتە روو. بەپێچەوانەی ئەمەوە، ڕاستیی رووت، باری هەست پێکراووی ئەو ڕۆژگارە لەبەرچاو ناگرێت کە دیاردەکانی تێدا پەرەدەستێنن. باوەڕ بەستەکان ئابەم جۆرە دەگەن، بۆ نموونە:ناکرێت بە چەشنێکی لێکپچراو وەلامی ئەم پرسیارە بدرێتەوە، دەبێ خەبات لە پێناوی ئاسایش و دیموکراتیدا کام لەم ڕێگایانە بگرێتە







بەر؟بێگومان ناتوانرێت وەلامێکی راستی ئەم جۆرە پرسیارە بدرێتەوە، ئەگەر رۆژگارو باری هەست پێکراوی ئەم خەبات کردنەی تێدا پیشان نەدرێن. پێویستە هەلومەرجی ئەم وولاتانە وەبەرچاو بگیرێت کە لە کۆتی ئیمپریالیزم رزگاریان بووە، چونکە باری ئەم ولاتانە لەبارو هەلومەرجی ئەو وولاتانە جیاوازە کە هێشتا لە پێناوی رزگاربوونیاندا خەبات دەکەن. . . . هتد.

لەبەر ئەمە، مارکسیزمی داهێنەرانە هەمیشە وا پێویست دەکات کە هەلومەرجی هەست پێکراوو باری مێژوویی هەلسوڕان و چالاکیمان سەرنج بدرێت و بخرێتە بەرچاو، ناوەڕۆکی هەلوێستی مێژوویی هەست پێکراو لەبەرامبەر دیاردەکانی واقعیدا ئالێرەدا ئەمانە بوون پێداویستیەکانی زانست لە ماتێریالیزمی دیالەکتیکدا.

# كۆتایی

لـەم سـەدە مێژووییـەی ئێـستادا، كـە سـەدەی گواسـتنەوەیە لـە سـەرمایەدارییەوە بـۆ سۆشـیالیزم. تاڕادەیـەكی یـەكجار بـەتین گـەلانی دنیا ڕوویان كردۆتە باوەڕی ماركسیزم-لینینیزم. دنیا بینی ماركسیزم-لینینیزم هەمیشە بە چەشنێكی بـەهێزتر دەبێتـە بیروبـاوەڕو ئـاواتی مرۆڤایەتی پێشكەوتوو.

ئێستا بلاّوبوونـەوەی فەلسەفەی ماركسیزم-لینینیـزم لەناوەنـدی زۆرانبازییـەكی تونـدو سـەختدایە لـە دژی فەلـسەفەی هاوچـەرخی بۆرژوازی.

فەلسەفەی ماركسیزم ئەوە دەسەلمێنێت كە دارمـانی ڕژێمـی كـۆن و گـەنیوی ئیمپریـالیزم شـتێكی حەتمییـەو، ڕژێمـی كۆمەلاّیـەتی نـوێ لەجیهاندا سەردەكەوێت.

هەر لە بەر ئەمەشە هەموو قوتابخانـەو ڕێبـازانی نـاو فەلـسەفەی بۆرژوازی ئەم چەرخەمان لەیەك بەرەدا راست بوونەتەوە بۆ بـەرگری كـردن لـە رژێمــە كۆنــەكان و هاتوونــە كــۆڕی جەنگــەوە لــە دژی بیروباوەڕی پێشكەوتنخوازانەی نوێخوازی.

فەلسەفەی ماركسیزم-لینینیزم بە قـووڵی ڕەگـی خـۆی لـە ژیـان و لـە واقیـع و پەیڕەوكردنـدا داكوتـاوەو، قیبلەنومایـەكی بـێ هەڵـەو، خاوەنی تەجروبەو ڕابەرە لە ژیانی رۆژانەو لە هەڵسوڕانی ڕۆژانەدا.







ئــەمڕۆ زۆر لــە گەلــەكانی جیهــان كۆمــەڵی سۆشیالیــستی دادەمـەزرێنن و ئەمـەش كـاری داهێنەرانـەو ڕەنجـی ڕاسـتەقینەی پـێ دەوێـت. ئـەو گەلانـە بـە تـەنیا سـەركەوتنی مـەزنیان لەرێگـەدا نییـە، بەڵكو گیروگرفتی پێگەیشتن و بەخۆداهاتنی رۆژانەشیان لەرێگەیە. ئا لەم ڕۆژگارەدا زانستی قووڵ و راستەقینە پێویستە و ئەمـەش زانیـاری ئەمڕۆ مسۆگەر دەكات. تەنیا ئەمەندەش بۆ سەربەسـتی دامەزرانـدنی كۆمــەڵی پرشــنگداری كۆمــۆنیزم بــەس نییــە، چــونكە كاروبــارو دەســتكەوتە مەزنــەكان پێویــستیان بــە مــەزنترین وزەو توانــای سەرانسەری میللەتە. دیارە بـەبێ بـاوەڕبوونی تـەواوی بـە عەدالـەت و ڕەوایی نـەریت و باوەڕە مەزنەكانی سۆسیالیزم ئەوكاروبارە مەزنانەش كە لە ڕەوتی دامەزراندنی سۆشیالیزمدا پێك دێن لە تواناداا نابن. ئـەم باوەڕە ناوخۆییەش، ئەم ئاڵوگۆڕی دیوی ناوەوەی دڵ و دەروونی مـرۆڤ و ئامادەبوون بۆ بەختكردنی گشت توانایەك بۆ خێرو خۆشیی گـەل و سۆشـیالیزم، بـەرێگای فەلـسەفەی ماركـسیزم-لینینیـزم-ماتێریـالیزمی-دیالەكتیك پەروەردە دەكرێت.

ماتێریــالیزمی دیالــەكتیك یــانی دنیــابینی زانیارانــە، بــاوەری چەسپاو بەسەركەوتنی حەتمی سۆشیالیزم لە گشت جیهاندا پـەروەردە دەكـات. ئـەم باوەڕبوونـەش كەمتەرخـەمیو سـەلبی نییـە، بـەڵكو لـە زانــینی قــووڵی یاســا گــشتییەكانی پەرەســەندنی كۆمەڵایەتییــەوە هەڵـدەقوڵێت، كـە ماركـسیزم-لێنینیـزم دۆزیونیەتـەوە. لـە ئـەنجامی یاساكانی مێژوودا كە هێـز نییـە ڕێگایـان لـێ بگرێـت، ئـەمڕۆ دەبیـنین

ژیانی نوێی گەلانی وڵاتە سۆشیالیستەکان جێگای سەرمایەداری گرتۆتەوە کە بەرەو ئاوابوونو لە ناوچون دەچێتو، هەروا ئەو وڵاتانەش کە لە دەسەڵاتی سیاسیو ئابووریو ئایدۆلۆژی ئیمپریالیزم ڕزگاریان بووە، دەستیان داوەتە دامەزراندن و پێکەوەنانی ژیانی نوێ.





# فەلسەفەی مارکسیزم

## کورتە باسێکی ماتێریالیزمی مێژوویی

نووسینی: پودوسیتنیك و سبیزکین







## پێشەکی

ڕەوتی بەردەوامی مێژوویی کۆمەڵ ڕووخساری ئەم دنیایەی گۆڕیوە:بەشێکی زۆری مرۆڤایەتی ئێستا لە سایەی کۆمەڵی سۆسیالیستیدا دەژی. گەلێك ئیمپراتۆریی کۆلۆنیالی کە لەوەوبەر بەهێز بوون کەوتن و داڕمان. هەندێك رژێم کە بە درێژایی چەندان چەرخ بەرقەرار بوون تێکوپێك چوون. زۆر دەوڵەت لەسەر رووی زەوی نەمان و دەیان دەوڵەتی تازەش پەیدابوون. لە رەوتی ژیانی کۆمەلأیەتیدا چەندان بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازو کۆنەپەرست، پێشڕەو و دواکەوتوو، راست و چەوت سەرهەڵدەدەن و دەکەونە کێشە و زۆران، زۆرێکی لە ژمارە نەهاتووی ئامانج و بەرژەوەندیی کەسایەتی و چینایەتی، نەتەوەیی و نێو دەوڵەتی پێکدا هەڵدەپڕژێن. دەریای حەزو ئارەزووی مرۆڤایەتی بەرزو بێ فەڕو نزم، چاك و خراپ شەپۆل دەدەن، لافاوی هەست و سۆزە ناکۆکیەکانی خۆشەویستی و، کینە، چاکەو خراپە لرفەی دێ.

جا ئاخۆ لەم بەدوای یەکدا هاتنەی ڕووداوە لێك جیاوازەکاندا دەتواندرێ، ڕژێمێك یان ڕێبازێك بدۆزێتەوە؟ ژیانی مرۆڤایەتی لە چەندان سەدەداو زانستیش سەلماندوویانە کە لە ژیانی کۆمەلأیەتیدا، یاسای مەوزوعی هەن، سەربەخۆ لە هەست و خواستی خەڵك کاری خۆیان دەکەن و دیاردە کۆمەلأیەتییەکانیش ملکەچی ئەو یاسایانەن.

مرۆڤیش دەتوانێ یاسایەکانی پەرەسەندنی کۆمەلأیەتی بناسێ و

بزانێ و بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاریان بهێنێ، وەڵامی ئەم پرسیارەمان:کۆمەڵی مرۆڤایەتی چییەو، یاسایەکانی پەرەسەندنی کامانەن و چۆن دەناسرێن و چۆن لە هەڵسوڕان و کاروباری خەڵکیدا بەکار دەهێنرێن، وەڵامی ئەم پرسیارەمان لەلایەن ئەو بەشەی فەلسەفەی مارکسیزم-لینینیزمەوە دەدرێتەوە کە پێی دەگوترێ ماتێریالیزمی مێژوویی.

هەروەك چۆن لقە جۆربەجۆرەکانی زانستەکانی سروشت، لە سروشت و کەرەستە جۆربەجۆرەکانیو لە رووداو و پەیوەندییەکانی دەکۆڵنەوە، زۆر چەشنە زانستی کۆمەڵایەتیش هەن کە لە کۆمەڵی مرۆڤایەتی دەکۆڵنەوە، وەك:ئابووری سیاسی، زانستیی مافەکان، مێژووی، زانستی رەگەزناسی(ئەتنۆگرافیا) زانستیی زمان، گەلێکی تر.

هەر زانستێکی کۆمەڵایەتی بە تەنیا لەلایەنێکی ژیانی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە، جا هەر چەندە زانستە کۆمەڵایەتییەکان بە گشتی هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی باس دەکەن، بەڵام هەروا بە کۆکردنەوەیەکی سادەی ئەم زانستانە دیمەنێکی تەواوی کۆمەڵ و یان کارلێکردنی گشتی لایەنەکانیمان دەست ناکەوێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە لەپاڵ کارکردنی یاسایە تایبەتییەکانی پەرەسەندنی ئابووری و سیاسەت و زمان و شتی وادا چەندان یاسای گشتی و بەرین هەن لەپەرەسەندنی گشت کۆمەڵدا کاردەکەن. هیچ چەشنە زانستێکی کۆمەڵایەتیش بەتەنیا لەمانە ناکۆڵێتەوە، بەبێ زانینی ئەم یاسا گشتییانەی کە هەموو لایەنێکی ژیانی کۆمەڵایەتییان پێکەوە





بەستۆتەوە، ناتوانین لەو پەیوەندییانە تێبگەین کە لە نێوان لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵدا هەن و شوێنی ئەم یان ئەو دیاردەیە لەناو رژێمی ئەم بەیەکبوونەدا بزانین.

لەناو کۆمەڵدا دیاردەی مادەیی و فیکری و قەوارەی کۆمەڵایەتی و هۆشمەندیی کۆمەڵایەتی هەن، ئەمانیش پەیوەندییان پێکەوە هەیە و لێکۆڵینەوەیان رۆڵێکی گرنگی هەیە بۆ روونکردنەوەی هێزە بزوێنەرەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی. وێڕای ئەمەش تاقە یەك زانستی کۆمەڵایەتی نییە بایەخ بە لێکۆڵینەوەی تایبەتی پەیوەندیی نێوان هۆشمەندی کۆمەڵایەتی و قەوارەی کۆمەڵایەتی بدات، بەبێ چاری ڕاستەقینەی مەسەلەی پەیوەندیی هۆشمەندیی کۆمەڵایەتی لەگەڵ قەوارەی کۆمەڵایەتیدا ناتوانرێ رێوشوێنێکی زانستی بۆ زانینی هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بدۆزێتەوە، ناشتوانرێ رێگای ئاڵوگۆڕێکی شۆڕشخوازانەی ژیانی کۆمەڵایەتی بۆ قازانجی گەل بدۆزێتەوە. لەبەر ئەمە دەبێ تیئورێکی گشتی و رێوشوێنێك بۆ زانینی دیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی هەبن، ئەم تیئوریی و رێوشوێنەش هەن و پێیان دەگوترێ ماتێریالیزمی مێژوویی، جائەمە زانستێکە؟ ماتێریالیزمی مێژوویی زانستێکی فەلسەفەیە دەربارەی یاسایە گشتی و بەرینەکان و هێزە بزوێنەرەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵ، تیئورییەکی گشتییەو رێوشوێنێکە بۆ گۆڕینی کۆمەڵ و ناسینی بە چەشنێکی زانستی.

ماتێریالیزمی مێژوویی لەلایەن مارکس و ئەنگلسەوە داهێنراوەو





ئەمانە ماتێریالیزمی مێژوووییان لەو پەیوەندییە بەهێزەدا دیتەوە کە لەگەڵ مانێریالیزمی دیالەکتیك هەیەتی، وەك سیستەمێکی یەکگرتووی لێتێگەیشتنی زانستانەی جیهان و ڕێوشوێنێکی زانینی دنیاو گۆڕینی شۆڕشخوازانەی.

ماتێریالیزمی مێژوویی مانای پەیڕەوکردنی گشت بیروباوەڕە سەرەکییەکانی ماتێریالیزمی دیالەکتیکە بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا، یەکێتی توندو تۆڵی ماتێریالیزمی دیالەکتیك و ماتێریالیزمی مێژوویی فەلسەفەی مارکسیزمی کردۆتە ماتێریالیزمێکی یەکگرتووی مەنتیقی. پێش مارکس و ئەنگلس بیروڕای ئیمپریالیزم لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بڵاو بوو، بۆ نموونە:خاوەن بیرە فەڕەنسییەکانی چەرخی هەژدەیەم، هەر چەندە لە ڕوونکردنەوەی دیاردەکانی سروشتدا ماتێریالیست بوون، بە چاوی ئایدیالیستانە تەماشای مێژوویان دەکرد نەیانتوانی خۆیان لەو ((ئەڵقە بەتاڵە)) دەرباز بکەن کە دەڵێ: ڕەوشت ڕژێمی دەوڵەت دیاری دەکات و ڕژێمی دەوڵەتیش ڕەوشت، لە ئەنجامدا گەیشتە ئەوەی کە ژیریو ئەقڵی مرۆڤ مێژوو بەرێوە دەبات.

بۆ نموونە هوڵباخ وایدەبینی کە هەر هێندە بەسە بیرێك بە مێشکی پاشادا بێت بۆ ئەوەی ئەمە کارێکی گەورە بکاتە سەرچارەنووسی گەلان، هوڵباخ دەنووسێ: ((هەندێك کینەو تورەیی زیاتری کابرایەکی دەمارگیر یان خوێن گەرمیی داگیرکارێك، یان ئینتەلاکردنی پاشایەك، یاخود حەزو ئارەزووی ئافرەتێك، هەموو





فەلسەفەی مارکسیزم

ئەمانە هۆی تەواون بۆ بەرپاکردنی شەڕو ناردنی ملیۆنان کەس بۆ کوشتارو ڕوخاندنی قەڵاو کاولکردنی شاران و نوقم کردنی گەلان لە هەژاری و خەمباریداو، بەرپاکردنی برسێتی و دەردو بەڵاو بڵاوکردنەوەی بێباوەڕی و کوێرەوەری بە درێژایی چەندان چەرخ)).

ئەم چەشنە بیرباوەڕە لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی ئەوەمان پیشاندەدەن کە زۆر لە هزرمەندەکانی رابوردوو، یاسا مەوزوعیەکانی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان تێنەگەیشتوون و هەروا زانا بۆرژوازەکانیش ئێستا لەو یاسایانە ناگەن و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان دەگێڕنەوە بۆ تەنیا ڕێکەوت وبەس.

هزرمەندەکانی پێش مارکسیزم، نەك تەنیا هەوڵی ئەوەیان دەدا کەبەرێگەی خۆیان ڕابوردوو ئێستای مرۆڤایەتی ڕوون بکەنەوەو بەس، بەڵکو هەروەها چاوبڕینە دوا ڕۆژیشیان تاقیکردەوە.

سۆسیالیستە یۆتۆپییەکان(خەیاڵییەکان) کە لەنیوەی یەکەمی چەرخی نۆزدەیەمدا ژیان، لە پێش کەسانی تردا چاویان بڕیبووە دواڕۆژو زۆر بە قووڵی و ڕوونی ڕەخنەیان لە کێشەی سەرمایەداری دەگرت و دەیانگوت پێویستە بگۆڕدرێت بە سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم، یۆتۆپییەکان وایان دەبینی کە هۆی کڵۆڵی گەل موڵکایەتی تایبەتییە و بەڕای ئەوان ئەم موڵکایەتییە جیاوازی دەخاتە نێوان ئەقڵی خەڵکی و هۆیەکی هەمیشەییە بۆ پەیدابوونی رقوکینە لەناو کۆمەڵداو سەرچاوەی هەڵخەڵەتاندنە و ساختەیە لەنێوان خەڵکیداو، هۆی بەرپابوونی شەڕو شۆڕی گشت سەردەمەکانی پێشوو.

سۆسیالیستە خەیاڵییەکان دەربارەی کۆمەڵی ئایندەی کۆمۆنیستی گەلێك بیروڕای بەنرخیان دەربڕیووە، بەڵام ئەو هێزەیان نەدی کە دەیتوانی ببێتە دامەزرێنەری کۆمەڵی نوێ و، ئەو کاتە نەشیاندەتوانی ببینن، ئەوان ڕێگەی ڕاستیان بەرەو ئامانجی چاوەڕوانکراو نەدیتەوە، چونکە ئەو هەلومەرجە مێژووییە تێیدا دەژیان هێشتا بۆ ئەو مەبەستە لەبار نەبوو.

کاری مێژوویی و مەزنی مارکس و ئەنگلس ئەوەبوو توانییان ئایدیالیزم لە زانستی کۆمەڵایەتی لابدەن و بۆ یەکەمجار لە مێژوودا چاری ماتێریالیستانەی مەسەلەی سەرەکیی فەلسەفەیان دەرهەق بە کۆمەڵ پێشکەش کرد. بەپێچەوانەی تێگەیشتنی ئایدیالیستانەی مێژووی کۆمەڵ، مارکسیزم ئەوەی سەلماند کە هۆشمەندی خەڵك قەوارەیان دیاری ناکات، بەڵکو بەپێچەوانەوەیە، قەوارەی کۆمەڵایەتییە کە هۆشمەندی خەڵك دیاری دەکات، کارو بەرهەم هێنانی قیمەتە مادییەکان بنچینەی ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵ و بناغەی پەرەسەندنیانن.

هەرکارکردنە پێشینانی ئێمەی کردۆتە مرۆڤ و هەر خۆشی هۆی کاریگەری بزوتنەوەی کۆمەڵە بەرەو پێشەوە. ئەنگلس کاتێك ناوەرۆکی تێگەیشتنی تازەو مادییانەی مێژوو پیشاندەدا دەنووسێ: ((وەك چۆن داروین یاسای پەرەسەندنی جیهانی زیندووی دۆزییەوە، هەرواش مارکس یاسایی پەرەسەندنی مێژووی مرۆڤایەتی دۆزییەوەن ئەو ڕاستییە ساکارەی تا ماوەیەك لەووبەر لەژێر داروپەردووی







ئایدیالیزمدا شاردرابۆوە، ئەویش ئەوەتە کە خەڵك پێش هەموو شتێك پێویستیان بەوەیە بخۆن و بخۆنەوەو خانوویان ببێ تیا بژین و جلوبەرگ بپۆشن پێش ئەوەی بتوانن پەیڕەوی سیاسەت و زانست و هونەر و ئاین بکەن. . . هتد.

هەروا بەرهەمهێنانی پێداویستیە مادییەکانی ڕاستەوخۆی ژیان و گشت پلەیەکی تایبەتی پەرەسەندنی ئابووریی گەلێك یان سەردەمێك ئەو بنچینەیە پێکدەهێنن کە دەزگایەکانی حکومەتی و یاساو هونەرو، تەنانەت بیروڕای دینی ئەو کەسانەی لەسەر ڕاوەستاون و پەرەدەسێنن و، هەر لە بەر ئەمەشە گشتیان لەسەر ئەو بناغەیە ڕووندەکرێنەوە، نەك بەپێچەوانەوە کە وەك تا ئێستا باوبووە)).

هەر گەلێك لەمەو بەرو ئێستاش، چالاکیی بەکردەوە دێنێتە دی، لەبەر ئەوە نەهێزی شاراوەی ئاسمانی و، نە شاو تزارەکان و، نە رابەرو یاسادانەران، دروستکەرانی ڕاستەقینەی مێژوون، بەڵکو کۆمەڵانی خەڵك و چینەکانن کە مێژوو دروستدەکەن. جا بۆ تێگەیشتنی ڕەوتی مێژوو، نابێ لە گۆشەی چالاکی و هەڵسوڕانی تاقە کەسێکەوە، بەڵکو دەبێ لە کاری کۆمەڵانی خەڵك و چینەکانی کۆمەڵەوە تێهەڵبچین.

مارکس و ئەنگلس ماتێریالیزمیان لە تێگەیشتنی ژیانی کۆمەڵایەتیدا کردە پەیڕەوی گشتی و بەم کارەش لە زانستی کۆمەڵایەتیدا وەرگەڕانێکی تەواویان بەرپاکرد.

لینین لە بارەی ناوەرۆکی ئەم وەرگەڕانە شۆڕشخوازەی مارکسیزم لە بیروڕای کۆمەڵایەتیدا پێکی هێنا نووسیوویەتی: دەڵێ ((پاش ئەو

دوو دڵی و سەرپێییەی کە تائەو کاتە لەباری تێگەیشتنی سیاسەت و مێژوودا بلاّوبوون، تیئورییەکی زانستی وا هاتە ناوەوە کە جوانترین ڕێکوپێکی و پێکەوە گونجان و ڕێکەوتنی هەبوو، ئەوەی پێشاندەدا کە چۆن لە شێوەیەکی تایبەتی ڕێکوپێکی کۆمەڵایەتییەوە، لە ئەنجامی پێگەیشتنی هێزە بەرهەمهێنەرەکاندا، شێوەیەکی بەرزتر پەیدا دەبێ و، پەرە دەسێنێ- بۆنموونە، چۆن سەرمایەداری لە دەرەبەگییەوە پەیدا دەبێ)).

مارکس و ئەنگلس، کاتێك کەیاسا مەوزوعییەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵیان دۆزییەوە، تیئوریی سۆسیالیزمی زانستییان دانا و، سەلماندیان کە سۆسیالیزم داهێنانێك نییە، بەڵکو ئەنجامێکی ئاسایی پەرەسەندنی کۆمەڵی سەرمایەدارییەو، پێگەیشتنی سەرمایەداری لەناوچوونی ساز دەکات.

مارکس و ئەنگلس هەروا دەورگێڕانی جیهانی و مێژووی پرۆلیتاریایان ڕوونکردەوەو، سەلماندیان کە ڕێگای بەرەو کۆمەڵی نوێ بەناو ڕاماڵینی شۆڕشگێڕانەی سەرمایەداریدا تێپەڕ دەبێ.

شان بە شانی پەرەسەندنی کۆمەڵ و گردبوونەوەی زانیاریی نوێ، ماتێریالیزمی مێژووش پەرەدەسێنێ،لینین زۆر نموونەی قەشەنگی ئەم پەرەسەندنەی ماتێریالیزمی مێژوویی پێشکەش کرد. ئێستاش و لەمەولا دەبێ هەموو پوختەو ئەنجامێکی دیاردە نوێیەکانی ناو ژیانی کۆمەڵ لە بەڵگەنامە بەرنامەییەکانی بزوتنەوەی کۆمۆنیستی جیهاندا ڕەنگ بدەنەوە.







## بەشی یەکەم
## سروشت و کۆمەڵگە

کۆمەڵگە دامەزراوێکی کۆمەڵایەتی ئاڵۆزەو ڕێکوپێکی ناوخۆی بریتیە لە چەندان پەیوەندیی ئابووری و کۆمەڵایەتی و خێزانی و بیروڕای جۆربەجۆر کە لە ئەنجامدا لەسەر کاری مرۆڤ پێکدێن. کۆمەڵگە لەو خەڵکە پێك دێت کە بەرهەمهێنانی مادی و ڕوحی دێننە دی و، لەو پەیوەندییانەی بەرهەمهێنان و ئابووری وکۆمەڵایەتی پێکدێت کە لەسەر بناغەی ئەم بەرهەمهێنانە دروست دەبن و پەیوەندی چینایەتی و نەتەوەیی و خێزانیش دەگرنەوە، هەروا کۆمەڵگە لە پەیوەندییە سیاسییەکان و، دواجار لە بواری ڕوحی ژیانی خەڵك پێك دێت، واتە زانست و فەلسەفەو هونەرو ڕەوشتو. . . تاد.

هیچ کۆمەڵێك هەروا بە شێوەیەکی ڕووت(مجرد) نییە، هەروەك چۆن مرۆڤیش بەو شێوەیە نییە، بەڵکو چەندان شێوەی تایبەتی و هەست پێکراوی ڕێکوپێکی کۆمەڵایەتی خەڵك هەن، وەك:کۆمەڵگەی دەرەبەگی و، سەرمایەداریو کۆمەڵگەی سۆسیالیستی. . تاد. جا سەرەڕای هەموو جیاوازییەکی نێوانی کۆمەڵگاکان، هەر کۆمەڵگەیە تایبەتمەندی خۆی هەیە کە لە ڕەوە ئاژەڵ و بەگشتی لە هەر شتێك کە کۆمەڵگە نەبێ جیای دەکاتەوە.

## پێکڕالکانی نێوان سروشت و کۆمەڵگە

دەشێ وابە بیردا بێ کە زۆر ئاسان بێ، هەندێ شت بدرێتە پاڵ سروشت و هەندێکی تریش پاڵ کۆمەڵگە، بەلاّم مەسەلەکە لە ڕاستیدا هەروا ئاسان نییە، دەبینین دارودرەختی باخێك مرۆڤ ڕواندوونی تۆویان و، گەورەبوونیان دیاردەی سروشتن. خاك بەشێکە لە سروشت و مرۆڤ خۆشی دەکات. ئاژەڵ شتێکی سروشتییەو تا ڕادەیەك لەرێگەی هەڵبژاردنی دەستکردەوە مەبەستی مرۆڤی تێدا دێتەدی. خانووبەرە مرۆڤ دروستی کردوون، بەلاّم کەرەستەیانی لە سروشتەوە دەستکەوتووە، مرۆڤیش خۆی بێگومان گیاندارێکی سروشتییەو، بەلاّم پێش هەموو شتێك گیاندارێکی کۆمەلاّیەتییە.

مرۆڤ کە لەسەر زەوی دەژی لە نێوەندی جوگرافی دوورە پەرێز نییە، نێوەندی جوگرافی ئەو بەشەی سروشتە کە بەشێوەیەکی تایبەتی لەگەڵ کۆمەڵگەدا لە پێکڕالکانێکی تەواوی دایەو کەوتۆتە بەر کارتێکردنی. نێوەندی جوگرافی بریتییە لە ڕووبارو دەریاو دارستان و کێڵگەو بیابان و گشت هەلومەرجێکی ئاوو هەواو زەوی و سامانەکانی سروشت و رووەك و دنیای گیانداران.

ژیان لە نێوەندی جوگرافیدا پەیدابووەو پەرەی گرتووە. مێژووی مرۆڤایەتی درێژەی مێژووی زەوییە. ئێمە لەگەڵ نێوەندی جوگرافی توندترین پەیوەندیمان هەیە و ژیانی ئێمە بێ ئەو لەتوانادا نییە،







ئاسمانگەڕان کاتێك بۆ ماوەیەك زەوی جێدەهێڵن لەگەڵ خۆیان ((پارچەیەك)) لە ژیانی سەر زەوی دەبەن، جا وێڕای گشت تایبەتمەندییەکی چلۆنایەتی کۆمەڵگە هەر بەشێك لە گشتێکی گەورەتر دەمێنێتەوە کە ئەویش سروشتە.

مێژووی سروشت و مێژووی کۆمەڵگە کە یەکێکیان کار لەویتریان دەکات، یەکێکیان بەدوای ئەویتریان دەکەوێ، یەکێکیان بەویتریانەوە دەبەسترێتەوە.

مرۆڤایەتی کە خۆی بەشێکە لە سروشت، هەر لەکاتی پەیدابوونییەوە هەوڵی ڕاهێنانی سروشتی دەورو پشتی خۆی دەداو ڕای دەهێنێ و، چەند هەنگاوی گەورەتر بۆ پێشەوە بنێ، ئەوەندە زۆرتر سروشت ڕادەهێنێ. بۆ ڕاهێنانی سروشت، ڕەنج و کۆششێکی زۆر گەورەی مرۆڤایەتی بەختکراوە، مرۆڤ بەکارکردن دارستانی بڕیوەو، گۆم و، زۆنگاوی ووشك کردۆتەوەو بەربەستەو ئەستێڵی دروستکردووەو، ڕێوبانی ڕاکێشاوەو زۆر کاروباری کەی بەجێگەیاندووە.

مرۆڤایەتی گشت گەنج و سامانێکی سروشت دەگۆڕێتە هۆی ژیانی ڕۆشنبیری و مێژوویی کۆمەڵگە. بەدرێژایی چەندان چەرخ و بروسکە مرۆڤی دەترساندو تاریکایی شەوی ڕووندەکردەوەو هەندێ جاریش دەبووە مایەی وێرانی و، لە کاتی هەورە تریشقەدا مرۆڤی ناچاری خۆ پاڵخستن و ڕاکێشان لەسەر زەوی دەکرد.

بەلاّم مرۆڤ لە ئەنجامدا توانی نهێنی بروسکەو هەورە تریشقە

بزانێت و دەسەڵاتی بەسەر کارەبادا گرت و بۆ خزمەتی بەرژەوەندیی کۆمەڵگە بەکاری هێنا:

بروسکە لەناو شووشەدا پرشنگدەداو شەقام و ماڵان ڕووناك دەکاتەوەو ماشین و شەمەندەفەرەکان دەبزوێنێ، وەنەبێ مرۆڤ هەر تەنیا چەندان جۆر ڕووەك و ئاژەڵی بۆ ئاوو هەوایەکی تر گواستبێتەوەو بەس، یان چەشنی تازەی دروست کردبن و بەس، بەڵکو هەروا توانیویەتی دیمەنی دەرەوەی شوێنی ژیانی خۆی و ئاوو هەوایشی بگۆڕێت.

گۆڕینی نێوەندی جوگرافی تا رادەیەك بەخێرایی ڕوو دەداو، لە ماوەی چەند هەزار ساڵێکدا، یان لەسەدان ساڵ و تەنانەت لە دەیان ساڵیشدا، دەشێ ئاڵوگۆڕی زۆر بنەڕەتی سەرنج بدرێ، وەك ئەوەی خەڵکی کە زەوی دەکێڵن، هەموو ساڵێك ئەوەندە گڵ دەگوێزنەوە کەسێ هێندەی ئەو خاکە دەبێ کە بورکانەکان هەر لەو ماوەیەدا لە ژێر زەوییەوە دەیرێژنە دەرەوە. لەم پێنج سەد ساڵەی دواییدا مرۆڤایەتی نزیکەی چەنجا ملیارد تەن کاربۆن و دوو ملیارد تەن ئاسنی لە قوڵایی زەوی دەرهێناوە. هەروا لە ماوەی ئەم سەد ساڵەی دواییدا پرۆژە پیشەسازییەکان نزیکەی سێسەدو شەست ملیارد تەن غازی ئۆکسیدی کاربۆنیان لە هەوادا ((زیاد)) کردووەو بەمەش ئاستی بوونی ئەو غازەیان گەیاندۆتە نزیکەی لە سەدا سیانزە (١٣٪) ئەو غازی ئۆکسیدی کاربۆنەی لە هەوای دەوروپشتدا زیاد بووە بەسە بۆ ئەوەی یەك پلە یان پلەو نیوێك ئاستی نێوەندی گەرمایی بەرز







بکاتەوە.

چەند کۆمەڵگە زۆرتر پەرەبسێنێ و بەرەو پێشەوە بڕوات، ئەوەندە زۆرتر بەڕێگەی کارکردنی دەتوانێ نێوەندی جوگرافی بگۆڕێت و، خاسیەتی نوێی تێدا کۆبکاتەوە کە بەرە بەرە زۆرتر لە باری یەکەمجاری دووری دەخاتەوە.

ئەم خاسیەتە نوێیانەش کە بەکارکردنی نەوەکانی پێشوو هاتوونەدی، نەوەکانی ئایندەی مرۆڤایەتی وا لێدەکەن بتوانن هۆیەکانی کارکردن و کەرەسەی بەکاربردنیان فراوانتر بکەن.

لەگەڵ پەرەسەندنی مێژوودا، کارتێکردنی نێوەندەی جوگرافی لە ژیانی کۆمەڵگە دەگۆڕدرێت. کۆمەڵگە چەند لە رابوردوودا بووبێت و، چەند هێزەکانی لاوازتر بووبن، ئەوەندەی زۆرتر بۆتە تابیعی سروشتی دەوروپشتی. ئا بەمجۆرە سروشت کارێکی وایکردووە کە پێشینان بە زۆری لە نزیك ڕووبارەکان کۆبنەوە.

نێوەندی جوگرافی کار دەکاتە سەر خاسیەتەکانی بەرهەم، بەڵام کاتێك باسی پێویستی لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی سروشت دەکەین، نابێ بایەخی زۆر گەورەتر تەماشا بکەین، چ جای ئەوەی بکرێتە هێزێکی خاوەن بریار لە پەرەسەندنی کۆمەڵگەدا، وەك لایەنگرانی ڕێبازی جوگرافی لە زانستی کۆمەڵایەتیدا دەیکەن. ئەوان دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بەستراوە بە خاسیەتەکانی ئاوو هەواو خاك و باری جوگرافی ئەم یان ئەو وڵاتانە، لافی ئەوە لێدەدەن گوایە ئەم خاسیەتانەن چارەنووسی گەلان و ڕژێمی

کۆمەلأیەتی و سیاسی و شێوازی ژیانیان و شتی وا بریار دەدەن.

بۆ ژیانی ئابووری و روحی کۆمەڵ وا پێویستە ژمارەیەکی تایبەتی خەڵك لە شوێنێکی تایبەتیدا بژین، واتە چڕییەکی پێویستی دانیشتوانی مەرجە. زۆربوونی بەردەوامی دانیشتوانیش یەکێکە لە هەلومەرجەکانی سروشت بۆ ژیان و پەرەسەندنی کۆمەڵگە.

لە سەردەمی سەرمایەداریدا زۆر بوونی ژمارەی دانیشتوان لەچاو ماوەی پێشووتردا زۆر خێراتر بوو. سەرکەوتنەکانی زانست و باشبوونی باری کۆمەلأیەتی بوونە هۆی کەمبوونەوەی رێژەی مردن، بەلأم سیستەمی بۆرژواز لەبەرهەمهێناندا لە حاڵێکدا دەرکەوت کە نەیدەتوانی بە چەشنێکی کاریگەرانە لە زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان کەڵك وەربگرێ، بەشێکی گەورەی کارگەران لە هەلومەرجی کۆمەڵی بۆرژوازدا دەرفەتی نابێ هێزی خۆی بەکاربێنێت و، سوپایەکی یەدەکی(ئیحتیاتی) کارکردن پێکدێنێت، واتە لەشکری بێکاران کە وورده بەرهەمهێنەرەکانیش، ئەوانەی نابووت دەبن دەچنە پاڵیانەوە. لەسەردەمی ئیمپریالیزمدا زیادەی رێژەیی(نیسبی) دانیشتوان، بە شێوەیەکی تایبەتی بەتینتر دەبێ.

بەپێی یاسای دانیشتوان لە کۆمەڵگەی سۆسیالیستدا، خەڵکی بە تەواوی خەریکی کاروباری بە کەڵکن بۆ کۆمەڵ و، بەرهەم بە جۆرێکی رێکوپێك دابەش دەکرێ و بەپێیی بەرنامە، ژمارەی دانیشتوانیش زۆرتر دەبێ. بەشێوەیەکی گشتی زۆر بوونی دانیشتوان بەم چەشنەیە:تا سەرەتای مێژووی لە دایکبوون دانیشتوانی زەوی نزیکەی







دووسەد ملیۆن بوو، لە سەدەی راپەریندا گەیشتە نیو ملیاردو لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا گەیشتە یەك ملیارد. تا ساڵی ١٩٣٠ ژمارەی دانیشتوانی زەوی گەیشتە دوو ملیاردو، لەساڵی ١٩٦٤دا ٣/٢ ملیارد مرۆڤ لەسەر زەوی دەژیان.

زۆربوونی دانیشتوان زۆر لە زانا بۆرژوازەکان دەتۆقێنێ. ئەوانە دەگەنە ئەو ئەنجامەی دەڵێن برسێتی و ئازارەکانی تری مرۆڤایەتی شتێکی حەتمین و لێ دەرباز بوونیان کارێکی مەحاڵەو، لافی ئەوە لێدەدەن گوایە هۆیەکن بۆ هاوسانی نێوان چڕوپڕی دانیشتوان و شتومەکی یەدەك بۆ ژیان. یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەم تیئورییە درۆزنە کابرایەکی قەشەی ئینگلیزەو ناوی(مالتوس) ە. بەپێی ئەم تیئورییە کە بەو ناوە ناسراوە، ژمارەی دانیشتوان زۆر خێراتر لە پێداویستەکانی ژیان زیاد دەبێ.

لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی زانستیانەو بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە توانا هەیە لە هەلومەرجێکی ئابووری تەکنیکی گونجاودا بەرهەمی زەوی و توانای لەو ڕووەوە بەرەو پێش ببرێت. چەند مرۆڤ زیاتر هەوڵ بداو هۆی تایبەتی بەکار بێنێت ئەوەندە بەرهەمی زەوی زۆرتر دەبێت بۆ مرۆڤ. بەکارهێنانی پەینی کیمیایی و باشکردنی رێوشوێنی کشتوکاڵ و چاککردنی زەوی و ئاودێری. . . هتد ئەمانە هەموویان دەبنە هۆی زۆربوونی بەردەوامی بەروبوومی کشتوکاڵ.

مرۆڤایەتی دووچاری مەترسی کەم بوونەوەو نەمانی کەرەسەکانی سروشت و کەمبوونەوەو نەمانی بەروبومی خۆراك و

کەرەسەی خاو بۆ بەرهەم هێنانی شت و مەکی خواردن نەبۆتەوە. لەم ڕووەوە زانست گەلێك توانای مەزن دەدۆزێتەوە، بە تایبەتی کیمیای تازەو فیزیکی نوکلیار. سەرکەوتنەکانی جیولوجیەکان ئەوەیان سەلماندووە کە سامانی زۆرو زەبەندی سروشتیی زەوی زۆر لەوە زیاترە کە چاوەڕوان دەکرێ و، زۆر سەرچاوەی کەرەسەی خاوی بەکەڵك هەن کە هێشتا دەستی مرۆڤیان نەگەیشتۆتێ. بە تایبەتی وەك ئەو سامانانەی لە قووڵایی دەریاو ئۆقیانووسەکاندا هەن. وا چاوەڕوان دەکرێ ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی لەم سەد ساڵەی ئایندەدا بگاتە هەشت تا دە ملیارد مرۆڤ. لەگەڵ ئەمەشدا ناکرێ ئەمە بکرێتە بناغەی بە ئەنجام گەیشتنی ماڵتوسییانە.

مەسەلەی لە ناو بردنی برسێتی هەمیشەیی و خراپیی خۆراك بە مەسەلەی لە ناوبردنی ئیستعمارو ئیمپریالیزمەوە بەستراوەتەوە. گەلە رزگارەکان لەسەر بنچینەی پەرەپێدانی ئابووری سەربەخۆی نیشتمانی و رۆشنبیری سەربەخۆی نەتەوەییان، بە زانستیشەوە نەبێ، ناتوانن نەبوونی و هەژارییان لە ناو بەرن.

ئا بەم چەشنە زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان و نێوەندی جوگرافی دوو هۆی گرنگن بۆ پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی، بەڵام تاقە هۆیەکی دیاریکراو نین بۆ رەوت و رێبازی ئەم پەرەسەندنە. چونکە بەرهەمهێنانی خێروبێری مادییە کە دەورێکی کاریگەرو بڕیاردەر لە پەرەسەندنی کۆمەڵگەدا دەگێڕێت.








## بەشی دووەم

## بەرهەمهێنان مەرجی سەرەکیی ژیانی کۆمەڵگەیە

بەرهەمهێنانی خێروبێری مادی بناغەی بوون و مەرجی بڕیاردەری پەرەسەندنی کۆمەڵگەیە. هەر ئەمەش هۆی گواستنەوە لە رژێمێکی کۆمەڵایەتییەوە بۆ رژێمێکی تر.

لە رەوتی کارکردندا ئامێرەکانی بەرهەمهێنان کە مرۆڤ بەکاریان دەهێنێ دەگۆڕدرێن و، لەگەڵ ئەمەشدا مرۆڤ خۆشیان و شارەزایی وهۆشمەندییان دەگۆڕدرێن وهەموو رژێمی ژیانی ئابووری دەگۆڕدرێت و تەواوی پەیوەندییەکانی مرۆڤ لە نوێ دروست دەکرێنەوەو رێکخراوەو دام و دەزگاو بیروباوەڕو رەوشتیش دەگۆڕدرێت.

بەرهەمهێنانی مادی گرنگترین و پێویستترین هەڵسوڕانێکی مرۆڤە کە لە هەر کاتێکداو یان ئێستا کە هەر کاتێکی لەمەوبەرو ئێستای مرۆڤەو ئەمەش بۆ خۆی روون و ئاشکرایە. ئەوەتا مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانن ژیان بەرنەسەر دەبێ پێداویستیەکانی ژیان پەیدا بکەن و، بۆ ئەمەش ناچارن کاربکەن. ژیانی کۆمەڵگە بەبێ کارکردن لە تواناد نییە.

مرۆڤ ناتوانێ تەنیا بەوە بژی کە بە ئامادەیی لەناو سروشت

دەستدەکەوێ، بەڵکو رەنجی خۆشیان بەکاردێنن و شتی وا دروست دەکەن کەلە سروشتدا نین. کارکردن بریتییە لە چالاکی هۆشمەندانەی مرۆڤ بۆ گۆرینی شتومەکی ناو سروشت بە یارمەتی ئامێرەکان بەپێی پێداویستیەکانی مرۆڤ.








## هێزە بەرهەمهێنەرەکانی کۆمەڵگە

بۆ هێنانەدی بەرهەمهێنان دەبێ ئەو مادەیە هەبێ کە کاری لێ بکرێ. بۆ نموونە زەوی و، سامانەکانی ناو سروشت و دارو درەخت و شتی وا. بەلاّم ناتوانرێ بەبێ بەکارهێنانی ئامێرەکان سروشت بگۆڕدرێت. بەرهەمهێنانی خێروبێری مادی لە دروستکردن و بەکارهێنانی ئامێرەکانی کارکردنەوە دەستپێدەکات و ئەمەش هەروەك مارکس دەڵێ پەیکەری ئێسکی و ماسولکەیی بەرهەمهێنانە. جا بۆ بەرهەمهێنان و بەتایبەتی بەرهەمهێنانی تازە دەبێ مەکینە و ئامێرەکان و کەرەسەی کارکردنی تر هەبن.

ئەو شتانەی مرۆڤ بەنیازی کارتێکردن و سەر لە نوێ دروستکردنەوەی سروشت بۆ قازانجی مرۆڤ و کۆمەڵگە دایان دەهێنێ پێیان دەوترێ ئامێرەکانی کارکردن.

لە دەمێکی زووی بوونی مرۆڤەوە لەو کاتەوە کە بە گەلەو رەوە دەژیان، نەیانتوانیوە دەستبەرداری بچوکترین ئامێری وەك تەوری بەردین و شتی وا ببن. . لەگەڵ پەرەسەندنی مرۆڤایەتیشدا بەردەوام دەورگێرانی ئامێرەکانی کارکردن مەزنتر دەبێ. لەم رۆژگارەماندا، بەبێ ئامێرو دامودەزگای پێشکەوتوو کە بەهێزی هەڵم یان بە کارەبا و یاخود بە وزەی نوکلیار دەکەونەکار، کاروباری بەرهەمهێنان کارێکی نا ماقووڵ و نابەجێیە.

سەرەڕای ئامێری کارکردن خانووی کاریگەرو فابریقەو عەمبارو ووزەو هۆیەکانی گواستنەوە، بۆ بەرهەمهێنان پێویستن. هەموو ئەم شتانەش لەگەڵ ئامرازەکانی کارکردندا پێکەوە، پێیان دەوترێ هۆیەکانی کارکردن تەکنیك هۆیەکانی کارکردنیش لەگەڵ بابەتی کارکردن هۆیەکانی بەرهەمهێنان پێك دەهێنن.

دەورگێرانی سەرەکی لە کاروباری بەرهەمهێناندا لەلایەن خەڵکەوەیە، نەك ئامرازەکانی کارکردن، چونکە ئەو خەڵکە خۆیان هۆیەکانی بەرهەمهێنان دروست دەکەن و دەخەنە کار. بەبێ مرۆڤ هۆیەکانی بەرهەمهێنان بە مردوویی و بێ جووڵە دەمێننەوە. مرۆڤ و ڕەنجی مرۆڤ بەنرخترین سامانی سەرزەوین، جا بۆ ئەوەی هۆیەکانی کارکردن بچنە ناو کاروباری بەرهەمهێنانەوە دەبێ هێزی کارگەر، ڕەنجی زیندوی مرۆڤ بخرێتە کار. ئاسنیش وەکو دەڵێن، ئاسنگەر لێی دەدا نەك چەکوش. لینین باسی ئەوەی کردووە کە هێزی سەرەکیی بەرهەمهێنان بۆ هەموو مرۆڤایەتی کارگەرە، ڕەنجکێشە.

بەم چەشنە دەردەکەوێ کە هێزەکانی بەرهەمهێنان بریتین لە هۆیەکانی بەرهەمهێنان لە پێش هەموویانەوە ئامێرەکانی کارکردن و هەروا ئەو خەڵکەی لە بەرهەمهێناندا پسپۆڕی و لە کارکردندا شارەزاییان هەیە و خێروبێری مادی بەرهەم دێنن. ئاستی پەرەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەرەکانی کۆمەڵ، لە پێش هەموو شتێکدا لە ڕادەی شارەزابوونی تەکنیکەوە دەردەکەوێ. چونکە مرۆڤایەتی شارەزایی چەندان چەرخ و ڕێوشوێنەکانی ئاڵوگۆڕی





سروشت و ڕادەیەکی تایبەتی پەرەسەندنی ڕۆشنبیری عەقڵی لە تەکنیکدا پیشاندەدا.

دۆزراوەو دەستکەوتەکانی زانست، بەم یان بەو شێوەیە لە تەکنیکدا پەیرەو دەکرێن. پێشکەوتنەکانی زانست و پەیڕەوکردنیان لە بەرهەمهێناندا لەسەر شێوەی کەرەسەی تازەو یان ئامێری تازەی کارکردن و یاخود ڕێکخستنێکی تازەی بەرهەمهێنان، یەکێکە لە گرنگترین مەرجی سەرەتایی شۆڕشی تەکنەلۆژی.

پیشاندەری ڕادەی پەرەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان لە کۆمەڵدا، بەرهەمداریێتی کارکردنە کە بەوە دەپێورێ لە کاتێکی تایبەتیدا چەند بەرهەم دروستکرابێ جا ئاخۆ بەرهەمداریێتی کارکردن لەسەر چی وەستاوە؟ بەرهەمداریێتی کار لە سەر تەکنیکی چاك و تەواو، لەسەر شارەزایی کارگەران و، ڕادەی پەرەسەندنی زانست و پەیوەندی لەگەڵ بەرهەمداو لەسەر هەلومەرجی سروشت وەستاوە.

چەند مرۆڤ بتوانێ سەرکەوتنی گەورەتری تەکنیکی بێنێتە دی و، چەند بتوانێ هێزە مەزنەکانی سروشت بخاتە ژێر دەستەڵاتی خۆی، ئەوەندە زۆرتر دەبێتە خاوەن شارەزایی و زانستی زۆرتر. جا لە کاتێکدا لە ڕابردوودا ئامرازەکانی کارکردن وەك درێژەو، بەهێزکەری دەستی مرۆڤ بوون، ئێستا بۆ نموونە لەشێوەی ئەقڵی ئەلکترۆنیدا بوونەتە درێژە پێدەرو بەهێزکاری مێشکی مرۆڤ. هەندێ پرۆسیسی ئەقڵی کە لە ڕابوردوودا تەنیا لەلایەن مرۆڤەوە بەدی دەهاتن، ئێستا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر لەلایەن ئامرازەکانەوە دەهێنرێتە دی. بەڵام





پێشکەوتنی تەکنیکی، بەپێی ڕژێمی کۆمەڵایەتی. دەبێتە مایەی ئەنجامی کۆمەڵایەتی لێك جیاواز. بۆ نموونە لە سەرمایەداریدا ئۆتوماتیکی بەرهەمهێنان دەبێتە مایەی بلاوبوونەوەی بێکاری بە کۆمەڵ و بەتین بوونی تەنگوچەڵەمەو شتیوا. لە سۆسیالیزمدا پێشکەوتنی تەکنیکی دەبێتە مایەی باشبوونی هەلومەرجی کارکردن و بوژانەوەی باری ژیانی مادی و بەرزبوونەوەی ڕادەی ڕۆشنبیری و تەکنیکی کرێکاران.

کەواتە هێزەکانی بەرهەمهێنان، پەیوەندی نێوان کۆمەڵ و سروشت دەردەخەن. ڕادەی پەرەسەندنی ئەو هێزانە بەڵگەیە بۆ پیشاندانی ڕادەی دەسەڵاتگرتنی مرۆڤ بەسەر هێزەکانی سروشتدا. ئەم ڕادەیەش خۆی پێش هەموو شتێك بە ئامرازەکانی کارکردن و پلەی وزە بەکارهێنان لە بەرهەمداو بە ڕێکوپێکی و تەکنەلۆژی کردنی پرۆسیسی بەرهەمهێنان و پەرەپێدانی زانست بەوە دیاری دەکرێ کە تا چ ڕادەیەك مرۆڤ بە سەرکەوتوویی دەستکەوتەکانی زانست و تەکنیك بۆ هێنانەدی پێداویستیەکانیان بەکار دەهێنن. بەڵام ئەمەش تەنیا لایەنێکی بەرهەمهێنان. دەشبێ بەوردی سەرنجی خاسیەتەکانی بدرێ.







## پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان

لە سەرەتاوە بەرهەمهێنان چالاکییەکی هاوبەشی خەڵك بوو. ئەو خەلچکە بۆ ئەوەی شت بەرهەمبێنن پەیوەندی تایبەتییان لە نێواندا پێك دەهات و تەنیا لەو ڕێگەیەوە بەرهەمهێنان جێبەجێ دەبوو. ئەو پەیوەندییانەی لە نێوان خەڵکیدا لە کاتی پرۆسیسی بەرهەمهێنانی خێروبێری مادیدا پەیدا دەبن پێیان دەوترێ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان. لە کۆمەڵی سەرەتاییدا هەموو ئەندامانی عەشیرەتی خێڵەکی کە توانای کارکردنیان هەبوو بەیەکەوە خۆراکیان بۆ خۆیان پەیدا دەکردو هەرچییان دەست بکەوتایە پێکەوە بەکاریان دەبردو هەندێکیان لە کاتی زۆرانبازی و گیروگرفتدا پشتگیری ئەوانی تریان دەکرد. هۆیەکانی بەرهەمهێنانیش هی هەموو خێڵەکە بوون موڵکایەتی گشتی بوون و خەڵکی لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدا یەك جێگەیان هەبوو.

لە کۆمەڵەکانی کۆیلایەتی و دەرەبەگی و سەرمایەداریدا پەیوەندی تری جیاواز پێکهاتبوون کە پەیوەندی دەستەلاتداری و ژێر دەستەیی بوون سەرەڕای ئەمجۆرە پەیوەندییانەش ئەوەیە زۆرداران هۆیەکانی بەرهەمهێنانیان هەیەو زۆرلێکراوانیش لێیان بێ بەشن.

پێ بەپێش گواستنەوە بۆ سۆسیالیزم لە نیچوان ئەندامانی کۆمەڵگەدا پەیوەندی هاوکاری و پشتگیری پێکدێت، چونکە هۆیەکانی

بەرهەمهێنان لە کۆمەڵگەی سۆسیالیزمدا دەبێتە موڵکایەتی بە کۆمەڵ.

ئەمەش مانای وایە بۆ ئەوەی خاسیەتی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لەم یان لەو پلەیەی پەرەسەندنی کۆمەڵدا روون بکەینەوە دەبێ وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە:لەم کۆمەڵەدا ئامێرەکانی کارکردن و، سەرچاوەکانی کەرەستەی خاوو زەوی و خانووبەرەو شتی وا لە ناو دەستی کێدا دەبن؟ واتە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لە پێش هەموو شتێکدا لەسەر شێوەی موڵکایەتی ڕەنگ دەگرێ. مێژووش ئەوەمان پیشاندەدا کە وەزعی خەڵکی لە کۆمەڵداو شوێنیان لە بەرهەمهێناناو دواجار پەیوەندییەکانیان لەگەڵ یەکتریدا لەسەر شێوەکانی موڵکایەتی وەستاون. بۆ نموونە لە سۆسیالیزمدا موڵکایەتی کۆمەڵایەتی دەورگێڕانی رابەرێتی ڕەنجدەران لە بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیدا زامن دەکاو رەنجیان دەکاتە مەسەلەی شەرەف و سەربەرزی و پەیوەندییان بەیەکەوە دەکاتە پەیوەندی دۆستایەتی و هاوکاری.

بەمجۆرە دیارە کە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان، پەیوەندی مادین و بە سەربەخۆیی لە هەست و ویستی خەڵکی و، لە پرۆسیسی بەرهەمهێنانی خێروبێری مادیدا، لەناو خەڵکیدا پەیدا دەبن.

دەبینین بەرهەمهێنان دوو لایەنی زۆر گرنگی هەیە، یەکەمیان هێزە بەرهەمهێنەرەکان و دووەمیان پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانن، هەردوو لایەنەکەش پێکەوە لکاون و لێك جودا نابن و هەر ئەم







یەکێتییەشیان ئەوەمان بۆ دەردەخات کە چۆن خەڵکی خێروبێری مادی بەرهەم دێنن. واتە یەکێتی هێزە بەرهەمهێنەرەکان و پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان شێوەی بەرهەمهێنان پێك دێنێت، جا ئایا هەردوو لایەنەکەی شێوەی بەرهەمهێنان چۆن کار دەکەنە سەر یەکترو ئەم پێکرا لکانەیان لە مێژوی کۆمەڵگەدا چ دەورێك دەگێڕێت؟ هەر لە سەرەتای پەیدا بوونی کۆمەڵگەو خەڵکی هیچ دەستبەرداری بەرهەمهێنانی خێروبێری مادی نەبوون. وا نزیکە یەك ملیۆن ساڵ تێپەڕ دەبێ و پێداویستیەکانی مرۆڤایەتی تەنیا ڕۆژێکیش ((ڕاگیر)) نابن. هەر پێداویستیەك بەجێ بگەیەندرێ پێداویستیەکی نوێ دێنێتە کایەوە. پێداویستە تازەکانیش پێداویستیان بە بەرهەمی هەیە و بەو جۆرە بە ئامرازی نوێ و، هەروا بەو چەشنە جا لە کاتێکدا پەرەسەندنی بەرهەم لە ژیاندا پێداویستی نوێی پێ دەوێ و پێداویستی کۆن دەگۆڕدرێ، پێداویستە پەرەسەندوەکانیش پەرەسەندنی بەرهەم بەرەو پێشتر دەبەن.

پەرەسەندنی بەرهەم لە پێش هەموو شتێکدا لەسەر گۆڕانی هێزەکانی بەرهەمهێنان وەستاوە ئەمەش لە ژیانی مادیی کۆمەڵدا لە هەر هۆکارێکی تر زۆرتر دەبزوێ و دەگۆڕدرێ. جا دەبێ هۆی ئەمە چی بێ؟ هۆی ئەمە پەرەسەندن و تەواوبوونی ئامرازەکانی کارکردنەو بۆ نموونە لەوەدا دیاری دەدا کە بە دەرکەوتنی ئامرازێکی تازە پێداویستی داهێنانی ئامرازێکی تر سەر هەڵدەداز داهێنانی تەکنیکی و بەکارهێنانی لە هەر بوارێکی بەرهەمدا دەبێتە مایەی ئاڵوگۆر لە

بوارەکانی تردا. هەر بەم چەشنە رستن و چنینی میکانیکی پەیدا بوو. . . هتد.

له ئەنجامی گۆڕینی هێزەکانی بەرهەمهێنانەوە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانیش دەگۆردرێن. بەلاّم لە کاتێکدا کە هێزە بەرهەمهێنەرەکانی کۆمەڵ بە خێرایی دەگۆردرێن دەبینین شێوەکانی مولّکایەتی جێگیرترن.

دەگونجێ ئەو شێوازەی مولّکایەتی چەندان چەرخ بەردەوام بن (وەك دەرەبەگی و سەرمایەداری) یان بە هەزاران ساڵ (وەك سەردەمی کۆیلایەتی) و تەنانەت سەدان هەزار ساڵ (وەك کۆمەڵی سەرەتایی). لەو ماوەیەدا هێزەکانی بەرهەمهێنان بە چەشنێکی بنەڕەتی دێنە گۆڕین و لە ئەنجامدا هەردوولایەنەکەی شێوەی بەرهەمهێنان بە چەشنێکی نا یەکسان پەرەدەسێنن. بەلاّم ئەم جیاوازییەش سنووری خۆی هەیە. کاتێك پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لە هێزەکانی بەرهەمهێنان جێ دەمێنن ناکۆکی پەیدا دەبێ و رۆژ بە رۆژ تیژتر دەبێ و ئەوجا دەبێتە نارێکی و بەگژیەکدا چوون. ئەو دەمە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دەبنە کۆسپی رێگەی پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان.

نارێکی و بەگژیەکدا چوونی نێوان پەیوەندییە دواکەوتووەکانی بەرهەمهێنان و هێزە پەرەسەندووەکانی بەرهەمهێنان بە رێگەیە چارەسەردەکرێ کە پەیوەندی کۆنی بەرهەمهێنان دەگۆردرێ بە پەیوەندی نوێ، بە چەشنێك لەگەڵ رادەی پەرەسەندنی هێزەکانی







بەرهەمهێناندا بگونجێن، لەو کۆمەڵانەدا کە لەسەر بناغەی مەڵکایەتی تایبەتی دامەزراون، پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان بۆ کاتێکی درێژ لەگەڵ هێزە پەرەسەندووەکانی بەرهەمهێناندا ناگونجێن. تەنیا لە قۆناغی سەرەتایی شێوەی بەرهەمهێناندا جۆرە گونجانێك جەبێ کە پاشان سەر لە نوێ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان دەکەونە دوای پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان، ئەمەش دەبێتە مایەی دەرکەوتنی ناکۆکیی تازەی نێوان هێزە نوێیەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندییە کۆنەکانی بەرهەمهێنان، جارێکی تریش ناکۆکییەکان دەگەنە رادەی نارێکی و بەگژیەکدا چوون و ئەجا مێژوو لە پەرەسەندنیدا بازێکی تازە دەدا، گشت هێزە کۆنە پەرستەکانی کۆمەڵیش بۆ بەرگری لە رژێمی کۆن رادەپەڕن و دەیانەوێ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان کە باویان نەماوە رزگار بکەن، چونکە ئەم پەیوەندییانەن رێگەی دەسەلاّتداری بەسەر کۆمەڵدا و چەوسانەوەو رەنج خۆری کارگەران دەدەن. هەر لەبەر ئەمەش هێزە پێشکەوتنخوازەکانی کۆمەڵ بەرگری شۆرش بەرگری هێزە کۆنەپەرستەکان تێك دەشکێنن.

کەوابوو پەیوەندییەکی سروشتی لە نێوان هەردوو لایەنی شێوەی بەرهەمهێناندا هەیە. بۆ ئەوەی پەرەسەندنی بەرهەم سەرکەوتوانە بێتە دی و تا گشت کۆمەڵگەش لەگەڵیدا پەرەبگرێت، دەبێ پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لەگەڵ رادەی پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێناندا بگونجێن و خۆ ئەگەر روخا ئەوا پەیوەندییەکانی

بەرهەمهێنان دەبنە کۆسپ لە ڕێگەی پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێناندا.

جا ئایا پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان چۆن کار دەکەنە سەر هێزەکانی بەرهەمهێنان؟

خەڵکی کە بەرژەوەندی تایبەتی دەیانبزوێنێ بەرهەم پەرە پێدەدەن. جا ئەگەر ئەم رژێمە کۆمەڵایەتییە خەڵکی بۆ کارکردن و تەواوکردنی تەکنیك و ڕێکخستنی بەرهەم و بەرزکردنەوەی رادەی شارەزایی رەنجدەران و پێشخستنی ئاستی رۆشنبیری و تەکنیکی هان بدات ئەوا ئەم رژێمە یارمەتی پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان دەدات. مێژووش نیشانمان دەدات کە ئەم ڕژێمە سۆسیالیستییە، بەلاّم ئەگەر ڕژێمێکی کۆمەڵایەتی ڕەنجدەران بخاتە بارێکەوە کەڵك لە پەرەسەندنی بەرهەم وەرنەگرن ئەوا ئەو ڕژێمەش دەبێتە کۆسپی ڕێگەی پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان. ئەو ڕژێمەش سەرمایەدارییە.







## ژێرخان و سەرخانی کۆمەڵ

لە تەواوی ڕژێمی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی خەڵکیدا، پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان ڕۆڵێکی سەرەکییان هەیە. بنکەی ئابووری کۆمەڵایەتی پێکدێنن. ئەم بنکەیە، یان ژێرخان، ئەو بنچینەیەیە کە بیروڕای کۆمەڵایەتی‌و دامەزراوە سیاسیی‌و مافپەروەری‌و ڕۆشنبیری‌و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی کەی لەسەر دامەزراوە. واتە هەموو ئەوەی بە سەرخان ناوی دەبەین، تیئوری‌و بیروباوەڕی سیاسی‌و حقوقی‌و ڕەوشت‌و جوانناسی‌و دینی‌و فەلسەفەیش دەگەڕێتەوە بۆ شێوەکانی هۆشمەندی کۆمەڵایەتی کە ڕێکخراوەو. دەزگای گونجاو بە هەریەکەیانەوە بەستراونەوە:

حزبە سیاسییەکان بە بیروڕای سیاسی‌و دامەزراوەکانی میری بە بیروڕای سیاسی‌و حقوقییەوە بەستراونەوە. . . تاد.

سەرخانیش کەلەژێرخانەوە پەیدابووە بە بێ جیاوونەوەی پێوەی لکاوە: هەر ژێرخانێکی دیاریکراو سەرخانێکی گونجاو بۆ خۆی دێنێتە کایەوە، با ڕژێمی سەرمایەداری بکاینە نموونە. لەوێدا پەیوەندیی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لەسەر بنچینەی موڵکایەتی تایبەتی‌و چەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە دامەزراوە. ڕژێمە سیاسیەکەش بە تەواوی لەگەڵ ئەم پەیوەندییانەی بەرهەمهێناندا دەگونجێ: بۆرژواز لەم ئابوورییەدا بالاّدەستە، لەبەر ئەوەشە هەروا

خاوەنی دەسەلاتداری حکومەتە. بەلام بیروڕایە سیاسیو حقوقیو ڕەوشتیو فەلسەفیو دینیو جوانناسیو ئەوانی تر کە لە سەرمایەداریدا بالا دەستن، هەروارێکخراوە دامەزراوە گونجاوەکانی تریان- حزبەکان، دادگا، کلێسە، ئەنستیتووتو ئەوانی تر، هەموو وەك پارێزەرانی بەرژەوەندی بۆرژواز دامەزراونو، وەك ئامێری سەرکوتانەوەی زەحمەتکێشانو بۆ چەوسانەوەیان بەکار دەهێنرێن.

وەرگەڕان لەسەرخاندا کە لە قۆناغی شۆڕشی کۆمەلایەتیدا ڕوودەدا ڕەنگدەداتەوە کە دەسەلاتی سیاسی لە چینە کۆنەپەرستەکانەوە دەگوازرێتەوە بۆ چینی تازەی پێشکەوتنخوازو سیستەمی کۆنەی دامەزراوە کۆمەلایەتییەکان لادەدرێو. ئایدیۆلۆژیی بالا دەستی پێشوو بە ئایدیۆلۆژییەکی نوێ دەگۆڕدرێ.

بۆ نموونە شۆڕشی سۆسیالیستی فەرمانڕەوایی چینە چەوسێنەرەکانی داماڵی و دەسەلاتداریی زەحمەتکێشانی هێنایە دی و ئەم دەسەلاتدارییەشی بۆ بەرژەوەندی ڕەنجدەران بەکارهێنا لە پێناو دامەزراندنی ژێرخانێکی نوێ و سەرخانێکی نوێدا.

لەگەل هەلوەشاندنەوەی ژێرخانە کۆنەکاندا سەرخانەکەی پێشووش وەك سیستەمێکی بالادەستی بیروراو دامەزراوەکانی کۆمەلگەی کۆن نامێنێ، بەلام هەندێك لە ڕەگەزەکانی تەمەنیان زۆر لەو ژێرخانە درێژتر دەبێ کە بەرهەمیان هێناوەو هاتوونە سەر سەرخانی کۆمەلگەی نوێ، ئەمەش لە هونەرو فەلسەفەو ڕەوشتدا دەمێنێ، لەگەل ڕەتکردنەوەی هەرچی کۆنەپەرستانەو کۆنە، هەندێ







لە ڕەگەزەکانی سەرخانی پێشوو دەمێننەوە. سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم باوەش والا دەکەنەوە بۆهەربەرهەمێکی بەنرخ کە بیری مرۆڤایەتی پێشکەوتنخوا لە رابوردوودا دایهێناون.

ئاخۆ دەکرێ، بەتێهەلچوون لەو سەرخانەوەی هاوپەیوەندە بە ژێرخانەکەوەن، هەر دیاردەیەکی سەرخان بە شێوەیەکی راستەوخۆ هاوپەیوەند لەگەل ژێرخانی ئابووریی کەمەلگەدا لێکبدەینەوە؟ نەخێر. . . ئەمە نابێ، هۆیەکەشی ئەمەتە. بیروڕایەکی فەلسەفی و هونەری و ڕەوشتی و ئەوانی تر سەربەخۆییەکی رێژەییان هەیە، بۆ نموونە بەو مانایەی یەکیان کار لەویتریان دەکات. هەروا دەبێ دووری و نزیکی رێژەییان لە ژێرخانە ئابورییەکەوە لەبەرچاو بگیرێت. بۆ نموونە ناکرێ، گەشەسەندنی هونەری و واقیعی لە چەندان وولاتدا راستەوخۆ بدەینە پال ژێرخانە بۆرژوازەکە. چونکە هونەر دەکەوێتە بەر کارتێکردنی نەریتەکانی فۆلکلۆرو تەوژمەکانی بیری پێشکەوتنخواز لە ولاتانی جۆربەجۆرداو، زۆر شتی تریش. لێرەدا دواجار دەردەکەوێ کە ژێرخانی کۆمەلگە رۆلێکی سەرەکیی دیووە بەلام کاریگەرییەکەی لە هونەردا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ دەرکەوتووە:بەهۆی سیاسەت و ڕەوشت و فەلسەفەو بەهۆی تەواوی نەریتەکانی ئەو کۆمەلگەیەو مێژووی درێژییەوە. لێرەدا زۆر گرنگە ئەوەش بخەینە پێش چاو کەژێرخانی چینایەتی کۆمەلگە خۆیشی ناکۆکیی ناوخۆیی تێدایە. ئەم سروشتە ناکۆکەش لە سروشتی ناکۆکی سەرخانیشدا دیاری دەدا. بۆ نموونە: ژێرخانی سەرمایەداری تەنیا

دامەزراوەو ئایدۆلۆژیی بۆرژوازی بەرهەم نەهێناوەو بەس، بەڵکو لە هەلومەرجی باڵا دەستیی ئەم ژێرخانەشدایە کە هەروا ئایدۆلۆژی پرۆلیتاریا سەرهەڵدەدا.

ئەوەتا پرۆلیتاریا لە پێناو خەباتدا لە دژی دوژمنانی چینایەتی، جگە لە تیئۆری زانستانە کە مارکسیزمە، ڕێکخراوەکانیشی دادەمەزرێنێ:سەندیکاکان و کۆمەڵەکانی هەرەوەزی و حزبی و سیاسی و شتی وا. هەروا لای پرۆلیتاریا بنەماکانی ڕەوشت و ڕێوشوێنە سیاسی و ماف پەروەری و جوانناسیەکانی پەیدا دەبن.

سەربەخۆیی ڕێژەیی سەرخان لەمەشدا دەکەوێتە بەرچاو: کاتێك پاڵدەنێ بەخەڵکەوە بۆ کارکردن بە ڕێبازێکی دیاریکراودا، بەوکارە خۆی وا دەردەخات وەك هێزێکی کۆمەڵایەتی چالاك کە لە پەیدابوون و ژیان و پەرەسەندنی ژێرخاندا کاریگەریی دەبێ. بۆ نموونە، لەو کۆمەڵگەیەی لەسەر چەسانەوە دامەزراوە، بیروڕای باڵا دەست و دامەزراوەکانی لەمەوبەرو هێشتا یەکسان نەبوونی خەڵك لە باری ئابووری و سیاسی و ڕۆشنبیریداو چەوسانەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە دووپات دەکەنەوە. وێڕای ئەوەش زۆرداران لەمەوبەرو هێشتا ئەم بیروڕاو دامەزراوانە لە خەباتیاندا دژی کۆمەڵانی خەڵکی چەوساوە بەکاردێنن.

سەرخانی کۆمەڵگەی سوسیالیستیو پێش هەمموو شتێك هەردوو بەشە گرنگەکەی: دوڵەتی سۆسیالیستیو حزبی مارکسی کە ژیانی ئابووریو سیاسیو ڕۆشنبیریی گەل ڕێکدەخەن ڕۆڵێکی مەزن دەگێڕن



فەلسەفەی مارکسیزم

لە دامەزراندنی کۆمەڵگەی نوێداو لە خەباتدا لە پێناوی ئاشتیو ئازادی گەلاندا.

بەم جۆرە دەبینین کۆمەڵگە ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی ئاڵۆزە. یەکەم جار وادێت بە بیردا کە سیاسەتمەداران کاتێك بڕیار دەدەنو مەرسومەدەردەکەنو یادداشت دەنێرنو شتی لەم جۆرە دەکەن بە ئارەزووی خۆیان مێژوو دروستدەکەن، بەڵام ئەم ڕاستییانە لە یانی کۆمەڵگەدا هەموویان تەنیا ڕوکەشی دەرەوەی ئەوپروسانەن کە لەناو ناخو قووڵایدا پێکدێن. لە کۆمەڵگەی چەندان هێزی: مادیو فیکری تێکڕا دەلکێن، بەڵام ڕۆڵی ئەم هێزانە وەك یەك نین. لە ناو گشت ئەم هێزانەدا لە کۆمەڵگەدا تەنیا یەکێکیان بڕیار دەرن، هەر ئەوەیانە لە ئەنجامدا هەموو ئەوانەی تر، تەنانەت باڵاترین بوارەکانی ژیانی رووحی دیاری دەکات، ئەم هێزەش بەرهەمهێنانی خێروبێری مادییە. هەر ئەمیان کە لە ژیانی کۆمەڵگەدا ڕۆڵی ئەو هێزە دەبینێ کە دەبێتە هۆکاری گشت دیاردەکانی تر.





# بەشی سێیەم
# پێکهاتەی کۆمەڵایەتی چییە؟

بە پێچەوانەی زانا بۆرژوازییەکانی کۆمەڵایەتی کە بە شێوەی گشتی بایی کۆمەڵگەیان کردووە، مارکس هەڵوێستێکی هەستپێکراوی لە کۆمەڵگە پێشکەش کردو چەمکی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی خستە پلەی یەکەم. کۆمەڵگە بەهەموو لایەنەکانییەوە پلەیەکی دیاریکراوی پەرەسەندنی مێژووییدا: شێوازی بەرهەمهێنان و پەیوەندییەکانی خێزانی و بژێوی و ئاستی پێشکەوتنی زانست و سەرخان هەمووی پێی دەگوترێ پێکهاتەی کۆمەڵایەتی.

هێزە بەرهەمهێنەرەکان و پەیوەندییە بەرهەمهێنەرەکانی نێوان خەڵك وەك پەیکەری مادی کۆمەڵگەن. دامەزراوەی تایبەتیشی دەبن کە لە گەڵیاندا بگونجێن.

هەموو گەلانی دنیا وێڕای خاسییەتەکانی ڕێگەی پەرەسەندنی هەریەکەیان، بە گشتی یەك ڕێگەی مێژوویی دەبڕن.

گەلە سەرەتاییەکان تا ڕادەیەك لە ژیانێکی لێك پچڕاودا دەژیان. پەیوەندییەکانی نێوانیان سەقامگیرنەبوون و هەر هێندەبوون خێڵە دراوسێکان هاوپەیوەند بوون. تەنیا لە ڕۆژگاری دەرکەوتنی مێژووی ((نوسراودا))، پرۆسەی پەرەسەندنی بەرەبەرەی کۆمەڵگە ڕوخسارێکی جیهانگیری لە خۆگرت. خاسییەتی جیهانگیری مێژوویی کۆمەڵگەی







مرۆڤایەتی، پێش هەموو شت لەوەدا دەردەکەوێ کە گەلانی جیهان بە شێوەیەکی گشتی تاقە یەك ڕێگەی پەرەسەندن دەگرنەبەر، کە وێستگەکانی بریتیی دەبێ لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بە دیمەنە گشتی و تایبەتییەکانییەوە لە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیریدا.

بەدوای یەکدا هاتنی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان ڕەوتی گشتییان لە پەرەسەندنی مرۆڤایەتییدا پیشاندەدات. بەڵام گشت گەلان بەم پێکهاتانەدا تێپەرنەبوون. ئەمەش شتێکی ئاشکرایە، جا هەر چەندە هەموو گەلان بەم یان بەو ڕادەیە مێژوویان دروست کردووەو دروستدەکەن، بەڵام هەموویان لەیەك کاتدا بە دیار نەکەوتوون و لە ماوەیەکی یەکساندا نەژیاون، تەنانەت لە سەردەمی دورە پەرێزیدا گەلانی دێرین کە مێژوویەکی درێژیان هەموو، ئەو قۆناغانەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتییان بەگشتی بڕیوە. هەندێ گەلانی تر جۆرە پێکهاتەیەکیان بەخۆوە نەدیوە. بۆ نموونە هۆزەکانی ئەڵمانی وسلاڤی لە سیستەمی کۆموونی سەرەتاییەوە چوونە دەرەبەگایەتی و سەردەمی کۆیلایەتییان بوارد، بەشی زۆری گەلان لە سەرمایەداریدا دەژین و، گەلانی واش هەن کە هێشتا لە قۆناغی پەیوەندییەکانی کۆموونی سەرەتاییدا دەژین. جا هەر چەندە هەندێ لە گەلان لە پەرەسەندنیاندا گشت پێکهاتەکانیان نەبڕیوە، بەڵام ڕێگەی مێژوویی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی وا دیاری دەکرێ کە پێکهاتەکان یەکیان بەدوای ئەوی تریاندا دێن. تا لە ئەنجامدا هەموو گەلان دەگەنە

سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم، چونکە بەدوای یەکدا هاتنی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکان هەر دەگاتە ئەو ئەنجامە.

مێژووی جیهان بەروونی رێگەی مێژوویی بزوتنەوەی مرۆڤایەتیمان پیشاندەدات، لە پێکهاتەیەکی نزمەوە بۆ بەرەو ژوورتر بەرەو کۆمۆنیزم، وا بە چڕی باسی ئەم رێگەیە دەخەینە بەرچاو.

یەکەمین شێوازی کۆمەڵگە لە مێژوودا سیستەمی کۆموونی خێڵەکییە. ئەودەم ئامرازەکانی کارکردن زۆر سادە بوون: کوتەك، تەوری بەردین، چەقۆی بەردین، رم بە سەرەرمەوە لە بەرد یان ئێسقان و راوگەی درندەکان. پاشان تیرو کەوان دۆزرایەوە. کاری هاوبەشی ئەندامانی کۆمەڵەی سەرەتایی و هاوکاریکردنیان مەرجێکی پێویست بوو بۆ بەرهەمهێنانی ئامێرەکان و، پەیداکردنی پێداویستەکانی ژیان و کێشە لەگەڵ سروشتدا ئەم کارە هاوبەشە لەسەر بنچینەی موڵکایەتی بە کۆمەڵی هۆیەکانی بەرهەمهێنان بوو لەلایەن خەڵکە سەرەتاییەکەوە، هەر کەس بەپێی هێزو توانای کاری دەکردو لە خزمەت مەسەلە هاوبەشەکەدا بوو، بەم رێگەیەش لە خزمەت بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا، خەڵکەکەش بە یەکسانی لە بەرهەمهێنانی خێروبێری مادی سوودمەند دەبوون، بەدروستکردن و شارەزابوون لە ئامێرەکان و، بەئاسانکردنی کاری قورسیان و ئەمەش بووە یاریدەدەری پەرەسەندنی بەرهەم.

ئاستی زۆر نزمی پەرەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان و، شارەزایی کەمی خەڵك و، کەمی زانست لەسەر دنیای دەوروبەرو،







سادەیی ئامرازەکانی کارکردن — ئەمانە هەموویان تەنانەت لەوپەری حەماسەتی خەڵکەکەدا، شتێکی کەم زیاتری نەدا بەدەستەوە لە پێداویستەکانی ژیان، بە جۆرێك زۆر بە زەحمەت نەبێ نەیاندەتوانی مانەوەی خۆیان دابین بکەن و، هەمیشە لەسەر لێواری برسێتی بوون. شتێکی زیادەش نەبوو بتوانرێ لە بەرهەمهێنەرەکان بسێندرێ بۆ بەرژەوەندی ئەندامانی کەی کۆمەڵگە. لە هەلومەرجی ژیانێکی ئاوا نەبوونیدا بنەمای دابەشکردنی یەکسانی بەرهەمەکان کاری پێ دەکرا.

لە ناو کۆمۆنیشدا بەپێی کاریگەری نەریتەکان و رێوشوێنی رەوشت کە بەدرێژی چەندان سەدە پێکهاتبوون سیستەمێکی توندوتۆڵ لە کاردابوو، کە تا پلەیەکی پێویست لە پەیوەندییەکانی نێوان خەڵکدا لەسەری دەڕۆیشتن. دەسەڵات لە رژێمی کۆمۆنی سەرەتاییدا لەسەر هێزی ناوبانگی شەخسی و شارەزایی و زانست و لێهاتوویی و ئازایی هەریەك لە ئەندامانی کۆمۆنەکە دامەزرابوو. جا هەر چەندە رژێمی کۆمۆن دوور بوو لە هەندێ رەفتاری ناشرین کە لە پاشدا لە کۆمەڵە چەوسێنەرەکاندا بەدەرکەوتن، بەڵام بە شێوەیەکی داخدار بۆ ژیانی خەڵکەکە قورس بوون. هێندە بەسە بڵێین ئەودەم رێژەی تەمەن دەگەیشتە نزیکەی ١٨ ساڵ.

لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژگاردا بنچینەی رژێمی کۆمۆنی سەرەتایی داڕزی و ئەم رژێمەش گەیشتە قۆناغی هەڵوەشانەوە، هۆی لەناوچوونیشی هەر ئەو هۆیە بوو کە هێنایە کایەوە: واتە پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەم.

شارەزابوونی ئامێرەکانی کارکردن و وەرچەرخانی ئامێرەکانی بەردین و ئێسقان و تەختە بۆ ئامێری میتاڵ بووە هۆکاری پێشکەوتنێکی بنەڕەتی گەورە لە ڕێوشوێنی پەیداکردنی مەرجەکانی ژیتن. ئەمەش تا پلەیەکی گەورە بووە هۆی زۆرکردنی بەرهەمداریی کارو بەرینکردنی بواری خستنە کاری، هەر لەسەر بنچینەیی پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەممهێن شێوازی جۆربەجۆری دابەشکردنی کۆمەڵایەتی کارکردن پەیدا دەبێ، لە نێوان لقە جۆربەجۆرەکانی ئابووری نیشتمانیدا (وەك: ڕاوەشکار، ئاژەڵداری، کشتوکاڵ، پیشەگەری) لەناو هەر لقێکیشدا کار دابەشکردن دەکرێ و، بەرەبەرە زۆرتر پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان ئاڵۆز دەبن. خێڵ و هۆزەکانیش دابەش دەبن بە خێزانەکانەوە. هەر خێزانێکیش دەبێتە شانەیەکی سەربەخۆی ژیانی ئابووری. خەڵکەکە وایان لێهات زۆرتریان لە پێداویستی راستەوخۆیان بەرهەمدەهێنا، ئەم زۆرتری بەرهەمە بووە هۆی پەرەسەندنی ئاڵوگۆڕ، لە سەرەتادا لەنێوان هۆزەکاندا و پاشان لەناو هەر هۆزێکیشدا. ئیتر توانای ئەوە پەیدا بوو دەست بەسەر بەرهەمی ماندووبوونی کەسانی تردا بگیرێت. بەمە موڵکایەتی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنانی پەیدا دەبێ و، بەدوای دابەشبوونی پێشووتری کاردا کۆمەڵگەش دیسان دابەش دەبێ بەوانەوە کار دەکەن و کار ناکەن.

پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانیش لەم پلەیەی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا خاسییەتی پەیوەندییەکانی چینایەتی بەخۆوە دەگرێ،







هەموو ئەم پرۆسانەش لەناو کێشەیەکی هەمیشەیی و پێکدا هەڵپژانی نێوان چینە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگەدا ئەنجامدەدران، هێزە بەرهەمهێنەرەکانیش کەوتنە ناکۆکی لەگەڵ پەیوەندییە سەرەتاییەکانی بەرهەمهێناندا: سنووری تەنگەبەری کۆمۆنە دوورەپەرێزەکان بوونە کۆسپی پێگەیشتن و بەخۆدا هاتنی زۆرتری هێزەکانی بەرهەم. لە سایەی ئەم ناکۆکییەوە بوو رژێمی کۆیلایەتی جێگەی رژێمی کۆمۆنی سەرەتایی گرتەوە.

لە ناو رژێمی کۆیلایەتیدا کۆمەڵگە بە دوو چینی ناکۆك و دژ بەیەکەوە دابەشدەکرێ: چینی خاوەن کۆیلە و چینی کۆیلە. تایبەتمەندی ئەم رژێمەش لەوەدایە کە خاوەن کۆیلە تەنیا خاوەنی هۆیەکانی بەرهەمهێنان نییەو بەس، بەڵکو هەروا خاوەنی کارگەرانیشە – کە کۆیلەکانن. لەوەو بەر خەڵك پێکەوە کاریان دەکردو بە شێوەیەکی هاوبەش لە خێروبێری کەمی بەرهەمی کارەکەیان سوودمەند دەبوون. بەڵام ئێستا ئاستی ژیانی مادی بەرز بۆوە. دەژمنایەتیش خەڵکی لێك جودا کردەوە. مرۆڤی رەنجدەر زۆرتر دەستەڵاتیان بەسەر سروشتدا گرت و کەوتنە کۆیلایەتی مرۆڤی دیکەوە. کۆیلە نەدەبووە خاوەنی بەرهەمی خۆیی، خاوەنی ئەو شتانەش نەما کە بەرهەمی پێدەهێنان، وای لێهات تەنانەت خاوەنی خۆیشی نەبێت. مرۆڤ وەك ((ئاژەڵێکی قسەکەر))ی لێهات، ئەم ((ئاژەڵە قسەکەرە)) بە تەواوی بووە موڵکی خاوەنەکەی و هەر بەروبوومێکی بەرهەم بهێنایە دەبووە موڵکی ئاغای خاوەنی.

کۆیلەکەش هەر هێندەی پێدەبڕا کەپێی بژی.

سەرنجی ئەوەش درا کە بەرهەمداریی پەرەسەندووی کار بووە مایەی پەیدابوونی هەندێ بەرهەمی زیادەی کارکردن کە ئەمەش بووە بنچینەی مادی بۆ چەوساندنەوەی، بەلآم لەبەر ئەوە بەرهەمداریی کار خۆی لە خۆیدا نزم بوو، چەوسانەوەی کۆیلە شێوەیەکی زۆر سەخت و دڵڕەقانەی بەخۆوە گرت، ژیانی کۆیلە، هەروەك هزرمەندی رووس گیرتسن باسی دەکا، زنجیرەیەك ئازاربوو. بەدبەختی و ناخۆشی بێشکەی کۆیلەی رادەژەن و پەروەردەی دەکرد. ئەم بەخێوگە هەڵقرچاوە هاوڕێی هەمیشەیی تەواوی ژیانە کورتەکەی کۆیلە بوو.

بۆ پشتگیری دەسەلآتی خاوەن کۆیلەکان دەزگایەکی تایبەتی سەرکوتانەوەو زۆرداری پەیدا بوو کە ئەویش دەوڵەتە. لەیەك کاتداو لەگەڵ پەیدابوونی دەوڵەتدا یاسایەکان پەیدابوون – سیستەمی رێوشوێن و بنەمای چەسپاندنی خواستی خاوەن کۆیلەکان.

رێوشوێنی بەرهەمهێنان لە سەردەمی کۆیلایەتیدا، رێوشوێنێکی بەرزتر بوو لە باری مێژووییەوەو، قۆناغێکی بالآتر بوو لە پەرەسەندنی کۆمەڵگەدا، لە چاو رژێمی سەرەتاییدا، کۆیلایەتی یەکەمین هەنگاوی شارستانی بوو، کۆبوونەوەی هۆیەکانی بەرهەمهێنان و هێزەکانی کار لە ناو دەستی خاوەن کۆیلە گەورەکانداو لە دەستی دەوڵەتدا توانای پەیداکرد بۆ بنیاتنانی دامەزراوەکان کە لە سەردەمی کۆمۆنی سەرەتاییدا ئەوە لە توانادا نەبوو. کۆیلایەتی کاری







کردە سەربەرزبوونەوەی بەرهەمهێنانی شتومەك و کالآو بەربلاوکردنی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری و پشەگەری و بەمەش بازرگانی پەرەی سەند، وێڕای پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی ئالوگۆڕی کالآوپەیوەندی بواری دراو.

بە کۆششی کۆیلەکان ناوەندەکانی ژیانی ئابووری و سیاسی و رۆشنبیری دروست بوون:شارە دێرینەکانی دنیاو سیستەمی ئاودێری و پەرستگاو کۆشکەکان. گاسنی ئاسنین و ماشینی چنین خرانە کارەوە. جوتیاری و چاندنی سەوزەو رۆنەکان پەرەیان سەند، پرۆژەی ئیش و کاری دەستی – مانیفاکتۆرە بەدیار کەوت. هێندەی کە بۆ پەرەسەندنی بەرهەمهێنان پێویست بوو شارەزایی رەنجدەران و شێوازی کار رێکخستنیان پەرەی سەند. هەر کۆیلەکان بوون بە رێگەی بەرهەمهێنانی زیاتری بەروبووم و کالآ سامانێکی زۆر لە شارەکاندا کەڵەکە بوون وبوونە بنچینەیی مادی بۆ رۆشنبیری بەخۆدا هاتوو، بۆ توانای پەرەسەندنی زانست و هونەر. لەسەر حسابی چەوسانەوەی کۆیلەکان و رووتاندنەوەی ئازاری بێبەزەییان پێشکەوتنی مێژوویی هاتە دی. بینای رۆشنبیری و مادی و رووحی و مرۆڤایەتی بە ئارەقەو خوێن و ئێسك و پروسکی کۆیلەکان بەرز کرایەوە.

بەلآم شێوازی کۆیلایەتی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان کە توانایەکی گەورەتری بۆ پەرەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان خەڵقاند، لە قۆناغێکی دیاریکراودا وەرگەڕاو بووە دژەکەی:چونکە ئیتر کارکردن و شارەزایی بەکارهێنانی ئامێرەکان لە بەرژەوەندی

کۆیلەکاندا نەمان. نماکردنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان زۆر بەخاوی بەڕێوە دەچوو. کۆیلەکان لە بەکارهێنانی ئامێرە تازەکاندا بەرژەوەندییان نەبوو، هەستی ئەوان لە بەرانبەریاندا دوژمنانە بوو، ئیتر شێوازی کۆیلایەتی کارکردنی بەکەڵك نەمابوو. ڕژێمی کۆیلایەتی بەرەبەرە دەرزاز لەناو دەچوو، هەمان ئەو هێزەی کە هێنابووی کە ئەویش پەرەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەکانی کۆمەڵگەیە، لە مێژووی بەدەرنا. دوا جار ڕژێمی کۆیلایەتی، لەژێر زەبری شۆڕشی کۆیلەکان و پەلاماری خێڵەکانی تردا ڕووخاو ڕژێمێکی نوێ جێگەی گرتەوە کە ئەویش دەرەبەگی (فیودالی) بوو.







## کۆمەڵگەی دەرەبەگی

لە کۆمەڵگەی دەرەبەگیدا پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان لەسەر بنچینەی موڵکایەتی دەرەبەگی زەوی‌و زار پێکهات. موڵکایەتی تایبەتی ززەوی بنچینە بوو بۆ چەوسانەوەی جوتیاران، بەڵام جووتیار موڵگکایەتی تایبەتی تەواوی دەرەبەگ نەبوو. دەرەبەگ بۆی هەبوو جووتیار بکرێ‌و لێی بداو بیفرۆشێ، بەڵام مافی کوشتنی نەبوو. لە پاڵ موڵکایەتی دەرەبەگ و خاوەن خانووبەرەدا کە هۆیەکانی بەرهەمهێنانیان هەبوو جوتیارو پیشەگەرەکانیش موڵکایەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان‌و کێڵگەی تایبەتی خۆیان هەبوو، کە بە کۆششی خۆیان پەیدایان کردبوو، جووتیارانی وابەستە لەو سەردەمەدا، بە بەراورد لەگەڵ کۆیلەکاندا، لەبەرهەمداریی کار زۆرتر سوودمەند دەبوون چونکە بەشێکی کالاتەکە بۆ خۆیان کاریان دەکردو بۆ زۆربوونی بەرهەم هەوڵیاندەدا، لە کۆمەڵی دەرەبەگیدا پێشەگەری‌و بازرگانی پەرەسەندنێکی گەورەتریان بەخۆوە دی، پێشەگەری بەیەکجاری لە جووتیاری جیابووەوە. لە شارەکاندا وەرشەی کاری دەستی پەیدا بوون، لە سەردەمی دەرەبەگیدا پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنان زۆر زیاتر هاتە دی. گاسنی ئاسنین کشتوکاڵی فراوانتر کرد. کشتوکاڵی مێوو سەوزە لە پێشکەوتندا بەردەوام بوو. پیشەگەران چاکتر ئامرازی کاریان دروست دەکردو،

بەرەبەرە شارەزاتر بوونو لە کارەکانیاندا بوونە وەستای ڕاستەقینە. بەکارهێنانی میتاڵی لە ئابووریدا پتر بڵاوبۆوەو فرنی تواندنەوەی میتاڵ پەیدا بوو، قیبلەنما دۆزرایەوە کە ئەمەش بووە هۆی فراوانبوونی هاتوچۆی کەشتییەکان. هەروا چاپکردنی کتێب پەیدا بوو. یاسایەکانی دەرەبەگی، جیاوازیی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە نێوان خەڵکیدا چەسپاندو، دابەشی کردن بە چین و توێژەکانی – ئەشراف و، پیاوانی ئاین و، جوتیارو، بازرگان و ئەوانی ترەوە.

بەرەبەرە ئاستی پەرەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان لە کۆمەڵگەی دەرەبەگیدا گەیشتە قۆناغی کێشەو ناکۆکی لەگەڵ پەیوەندییە باوەکانی بەرهەمهێنانداو، ئەم شێوەیەی موڵکایەتی بەرەبەرە بەرهەمی پێوەند کرد، ئیتر لە بەرژەوەندیی جوتیارە وابەستەکان نەبوو بە خۆرایی بۆ ئاغا کار بکەن. دەرەبەگەکان تەواوی بەرهەمی زیادەی بەروبوومی بەرهەمداریی لاوازی کار یان لەبەکاربردن و کۆکردنەوەی شتومەکی پێویست و دەعوەت و ئاهەنگی دەستبڵاوانەو شتی وادا پەرت و بڵاودەکردەوەو بەراست و چەپدا دەیانخواردو لە بەشێکی زۆر کەمی داهاتەکەیان پتر بۆ فراوانکردنی بەرهەم خەرج نەدەکرد. ئەمانە هەمووی بوونە کۆسپی ڕێگەی پەرەسەندنی زۆرتری کۆمەڵگە.

لە هەناوی رژێمی دەرەبەگیدا سەرمایەی بازرگانی پەیدا دەبوو، هەنگاو بە هەنگاو شێوازێکی نوێی سەرمایەداری لە بەرهەمهێناندا دەخەملاً، بۆرژواز پێویستی بە ڕەنجدەرانی ئازاد بوو لە کۆت و







پەیوەندی کۆیلایەتی و موڵکایەتی. بۆیە بۆرژواز وەرشەی پێشەگەری و مەزنی ڕێکخست – مانیفاکتۆرە – کانی دامەزراند، بۆرژواز دوای ئەوەی هێزی ئابووریی گەورەو گەورەتری دەستکەوت و جەماوەری گەلی لە دەوری خۆی کۆکردەوە جوتیاران و خەڵکی رەش و رووتی شارەکان بەهاوکاری ئەو خەڵکە شۆڕشەکانی بەرپاکرد بۆ لە ناوبردنی پەیوەندییەکانی دەرەبەگی لە بەرهەمهێنانداو چەسپاندنی ڕژێمی سەرمایەداری.

## پێکهاتەی سەرمایەداری

ئـەم رژێمـە هەنـدێك خاسـییەتی هەیـە کـە ئەمانــەن: هێــزە بەرهەمهێنــەرەکان لەســەر بەرهــەمهێنانی زۆرو زەبەنــدو بــە ئــامێر دامەزراون، هۆیە سەرەکیەکانی بەرهەمهێنانی مـوڵکی بەشـێکی کـەمی کۆمەڵگـەن کـە سـەرمایەدارەکانن. بەشـی هـەرە مـەزنی کۆمەڵگـە لـە پۆرلیتارییــەکان و نیمــچە پۆرلیتارییــەکان پێکــدێن. ئەمانــەش لــە هۆیەکانی بەرهەمهێنان بێبەشن و ناچارن هێزی کاریان بفرۆشن و بە کۆششیان سامانی چینە دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵگە پەیدا بکـەن. بـەم جــۆرە بنــچینەیی ســەرمایەداری موڵکایــەتی تایبــەتی هۆیــەکانی بەرهەمهێنانەو چەسـاندنەوەی کـاری کرێگرتەیـەو، یاسـای سـەرەکیی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری پەیداکردن و دەستکەوتی زێدەباییە.

سـەرمایەداری کـە تینـوی قـازانج و کەڵەکەکردنــەو خــەریکی پێشبڕکێیو گشتی کردنـی بەرهـەمهێنانێکی یـەکجار زۆرە، بـەو کـارەی هانــدانی تــازەی بــۆ پەرەســەندنی هێــزە بەرهەمهێنــەرەکان ئاشــکرا کــــردوو، بەڕادەیــــەکی یــــەکجار زۆرتــــر زانــــستی هێنایــــە نــــاو بەرهەمهێنانەوە. سەرمایەداری کە حەزی لـە قـازانجێکی یـەکجار زۆرە پــارەو پــولێکی زۆر مــەزن لــە بەرهەمهێنانــدا دەخاتــە کــارەوە، بــە مەبەستی فراوانکردن و باشترکردنی بەرهەمەکان.

مارکس و ئەنگلس لە مانیفێستی پارتی کۆمۆنیستیدا نوسیوویانە





فەلسەفەی مارکسیزم

دەڵــێن: ((بــۆرژواز لەوکاتــەوە دەســەڵاتی ســەپاندووەو ســەدەیەکی بەسەردا تێپەڕ نەبووە، توانیویەتی هێزی بەرهەمهێنی ئـەوتۆ دروست بکات کە لە ژمارەو مەزنییەکەیدا لەوە زۆرترە کە لە تەواوی نـەوەکانی پێشوودا پێکەوە دروستیات کردووە، جڵەوگیرکردنی هێزەکانی سروشت و، بـەکارهێنانی ئامێرەکـان و، پـەیڕەوکردنی کیمیـا لـە پیـشەسازی و کــشتوکاڵداو، پاشــان کەشــتییەوانیی بــە هــەڵم و هێڵــی ئاســنین و تەلــەگرافی کارەبــایی و، ئــەو هــەموو کیــشوەرانەی زەوی و زاری نەکێڵرابوون و کرانە زەوی وزاری کشتوکاڵی و، ئەو رووبـارو کەناڵانـەی چاکران و کەشتییەکان پێیاندا تێپەڕ دەبن و، ئەم گەلانەی وا پێدەچن وەك هێزێکی جـادویی لـەناو قـووڵایی زەوییـەوە دەری پەڕانـدبن، کام سەردەمی رابوردوو، کام نەوەی پێشوو بە خەویش دەیانبینی کە هێزی بەرهەمهێنی ئاوا مەزن لەناو جەرگەی کاری کۆمەڵایەتیدا شاردراونەوە !)) [*] بـەڵام هـەموو ئەمانـە لەسـەر حیسابی زۆرداریـیـەکی سـەخت لـە کۆمەڵانی خەڵکی رەنجدەرو سەرکوتانەو لەناوبردنی چەندان گـەل بـە تەواوی، دروستکراون، ئاشکرایە تەنیا لەکیشوەری ئەفریقاوە بە دەیان ملیۆن زەنگی بۆپشت ئوقیانوس بە کێش کران.

خاســیەتە هەمیــشەیەکانی ســەرمایەداری ئەمانــەن: پەشــێوی

---

[*] کارل مارکس و فریدریك ئەنگلس((مانیفێستی پارتی کۆمۆنیست)) چاپی کوردی

بەرهەمهێنان، تەنگوچەڵەمەو قەیرانی بەرەودوا، بێکاری درێژخایەن، کلۆڵیو بەدبەختی جەماوەر، پێشبڕکێیو، جەنگەکان، ناکۆکی سەرەکی سەرمایەداری ناکوکییە لە نیوان خاسییە تی کومە لآیەتیی کاروشێوەی سەرمایەدارانەی موڵکایەتیدا کە ئەمەش لەخەباتی چینایەتیی پرولیتاریادا لە دژی بۆرژوا ڕەنگدەداتەوە.

لە روژگاری ئیمپریالیزمدا، تەواوی ناکوکییەکانی کومەلگەی سەرمایەداری دەگەنە ئەوپەری توندوتیژی، پێش هەمووشیان ناکوکییەکانی نیوان کاروسەرمایە، نێوان دەوڵەتانی ژێر دەستەو دەوڵەتانی ئیمپریالیزم.

پەیوەندییە بەرهەمهێنەرەکانی بۆرژوا، ئیتر لەگەڵ ئاستی پەرەسەندنی هیزەکانی بەرهەمهێناندا ڕێك کەوتن وپەکی پەرەسەندنی ئەو هێزانە دەخەن رۆشنترین نموونەش بۆئەم ناکۆکییە پێکەوە نەگونجانی هەمیشەییە لە نیوان هینانە بازاری کالآو داواکاریدا: لەلایەکەوە شتومەك وکالای زۆردەخرێتە بازاڕولەلایەکیش خەلکەکە توانای کڕینیان لاوازە. ئەنجامی ئەمەش دیاردەیەکی نائاساییە وەك برسیتی جەماوەرو نەبوونییەتی لەناو زۆریی شتومەك وکالآدا. سێلاوی ئەو هەموو کالآیە لە توانایدا نییە نەبوونی و برسێتی رامالێت، چونکە ڕێگەی گەیشتنە کۆمەلآنی خەلکیان بە بەربەستەی موڵکایەتی تایبەتی تەنراوە. خاوەن کالآکان ئەوەیان پێ باشترە لە دەریادا نوقمیان بکەن یان بیانکەنە خوراکی ئاگر، یاخود لێیانگەڕێن بۆگەن وخراپ بن، نەك نرخەکانیان بێنە خوارەوە. کاریان بەوەنیەو







گوێ نادەنێ سەدان ملیۆن، بەتایبەتی لە ولآتە دواکەوتووەکاندابرسی بن.

هۆی ئەم دیاردە دزێوانەش ئەوەتا بەرهەم ودابەشکردن لە سێبەری سەرمایەداریدا بە پێی داخوازیی کۆمەڵگە دیاری ناکرێن بەڵکو بەرژەوەندیی چاوچنۆکانەی سەرمایەداران دیارییان دەکەن، نەك پێداویستیەکانی گەل، بەڵکو قازانج بەدەستکەوتنی دەوڵەمەندان. موڵکایەتی تایبەتی دەرفەتی ژیان ناداتە کۆمەلآنی فراوانی خەڵکی رەنجدەر وەك ئەوەندەی دەیتوانی لەم ئاستەدا بژی کەپەرەسەندنی بەرهەم پێی گەیشتووە.

پێشکەوتنی تەکنەلۆژیش ئەگەرچی بەردەوام دەبێ بەلآم رادەی پێشکەوتنەکەی بەهیچ جۆرێك بەشێوەیەك نییە کە لە ئاستی ئێستای هێزە بەرهەمهێنەکاندا لەتوانادایە. ڕەوتی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی یارمەتیدەر نییە بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی مرۆڤایەتیو هەروا بەرە بەرە زۆرتر هەوڵ وکۆششی مرۆڤ بۆ پەیداکردنی هۆکارەکانی وێرانکاری، لەپێناو خۆئامادەکردن بۆ جەنگێکی نوێ بەکاردەهێنرێ. ئەمەش مانای ئەوەیە رژێمی سەرمایەداری خوی تەواوکردووە. کاتێکیش سەرنجی تەواوی رژێمی سەرمایەداریی جیهان دەدەین بەئاشکرا بۆگەنکردنی سەرمایەداری دەردەکەوی، ئەوەتە ئاستی بەرزی پەرەسەندنیبەرهەم لەچەند ولآتێکی کەمدا لەسەرحیسابی چەوساندنەوەی بەشی هەرە زۆری ولآتانی دنیا دەستخراوە، پێش هەمووی لەسەر حیسابی ولآتانی ژێردەستەو نێو ژێردەستە.

یەکێکیش لە خراپە هەرە گەورەکانی ئیمپریالیزم بۆ زۆربەی گەلان جیاوازیی گەورەو بەرچاوە لەئاستی پەرەسەندنی مەترۆپۆلەکان و وڵاتە ژێردەستەکاندا.

هێزە بەرهەمهێنەرەکانی کۆمەڵگەکانی ئەم سەردەمە چاویان بڕیوەتە رزگاربوون لەکۆت وپێوەندەکانی ئابووری سەرمایەداری. ئاشکرایە بۆرژوای قۆرخکار(مۆنۆپۆل)هەموو هێزوتوانای خۆی خستۆتە کار بۆ رزگارکردنی ڕژێمی سەرمایە داری، بەلاّم تواناشی نییە بەربەستی شتێك بکات کە هەردەبێ رووبدات.

سەرمایە داری وەك ئەو جادوگەرەی لێهاتووە کە هێزی هێندە مەزنی بەدوعای جادوگەرانەی هێناوە بە ڕادەیەك کە ئیتر خۆیشی بۆی ناکرێ دەستەلاّتی بەسەردا بگرێ، لەباری سەرنجی پێشکەوتنی ئایندەی کومەلگەوە لەناوبردنی سەرمایەداری نەك تەنیا کارێکی حەزلێکراوەو بەس، بەڵکو لەرووی ئابوریشەوە کارێکی حەتمییە، شەپۆلەکانی خەباتی چینایەتیو نیشتمانی، وێڕای هەموو شکستییەك، ساڵ لە دوای لە بەرزبونەوەدان و، هێزنییە بتوانێ تاسەر ڕێگە لە ئاوابوونی رژێمی سەرمایەداری بگرێت و، سەردەمیگواستنەوە لە سەرمایەدارییەوە بۆ کۆمۆنیزم دادێ.







## پێکهاتەی کۆمۆنیستی

لەناو تانوپۆی سەرمایەداریدا مەرجە مادییە پێداویستیەکان پەیدابوونی پێکهاتەی کۆمۆنیستی کەڵەکە دەبن، لە پێش چەسپاندنی تەواویی کۆمۆنیزمیدا قۆناغی دامەزراندنەکەی دێتەکایەوە کە دەشێ درێژبێت ولە ڕەوتەکەشیدا ئاڵوگۆڕی ئابووری وپەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکان وسیاسی وبیری ڕۆشنبیری پێکدێنن، قۆناغە مێژووییەکەی لە بوارێکی ڕۆشندا دەست پێدەکات، هەروەك چۆن لە یەکێتی سۆڤیەت روویدا:لە شۆڕشی سۆسیالیستی وڕاگەیاندنی دیکتاتۆری پرۆلیتاریاوە، پاشان لە پەرەسەندنیدا زنجیرە قۆناغێکی تێپەڕاند) . قۆناغی یەکەمی ماوەی گواستنەوەیە لە سەرمایەدارییەوە بۆ سۆسیالیزم) . ئەم قۆناغە بە بنیاتنانی پلەی یەکەمی پێکهاتەی کۆمۆنیستی کۆتایی دێت کە ئەویش سۆسیالیزمە.

لەسۆسیالیزمدا دووشێوەی موڵکایەتی کۆمەلاّیەتی هەیە: موڵکایەتی دەوڵەت، واتەموڵکایەتی گشت گەل ودەوڵەتی سۆسیالیستی و، موڵکایەتی هەرەوەزییکۆڵخۆزی، واتە موڵکایەتی کۆڵخۆزە تەنیاکان، یان یەکە هەرەوەزییەکان. ئەم دوو شێوەیەی موڵکایەتی سروشتێکی سۆسیالیستیان هەیە. شێوەی سەرەکییان موڵکایەتی دەوڵەتە. لێرەدا هەموو چەشنە چەوسانەوەیەکی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤەوە نامێنێ، ئەمەش بە هۆی نەمانی چینە زۆردارەکانەوە،

پەیوەندییەکانی چینایەتی بەردەوام خاسیەتی هاوکاری و کۆمەکی توندیان دەبێ و، لەسەر بنەمای موڵکایەتی سۆسیالیستی بڕوای سۆسیالیستانە لە دابەشکردندا جێگیر دەبێ: ((لە هەر کەس بە پێی توانای وبۆهەر کەس بە پێی کارەکەی))

هەروا شۆڕشی ڕۆشنبیری دێتە دی ولە ئەنجامی ئەمەشدا ئایدیۆلۆژیی سۆسیالیستی دەبێتە بەربلاّوو دەسەلاّتدارلە کۆمەڵگەی سۆسیالیستیدا.

سۆسیالیزم هۆکارەکانی پەرەپێدانی بەرهەم ناهێڵێت، وەك راکردن بە دوای قازانجی سەرمایەداریداو پێشبڕکێ، بەلاّم هۆکاری تازەی زۆر بەهێزتر بۆ پەرەپێدانی بەرهەم دەخوڵقێنێ، لەسۆسیالیزمدا هەموو خەلچکی بۆ کۆمەڵگە، واتە بۆ خۆیان، کار دەکەن و ئاوها کارێکیش زۆرتر بەرهەمدار دەبێ. ڕەنجدەرانیش لە بەکارهێنانی فراوانی مەکینەو ئامێرەکان زۆرتر سوودمەند دەبن و پتر شارەزای بەکارهێنانیان دەبن ولە گشت جۆرەکانی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان شارەزا دەبن وئاستی پسپۆڕیی خۆیان بەرزدەکەنەوە، بەرژەوەندیی کۆمەڵگە لە بواری بەرزکردنەوەی بەرهەمهێنەریی کاردا بەرێکوپێکی یەکدەگرن لەگەڵ بەرژەوەندی شەخسیی ڕەنجدەراندا کە ئەمیشیان لەباوەڕی سۆسیالیستییە و سەبارەت بەدابەشکردنی بەپێی کارکردن دێتە کایەوە، هەروا پارەدان بەگوێرەی کۆشش ڕێگە ئاوالّەدەکاتەوە بۆپیادەکردنی باوەڕی بەرژەوەندیی مادی خەڵك لەئەنجامی کارەکەیاندا، بەپێی کەڵکی مادیی خەڵکەکە لەسەر ئەوە





ڕادێن کەبەهەموو توانایان کاربکەن وئەمەش دەبێتە یاریدەدەر بۆ پەرەپێدانی پاڵپێوەنەرە ڕەوشتییەکانی بۆکارکردن، کۆکردنەوەی بەرژەوەندیی مادی وهۆکارە ڕەوشتییەکانی کارکردن پێکەوە، بەرجەستەبوونی رۆشنی خۆیان لە پێشبڕکێی سۆسیالیستیدا دەبیننەوە.

لەگەڵ، مەرجی سۆسیالیستیدادابەشکردنێکی ژیرانەی بەرهەم و پەرەپێدانی زانستانەی گشت بوارەکانی ئابووریی‌نیشتیمانی بە پێی پلان دارشتن ئەنجام دەدرێن.

پەرەسەندنی کۆمەڵگەی سۆسیالیستی لە ڕێگەدا بەرەو پلەی بالاّتری کۆمۆنیزم بە چەشنێکی سروشتی دەڕوات. کۆمۆنیزم لە سۆسیالیزمەوە پەیدادەبێ وەك درێژەپێدانێکی ئاساییانەی وپەرەسەندن وبەخۆداهاتنێکی زۆر لەڕوخسارولایەنەکانی. ئەمەش شتێکی روونە:هەردوو قۆناغەکەی‌پێکهاتەی کۆمۆنیزم یەك سیستەم پێکدێنن کەلەسەر موڵکایەتی کۆمەلاّیەتیی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دامەزراوە. هەربەم مانایەش باوەڕە گشتییەکانی سۆسیالیزم وکۆمونیزم دیاری دەکرێن. گواستنەوە لەسۆسیالیزمەوە بۆ کۆمونیزم پرۆسەیەکی مێژوویی پێویستە وناکرێ بە زۆروستەم لێی لابدرێ‌و خۆی لێ دووربخرێتەوە، خێرایی‌و پەلە پروزەش لەم بوارەدا دەبێتە هۆی گرانتربوون ودواخستنی بزووتنەوە بەرەو کۆمونیزم. ڕەنگە ئەنجامی زۆرخراپیشیان لێ بووەشێتەوە، بەتایبەتی هەوڵدان بۆبازدان بەسەر قۆناغی سۆسیالیستیدا بەرێگەی هەرجۆرە کاروبارێکی





سازدراوی بەپەلە، پشتگوێ خستنی یاساکانی بابەتیی گواستنەوە لە سۆسیالیزمەوە بۆکۆمونیزم دەبێتە مایەی یەکخستنێکی جیدی گشت دەزگا کۆمەڵایەتیەکە، بۆنموونە ناکرێ لەرێگەی دابەشکردنی بەیەکسانی گواستنەوە بۆکۆمونیزم پێك بێت، گواستنەوە واپێویست دەکات بنکەیەکی مادی وتەکنەلۆژیی مەزن دابمەزرێ کە بتوانێ خێروبێرێکی مادی یەکجار زۆر بەرهەم بێنێت وبتوانێت خەڵکەکە وافێربکات کە بەشێوازێکی کۆمونیستانە بژین وکاربکەن، کۆمونیستی یەکسانی نییە لەهەژاریدا بەتکوبەرزترین پلەی یەکسانییە لەخۆشگوزەرانی ولە ئازادی تەواوی پەرەسەندنی کەسایەتیدا لەگشت بوارەکانی ژیان.

لەناوهەناوی سۆسیالیزمدا چرۆکانی کۆمونیزم دەردەکەون، ئالێرەشەوە بەخاسێتێکی دیکەی پرۆسەی گواستنەوە لەسۆسیالیزمەوە بۆکۆمونیزم: لەکاتێکدا سیاسەتی حزب ودەوڵەت راست ودروست بن گواستنەوەکە بەبێ کێشەو ناکۆکی نێوان چین وتوێژە کۆمەڵایەتییەکان پێکدێت، ئەمەش لەسەر بنچینەی هاوکاریی توندوتۆڵ ویەکێتییان، ئەمەش کارێکە لەتوانادایە، چونکە هەموو چین وتوێژە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای سۆسیالیستی وەکو یەك لەگواستنەوە بۆکۆمونیستی سوودمەند دەبن.

نیشانی کۆمەڵگەی کۆمۆنیستی کارێکی لە خۆڕا نییە، بەڵکو پرۆسەیەکی ئاڕاستەکراووڕێکوپێکە، ئەم پرۆسەیە لە ژێرسەرکردەیی حزبێکی مارکسی_لینینیدا بەڕێوەدەچێ.







بەرهەمهێنانی بەها مادییەکانە بنچینەی کۆمەڵگە پێکدەهێنی. لە بەر ئەوە گرنگترین ئەرکەکانیبنیاتنانی کۆمۆنیزم دامەزراندنی بنکەی مادی وتەکنەلۆژیکۆمەڵگەی نوێیە. ئەرکی دووەم لەڕووی کۆمەڵدا لە پرۆسەی بنیاتنانی کۆمۆنیزمدا پێکهێنانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمۆنیستییە، ئەرکی سێیەمیش پەروەردەکردنی مرۆڤی نوێیە، ئەم ئەرکانە زۆر بەتوندی پێکەوەلکاون ولە یەك کاتدا ئەنجام دەدرێن،

دامەزراندنی بنکەی مادی وتەکنەلۆژی کۆمۆنیزم کارەبادارکردنی گشتیی وتەواوی هەموو وڵات دەکاتە پێویست ودەبێ لەبەرهەمهێناندا مەکینە بە کارهێنانی تەواوی وئۆتۆماتیکی کردنی بەرهەمهێنان و پەیڕەوکردنی کیمیا لەئابووریی نیشتیمانیدا بە فراوانی زۆر پێویستن:وێڕای پەیداکردنی کەرەستەی نوێ ویەکخستنی زانست وبەرهەم لە بنەڕەتەوە وبەکارهێنانی ژیرانەی گشت ئەو کەرەستانەی هەن وئاستێکی بەرزی ڕۆشنبیریی تەکنەلۆژی لای ڕەنجدەران و زیاترکردنێکی بێ نموونەی بەرهەمهێنەری کار. بۆ دامەزراندنی بنکەی مادی و تەکنەلۆژی کۆمۆنیزم شۆڕشێکی تەکنەلۆژی لەبواری کشتوکاڵیشدا پێویستە، ئەم شۆڕشەیە دەتوانێ کاری کشتوکاڵی لەڕووی بەرهەمهێنەری وهەلومەرج وخاسییەتەکانییەوە بکاتەچەشنە کارێکیپیشەسازی. هەر ئەمەشە کلیلی چارەسەرکردنی مەسەلەکانی پەرەپێدانی موڵکایەتی هەرەوەزی تا ڕادەی تێکەڵ بوونی بەموڵکایەتیی تەواوی گەل.

بڵاوكردنەوەی مەكینە وئۆتۆماتیكی لە بەرهەمهێناندا خاسییەتێكی داهێنەرانەی زۆرتر دەدەنە كاركردن، ئەم بنچینەیەشە كاری مێشك وكاری بازو وەك پرۆسەیەك لێك نزیك دەبنەوە وهیچ سنوورێكیان لە نێواندا نامێنێ.

كاركردن لە سێبەری كۆمۆنیزمیدا وەك ئەركێك نامێنێتەوە، بەڵكو دەگۆڕدرێ بۆ پێداویستێكی مرۆڤ ودەبێتە سەرچاوەیەكی خۆشییەكانی ژیاە. هەر ئەمەشە دەسكەوتێكی مەزن دەداتە كۆمەڵگەو دەبێتە هۆكارێكی گەورە بۆپێشكەوتنی كۆمەڵایەتی زۆرتر.

زالبوونی تەواو بەسەر جیاوازییە كۆمەڵایەتی وئابووری ورۆشنبیرییەكان وژیانی شارو لادێداوپێكرا لكانی هەردووشێوازی موڵكایەتی سۆسیالیستی لە یەك موڵكایەتی كۆمۆنیستیدا دەبنە هۆی نەمانی هەر دوو چینی كرێكاران وجووتیاران. ڕەنجدەرانی بازو لە ئاستیرۆشنبیریتەكنەلۆژییاندا بۆ ئاستی ڕەنجدەرانی مێشك بەرزدەبنەوە. لە كۆمەڵگەی كۆمۆنیستیدا یەكسانی كۆمەڵایەتیتەواوی بۆ گشت ئەندامەكانی كۆمەڵگە دێتەدی و هەلومەرجی یەكسانی لە كاركردن وژیاندا بۆ هەموو ڕەنجدەرانی شارو لادێ دێتە دی.

لەگەڵ پەرەسەندنی هێزەكانی بەرهەمهێنان وزۆربوونی بەرهەمهێنانی سامانەكانی مادی وڕووحی ولەسەر بنچینەی موڵكایەتی بە كۆمەڵدا، دابەشكردنی خێروبێری مادیش پەرەدەستێنێ وبەخۆدادێ، ئەو دەم كۆمۆنیزم تەنیا هەندێكخێروبێری مادی ناداتە خەڵك كە بژێوێكی باشیان بۆ دابین بكات وبەس، بەڵكو شێوازێكی







نوێی دابەشكردن دێنێتە ناو، بە پێی باوەڕی لە خەر كەسێك بەپێی توانای وبۆ هەر كەسێك بە پێی پێویستییەكانی.

ئەمەش مانای ئەوەیە كە هەر كەسێك هەرچییەكی پێویست بێ لە كۆمەڵگە وەریدەگرێت، ئەم شێوە دابەشكردنەش باشترین هەلومەرجی پەرەسەندنی هێزی سەرەكییبەرهەمهێنان دادەهێنێ كە ئەویش مرۆڤ خۆیەتی، بەم كارەش پێگەیشتنێكی خێراو بەردەوامی بەرهەمهێنانی كۆمەڵایەتی مسۆگەر دەكات.

مارکسیزم_لینینیزم ئەو بیروڕایانە دەداتە دواوە كە پێگەیشتن وخۆشگوزەرانیی ڕەنجدەران وهەبوون ببێتە مایەی ژیانەوەی ڕەوشت وداب ونەریتی كۆمەڵگەی بۆرژوازی.

شان بە شانی ئەوەی كە كۆمەڵگە زۆرتر پێداویستییە مادییەكان، لەسایەی پەرەسەندنی هێزەكانی بەرهەمهێنانەوە، بۆ هەموو ئەندامانی دابین بكات، سەنگینی چلۆنایەتی ڕۆشنبیرییەكانیش پەرەدەستێنێ: دەستكەوتنی زانیاریی زۆر بەرینترو چێژوەرگرتن لە هونەر، شتی وا. دەستكەوتنی پەرەسەندن وكاتێكی بێ كاریزۆرتربۆخەڵك مسۆگەر دەكات وهەروا فێربوونی زۆر بەرینتر توانایزۆرتریان دەداتێ بۆپەرەسەندنیان لە گشت لایەنێكەوەوبۆئارەزووی داهێنەرانە وگەشانەوەی تواناكانیان. .

كۆمۆنیزم پێكهاتەیەكی كۆمەڵایەتیی باڵاترە. هەموو پەرەسەندنێكی ئایندەی كۆمەڵگە لە سێبەری كۆمۆنیزمیدا دێتەدی، كۆمۆنیزم هەرچی پێویست بێ بۆپەرەسەندنی كەسایەتیی مرۆڤ

دەستی دەخات، لەسەر کۆمۆنیزمە ئەرکێکی مێژوویی بێنێتەدی:ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لە زۆروجەوری کۆمەلایەتی و، لە هەموو چەوساندنەوەو ڕووتاندنەوەیەك، لەبەسەرهاتی شەڕەکان و، بۆچەسپاندنی ئاشتی وکارو ئازادی ودادپەروەری وبەختیاریی گشت گەلانی سەر زەوی.

ئالێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامگیرییە کەپێکهاتەی کۆمۆنیزم ئەوەیە گشت گەلان خەوی پێوە دەبینن، هەر خۆیەتی دوا ڕۆژی بەختیاریی گەلان.







# بەشی چوارەم

## چینە کۆمەڵایەتییەکان و خەباتی چینایە تی

### چینی کۆمەڵایەتی چییە؟

لەکاتی پەیدابوونی سیستەمی کۆیلایەتییەوە تا ئەم ڕۆژگارەمان کۆمەلگە لە کۆمەڵەخەڵکێکی گەورە پێکدێت کە بەشێوەیەکی جەوهەری لێکتر جیاوازن. بنچینەی ئابووری بۆ دابەشبوونی کۆمەلگە بە چەند چینی ناکۆکەوە، موڵکایەتی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنانە، هەرئەمەشە سەرچاوەی ئەوەن کە هەندێك چین دەسەلاتدارو هەندێکیان چەوساوەن، هەندێکیان چەوسێنەرو هەندێکیان چەوساوەن، چەشنی موڵکایەتییەکە کە ڕێوشوێن وکەم وزۆریی داهات دیاری دەکات، پەیوەندی بە ئامرازەکانی بەرهەمهێنانەوە یەکەمین پەیوەندییە بۆ جیاوازییە چینایەتییەکان، بەلام پەیوەندییەکانی دیکو لەمەوە پەیدا بوون، چینەکانیش لە شێوەی ژیانیاندا ولە هەلومەرجی گوزەرانیان وبەرژەوەندی وئامانجەکانیان ولە بیروڕای سیاسییان ولە خاسییەتەکانی ڕەوشتیاندا لێك جیاوازن. لەسەرئەم بنچینەیەش وتەی ئەو وتەبێژە ڕاستە کە گوتوویە:لە کوختەکاندا بەشێوەیەك بیردەکەنەوە کە لە شێوەی بیرکردنەوەی ناوکۆشکەکان جیاوازە.

هەڵوێستی مارکسییانە لە تێگەیشتنی نیشانە سەرەکییەکانی دابەشبوونی چینایەتی کۆمەلگە لەسەر تێگەیشتنی مادیی پرۆسەو

دیاردەکانی پەرەسەندنی کۆمەلآیەتی دامەزراوە.

چینەکانیش هەروەك لێنین پێناسەی کردوون بریتین لە:

((کۆمەڵە خەڵکی فراوان، کە بە پێی شوێنیان لەسیستەمی بەرهەمهێنانی کۆمەلآیەتیدا دەناسرێتەوە، کە لە ڕووی مێژووییەوە دیاری کراوە، هەروا بە پەیوەندییان لەگەڵ ئامرازەکانی بەرهەم(کەزۆرجار بە یاسا دیاریکراون وچەوسێندراون)هەروا بە پێی دەورگێڕانیان لە ڕێکخستنی کۆمەلآیەتیی کارکردنداو، دواجار بەڕێگەی پەیداکردنی سامانە کۆمەلآیەتییەکان وبەشیان لەم سامانانەدا)) *

جا بابزانین هۆکارەکانی پەیدابوونی چینەکان لە کۆمەڵگادا کامانەن؟

لەکۆمەڵگای کۆمونی سەرەتاییدا چینەکان نەبوون. لەسەردەمی هەڵوەشاندنەوەی ئەوکۆمەڵگایەدا پەیدابوون. پێشینەی گشتی دابەشبوونی کۆمەڵگە بە چینەکانەوە ئەوەتا هێزەکانی بەرهەمهێنەر پەرەیانسەندووە، وەك لەمەوبەریش باسمان کرد خەڵکی لەماوەیەکی دیاریکراوی مێژوویاندا پترلەوەی ڕاستەوخۆ بەکاری دەبەن بەرهەمی دێنن. هەرئەمەش بوو توانای ئابووری مسۆگەرکرد بۆئەوەی هەندێ

* مۆسکۆ ل ٦١٢ – ٦١٣ *لینین((مارکس، ئەنگلس و، مارکسیزم)) چاپی عەرەبی







کەس لەسەرحسابی کۆششی کەسانی ترابژین، پەیدابوونی موڵکایەتی تایبەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان یەکەمین هۆی سەرەکییە بۆپەیدابوونی چینەکان.

پەیدابوونی چینەکانیش بەتوندی بەستراوەتەوە بە دەرکەوتن وپەرەسەندنی دابەشبوونی کۆمەلآیەتیی کارکردن. یەکەمین دابەشکردنی کۆمەلآیەتی گەورەی کارکردن لەوەدا دەرکەوت کە خێڵەکانی ئاژەڵ لەوەڕاندن لەجەماوەری گشتی خێڵەکان جیابوونەوە، ئەمەش بووە هۆی دیارکەوتنی ئاڵوگۆڕ لەنێوان شوانکارەو جوتیارەکاندا، کەئەمەش بووەیاریدەدەری زۆربوونی سامانی کۆمەلآیەتیو دابەشبوونی چینایەتی خەڵکەکە.

دووەمین دابەشبوونی کۆمەلآیەتی کارجیابوونەوەی پیشەبوو لەجوتیاریو ئەمەش بمپلەیەکی گەورەتر بووە هۆی پەرەسەندنی ئاڵوگۆڕو زیاتر جیاوازیی ئابووری ناوخەڵکەکە.

دابەشبوونی دواتری کار لەوەدا دەرکەوت کەکاری مێشك لەکاری بازووجیابۆوە. کۆششی مێشك وبیر بەرێوە بردنی بەرهەم وکاروباری دەوڵەت وئەرکەکانی پەرستنی ئایینیو کاروباری زانست وهونەرو فەلسەفەو شتی وا. کاری بازووش بوو بەشی زۆربەی هەرە زۆری زۆرلێکراوان.

چینە کۆمەلآیەتییەکانیش دابەش دەبن بەسەرەکیو دووەمینەوە چینە سەرەکییەکان ئەوانەن کە ژیان ڕێگەیەکی تایبەتی بۆ بەرهەمهێنان فیچرکردوون وئەوان جێبەجێی دەکەن، چینە

سەرەكییەكانی كۆمەڵگای كۆیلایەتی كۆیلەو خاوەن كۆیلەبوون و، لەسیستەمی دەرەبەگیدا دەرەبەگ وجوتیارو لەسیستەمی بۆرژوازیدا سەرمایەدارو كرێكاران چینی سەرەكی بوون. بەمجۆرە چینە سەرەكییەكان لەپێكهاتەی رەنجمژیدا ئەوچینانەن كە یەكێكیان خاوەنی ئامرازەكانی بەرهەمهێنان وئەوی تریان لەومولكایەتییە بێبەشن و ئەمانەیان جەماوەری سەرەكیی چەوساوەكانن، پەیوەندییەكانی نێوان ئەم چینە دوژمنانەو هەمیشە ناكۆكن وشێوە سەرەكییەكانی چەوسانەوەو كۆیلایەتی دەردەبڕن.

كۆیلایەتی لەباری مێژووییەوە یەكەمین شێوازی چەوسانەوەیە. دوای كۆیلایەتی جوتیاری نیمچە كۆیلەی سەردەمی دەرەبەگی دێت و لە كۆمەڵگای بۆرژوادا كاری كرێگرتەیە، ئەم سێ شێوازە مێژووییەی چەوسانەوە تایبەتی بەهەر سێ پێكهاتە چینایەتییەكەوە، ئەمانە لە بارەی جۆری چەوسانەوەو شوێنی راستەوخۆی بەرهەمهێنەری خێروبێری مادی لە كۆمەڵگەدا لێك جیاوازن بۆ نموونە كرێكار لە كۆمەڵگەی بۆرژوادا ئامرازەكانی بەرهەمهێنانی نییەو، ناچارە بۆ ئەوەی لە برساندا نەمرێ هێزی خۆی بەسەرمایەدار دەفرۆشێ، هەر وەك چۆن هەر كالآیەكی تر لە بازاڕدا دێتە فرۆشتن. سەرمایەداریش دوای كڕینی هێزی كار كرێكار دەچەوسێنێتەوە واتە دەبێتە خاوەنی كارەكەی.

لەپاڵ هەردوو چینە سەرەكییەكەدا لە كۆمەڵگەی چەوسانەوەدا چینی تریش هەن كە دووەمینن، بۆ نموونە لە دنیای كۆندا لە پاڵ








خاوەن كۆیلەو كۆیلەكاندا جوتیاری گچكە و پیشەگەرانیش هەبوون.

هەروا لە كۆمەڵگەی سەرمایەداریدا چینی سەرەكی و دووەمین هەن، جگە لە هەردوو چینی بنچینەیی– سەرمایەداران و پرۆلیتاریا- چەندان چینی دووەمین هەن بۆ نموونە خاوەن موڵكەكانی خانووبەرە، راستە لە هەندێ وولآتدا موڵكایەتی زەوی و زار لەناوبرا، بەلآم لە هەندێكی تردا بۆ نموونە وەك ئەڵمانیا، ئابووریی زەوی و خانووبەرە وردە وردە بووە ئابوورییەكی سەرمایەداری و، چینی خاوەن موڵكەكانی زەوی و زارو خانوو بوو بۆرژوای كشتوكاڵی، لە وولآتانی كەمتر پەرەسەندوودا وەك روسیای تسار كە شوێنەواری گرنگی دەرەبەگی مابوون، خاوەن موڵكەكانی زەوی و خانوو وەك چینێكی تایبەتی مابوونەوە. . . ئەم چینە ئێستا كە لە وولآتانی ژێر دەستەو رزگاربوودا هێزێكی گەورەیە و ماوەتەوە، هەندێ چینی دیكەی دووەمینی كۆمەڵگەی سەرمایەداری وەك بۆرژوای گچكە و جوتیاران بەشێوەی تایبەتی.

بۆرژوای گچكە وەك خاوەنی موڵكایەتی تایبەتی لەسەر بۆرژوا دەژمێردرێن، بەلآم وەك نوێنەرانی چینەكان كەلەسەر كاری تایبەتی خۆیان دەژین و لەلایەن بۆرژوازی گەورەوە دەچەوسێندرێنەوە دەدرێتە پاڵ كرێكاران. ئەم دوو لایەنییەی بۆرژوازی بچووك بۆتە هۆی هەڵوێستی دوو دڵییانەی لە خەباتی چینایەتیدا، شان بە شانی پەرەسەندنی سەرمایەداری دەبینین موزاریعەكان و پیشەگەران و دەستەوتاقمەكانی كەی بۆرژوای بچووك دادەڕمێن و لە نێوانیاندا

دەستەبەشێکی کەمی سەرمایەداران جوێ دەبنەوەو جەماوەری پرۆلیتاریاو نیمچە پرۆلیتاریا دەکەونە روو.

موزاریعەکان لە وولاتە سەرمایەدارە پەرەسەندووەکاندا بەرە بەرە زۆرتر دەکەونە بەر چەوسانەوەی دەست مۆنۆپۆل و بانکەکان.

بەخۆدا هاتنی سەرمایەداریی مۆنۆپۆڵ و بوونی بە سەرمایەداری مۆنۆپۆلی دەوڵەت، هەردوو دەبنە هۆکاری گردبوونەوەی سامانەکان لە دەستی لوتکەیەکی کۆمەلأیەتی بچووکدا.

لە ماوەی ئەم دەساڵەی دواییدا سەرژمێرەی بۆرژوا لە وڵاتانی سەرمایەداریدا زۆر بەر تەنگ بۆتەوەو، بەلأم سامانەکان و دەسەلأتیان زۆرتر پەرەیان سەندووە، هەر لە نێوەندی بۆرژواوە دەستە بەشێکی مۆنۆپۆڵ جوێ بوونەتەوە کە بەرژەوەندەکانیان نەك تەنیا لەگەڵ بەرژەوەندی رەنجدەراندا، بەڵکو تەنانەت لەگەڵ بەرژەوەندی بەشێکی بۆرژوای ناوەندو گچکەدا لە ناکۆکیدان. لە لایەکی تریشەوە دارِمان و راماڵینی جوتیاران و پشەگەران و کارە دەستییەکان و خاوەن دوکانە گچکەکان و ئەوانی تر بەردەوامە، لە ئەنجامی ئەمەشدا ژمارەی ئەو کەسانەی بەکرێ کار دەکەن چەند هێندە زیاتر دەبن.







## خەباتی چینایەتی لە کۆمەڵگەدا

هەر لە سەرەتای پەیدابوونی چینەکانەوە خەباتی زۆربەی زۆری مرۆڤایەتی لە دژی چەوسێنەران دەستی پێ کردووە، بەرگریی رەنجدەران لە دژی زۆرداری و چەوسانەوە ئەو هێزە مەزنەیە کە بزوێنەری مێژووە. راپەرِینەکانی جوتیاران و جەنگەکان بنچینەی دەربەگییان رامالّی، مێژووی کۆمەڵگەی سەرمایەداریش مێژووی خەباتی سەرسەختی پرۆلیتاریایە لە دژی بۆرژوا. چەوسانەوەی توندی وولاتانی ژێر دەستەو نیمچە ژێر دەستەی ئیستعمارگەران بۆتە هۆکاری پەیدابوونی بزوتنەوە مەزنەکانی رزگاریی نیشتمانی.

لە رەوتی پەرەسەندنی مێژووی کۆمەڵگەدا خەباتی چینایەتی شێوازی جۆربەجۆری بەخۆوە گرتووەو پلەی جیاوازی توندوتیژی دیتووەز هەستکردنی خەلّکی بە خەباتی چینایەتی دەگەرِێتەوە بۆ رابوردوویەکی دوور.

هزرمەندانی دنیای کۆن و مێژوونووسانی سەردەمی هەستانەوە بە شێوەیەکی رۆشن باسی رووداوەکانی خەباتی چینایەتییان کردووە، ئەمەش شتێکی ئاشکرایە. لە تواناادا نەبوو ژیانی کۆمەڵگە بخرێتە پێش چاو بەبێ دەرخستنی لایەنە جەوهەرییەکانی، بەلأم جگە لە مارکس و ئەنگلس هیچ کەسێکیتر نەیتوانی خاسییەتی ئاسایی خەباتی چینایەتی دەربخات.

چاوگەی خەباتی چینایەتی ئەو ناکۆکییە دوژمنانەیەن کە لە نێوان چەوساوەو چەوسێنەراندا هەن. باری ژیانی چینە چەوساوەکان خۆیان لە کۆمەڵگەداو تەنگ پێهەڵچنینیان لەلایەن زۆردارانەوە پاڵپێوەنەریانە بۆ خەباتی شۆڕشگێڕی. هەروا خەباتی چینایەتی لەو حاڵەتانەشدا دەبێ کە هێشتا چینەکە بەرژەوەندیی ریشەییان هەست پێ ناکەن. ئەو کاتانە خەباتی چینایەتی خاسێتێکی خۆرسك لەخۆ دەگرێ، کاتێکیش کە چینەکە بەرژەوەندەکانی ریشەیی خۆی هەستپێدەکا خەباتەکەی دەبێتە هۆشمەندانە.

لە ناو هەموو ئەو چینانەدا کە رووبەڕووی بۆرژوا دەوەستن پرۆلیتاریا لە هەموویان زۆرتر هۆشمەندن. پرۆلیتاریا لەگەڵ پێشکەوتووترین شێوازەکانی ئابووریی کۆمەڵایەتی هاوپەیوەندە کە ئەویش بەرهەمهێنانی گەورەیە، هەلومەرجی کارکردن لە پرۆژە گەورەکاندا کە جەماوەرێکی زۆری کارگەران لە ناویاندا گردبوونەوە و، رێکیان دەخەن و زەبت و ڕەبتیان دەکەن و بەگیانی هاوکاریی پرۆلیتاری پەروەردەیان دەکەن و لە ئەنجامدانی کاروباری هۆشمەندانەی کاریگەردا زۆرتر بەتوانایان دەکەن. کرێکاران کاتێك لە مانگرتنەکەدا بەشداریی دەکەن بە ئەزموونی خۆیان دەگەنە ئەو قەناعەتەی کەیەکخستنی کۆشش و توانای کاری رێکوپێك چەکێکی بەهێزن بۆ خەبات لە دژی دوژمنی چینایەتی.

ئەگەر پرۆلیتاریا لەگەڵ چینە چەوساوەکانی پێشیان بەراورد بکەین دەبینین ئەمان توانایەکی بەرزتریان هەیە بۆ یەکگرتنیان نەك







تەنیا لە بواری نیشتمانیدا بەڵکو هەروا لە بواری نێو نەتەوەیشدا: خەباتەکەی زۆرتر فراوان دەبێ. پرۆلیتاریا لە گشت چینە رەنجدەرەکانی کە زیاتر رێکوپێکی هەیە. بەرژەوەندە چینایەتییەکانی پرۆلیتاریا لەگەڵ بەرژەوەندیی گشت رەنجدەران لەگەڵ ئەوانەیاندا کە لە رزگاربونیان لە چنگی بۆرژوا قازانجیان هەیە پێکەوە دەگونجێن.

ئەمەش توانا دەخوڵقێنێ بۆ هاوپەیمانیی بەتینی پرۆلیتاریا لەگەڵ جەماوەری فراوانی رەنجدەراندا.

هەر چینێك کە بەرگری لە بەرژەوەندەکانی خۆی دەکات هەوڵ دەدات دەسەلاتی خۆی بچەسپێنێت، لەبەر ئەوەیە هەرچینە حزبی خۆی دادەمەزرێنێ کە بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی بکات و خەباتی چینایەتی رابەرایەتی بکات و لەوبەرژەوەندانەش خەبات لە پێناو دەسەلاتداو لە پێناو سەرکردایەتی حکومی تەواوی کۆمەڵگەدا.

دامەزراندنی حزبە سیاسییەکان پلەیەکی بەرزی پەرەسەندنی خەباتی چینایەتی پیشان دەدا. ((لە کۆمەڵگەیەکدا لەسەر دابەشبوونی چینەکان پێکهاتبێ خەباتی نێوان چینەکان کە بەناچاری لە دژی یەکن و لە پلەیەکی دیاریکراوی پەرەسەندنی ئەو کۆمەڵگەیەدا خەباتێکی سیاسی دەبێت، خەباتی حزبەکان لە گشت دیمەنەکانی خەباتی سیایی چینەکان یەکگرتووترو پێگەیشتووترو رێکوپێکترە)). *

* لێنین:دانراوەکان. چاپی رووسی. بەرگی ١٢. ل٧٣١.

هزرمەندانی بۆرژوا هەوڵ دەدەن حزبە سیاسییەکانیان وا دەربخەن گوایە لەسەروو چینەکانەوەن و بۆ تەواوی گەلن و دەبێ چینە دژ بەیەکەکان ئاشتبکەنەوە. زانایانی کۆمەڵایەتی بۆرژواز لافی ئەوە لێدەدەن گوایە بوونە ئەندامی ئەم یان ئەو حزبە پەیوەندیی بە چینێکی تایبەتییەوە نیەو حزبەکان سروشتێکی خێزانی و یان وەك نەریت و یاخود دینییان هەیە. بۆ پشتگیریی ئەم بیرەشیان پشت بە سیستەمی بۆرژوازیی فرە حزبی دەبەستن. بەڵام لای هەموو مرۆڤێك کەلە سیاسەتدا نەزان نەبێ ئاشکرایە کە بۆ نموونە لەنێوان دوو حزبەکەی ووڵاتە یەکگرتووەکاندا – دیموکراتی و کۆماری – چ جیاوازییەکی مەبدەئی نییە، نەك تەنیا لەبەر هێندە کە هەردوو حزبەکە لەسەر بنەمای نەریتی دیینی و رۆشنبیری و جوگرافی و بنەماڵەی وەك یەك و شتی وا دامەزراون و بەس، بەڵکوو لەبەر ئەوەش کە هەردوو حزبەکە بە ئایدۆلۆژیاو سیاسەتەکەیان بەرگری لە بەرژەوەندەکانی یەك چینی باڵا دەستدەکەن کە ئەویش بۆرژوایەو، بەرژەوەندی سەرمایەی مۆنۆپۆلە.

بەڵام حزبە مارکسیستەکان بەپێچەوانەی حزبە بۆرژواکانەوە، بەئاشکرا سروشتی چینایەتی خۆیان رادەگەیەنن: حزبی چینی کرێکاران و بەرژەوەندەکانی هەموو کارگەران دەردەبڕن و، ئامانجەکانیشیان لەگەڵ پەرەسەندنی پێشکەوتووانەی کۆمەڵگەدا







دەگونجێن.

پرۆلیتاریا لە رەوتی خەباتی چینایەتیدا سەندیکای پیشەیی و دامەزراوەی هەرەوەزی و، رێکخراوی فێرکاریی جۆربەجۆر دادەمەزرێنن.

ئەم رێکخراوانە بەپێی پێداویستییەکی مێژوویی دەدامەزرێن تاوەك ئامرازێك بن بۆ پاراستنی بەرژەوەندی چینی کرێکار، بەڵام دیارە باڵاترین شێوەی رێکوپێکی پرۆلیتاریا حزبی سیاسیە.

لەگەڵ پێگەیشتنی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کرێکاریدا لە ووڵاتانی سەرمایەداریدا چەندان حزبی کرێکاریش دامەزراون کە بەشێوەی جۆربەجۆر بەرژەوەندیی ئابووری و سیاسی و ئایدۆلۆژیی خەباتی پرۆلیتاریایان دەربڕیوە. ئەمەش وا لێکدەدرێتەوە چونکە لە پرۆسەی پەرەسەندنی سەرمایەداریدا بەردەوام چینی کرێکار بەو کەسانە زیاد دەکات کەلە چینەکانی ترەوە بۆی دێن، بەشێوەی سەرەکی لە بۆرژوای بچووکی شارو گوندەوە. جگە لەمەش بۆرژوای ئیستعمارگەر لەسەر حیسابی قازانجی مۆنۆپۆلی و تاڵانکردنی ووڵاتە ژێر دەستەو نیمچە ژێر دەستەکان بەرتیل دەدەنە بەشێك لە پرۆلیتاریا، دەدەنە لوتکەیان. لە ئەنجامی ئەمەشدا ئورستوکراسی کرێکاری پەیدا دەبێ، هەر ئەمەش بووە چاوگەی دەرکەوتنی خولیاکان و لەرێ لادان لەناو بزووتنەوەی کرێکاریداو زەوییەکی بەپیت بووە بۆ هەلپەرستی لە ریزەکانی ئەم بزووتنەوەیەدا.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا حزبە

سۆسیالی – دیموکراتەکان پەیدابوون و سەرۆکایەتی بزووتنەوەی کرێکارییان کرد بەڵام نەیانتوانی سەرکردەیی چینی کرێکار بکەن بۆ پەلاماردانی سەرمایەداری چونکە کەسانی هەڵپەرست توانای تێکۆشەرانەی ئەم حزبەیان پەك خستبوو، بەرێگەی ناپاکی لەگەڵ پرۆلیتاریاو هاوکاری لەگەڵ بۆرژوادا دەڕۆیشتن. ڕەوتی رووداوە مێژووییەکان ئەرکی دامەزراندنی حزبێکی چەشنی نوێ دیاریکرد. نموونەی ئەم حزبەش لەلایەن لینینی مەزنەوە دامەزرێندرا وەك پێشڕەوی چینی کرێکارو، دەربڕی بەرژەوەندە ژیارییەکانی و بەرژەوەندی و ئاواتەکانی هەموو رەنجدەران و خواستی شۆڕشگێڕانەیان، حزبی شیوعییەکان کە لینین دایمەزراند گەلانی یەکێتی سۆڤیەتی گەیاندە سەرکەوتنی سۆسیالیزم کە لە ئەنجامی ناپاکی سەرکردایەتی گەرباچۆڤ و گەلێك هۆکاری تردا دووچاری شکستییەکی کاتی هات.

لە دنیای ئەمڕۆی سەرمایەداریدا خەباتی چینایەتی بەزۆر شێوە دیاردەداو توندتر دەبێ و وێڕای شکستییو گەورەکە خەبات و چالاکی چینی کرێکار بۆ بەرگری لە بەرژەوەندیی ئابووری و سیاسییان فراوانتر دەبێ، رەوتی پەرەسەندنی خەباتی چینایەتی لە زۆر وولاتی سەرمایەداریدا بەشێوازی جۆربەجۆر بەڕێوە دەچن.

لە وڵاتانی دواکەوتووشدا خەباتی چینایەتی لەگەڵ خەبات لە پێناو رزگاریی نیشتمانیدا یەکدەگرنەوە، لە خەباتی رزگاری نیشتمانیدا کە ناوەڕۆکێکی کۆمەڵایەتی هەیە خەباتێکی








دیموکراسییانەیەو، چینە جۆر بە جۆرەکان دەتوانن لە بەرەیەکی یەکگرتوودا کۆبنەوە، چەسپاوترین جەنگاوەر چینی کرێکارە کە تا سەر ئەرکەکانی شۆڕشی نیشتمانی دیموکراسی بە ئەنجامی بگەیەنێت. هاوپەیمانەکانی ئەم چینە جووتیارانن کە بەرژەوەندیی تەواویان لەوەدایە چاککردنی کشتوکاڵ بهێنرێتە دی و پاشماوەکانی دەرەبەگی لە ناو ببرێن. هەروا هێزە دیموکراتیەکانی دیکەش هاوپەیمانی ئەو چینەن.

کۆمەڵانی خەڵك لەو ڕاستییە گەیشتوون کە ڕاستترین ڕێگە بۆ نەهێشتنی دواکەوتنی لە مێژینەو بۆ باشکردنی باری ژیان بە جێگەیاندنی تەواوی ئەرکەکانی شۆڕشی نیشتمانی دیموکراسییەو بەهێزکردنو پتەو کردنی بەرەی نیشتمانییە لەسەر بنەمای هاوپەیمانیی چینی کرێکارو جووتیارانو بۆرژوای نیشتمانیو ئامادەکردنی هەلومەرجی پێویست بۆ پێکهاتنی دەوڵەتێکی دیموکراسی نیشتمانی و گواستنەوە بۆ ڕێگەی پەرەسەندنی سۆسیالیستی.

خەباتی چینەکانە هێزی بزوێنەری مێژوو لە گشت پێکهاتە چەوسێنەرەکانداو لە سەرو بەندی شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکاندا خەباتی چینایەتی دەگاتە ئەوپەڕی تیژبوون.

# شۆڕشی کۆمەڵایەتی

لە مێژووی کۆمەڵگەکاندا کاتی وا بووە پەرەسەندنو ئاڵوگۆڕش بەرەبەرە روویانداوەو، کاتی واشبووە بەرێگەی رووخاندنی شۆڕشگێڕانەی توندوتۆڵ سەرتاپای سیستەمی کۆمەڵایەتی ئاڵوگۆڕی بە سەردا هاتووە، مەبەستمان لە شۆڕشی کۆمەڵایەتی رووخاندنی رژێمی کۆمەڵایەتییە لە بنەڕەتەوە کە بەو رێگەیە وەرچەرخان لە پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتییەوە بۆ یەکێکی تر بەدی دێ، لە پێش شۆڕشەکاندا دەشێ قۆناغی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی ماوەیەکی درێژ یان کورت بخایەنێ. لە مێژوویی ئەوروپاشدا پێش شۆڕشەکانی بۆرژوا بەمجۆرە بووەو پرۆسەی هاتووچۆی یەك لە دوای یەکی نەوەکانی پاشایەتی سەرنج دراون، چەندان شەڕو کودەتا لە تەختی پاشاییدا روویانداوە: میرنشینەکانو دەرەبەگایەتییە لە یەکتر جوداکان بێ برانەوە لە هەرای تێکچوونو دوژمنایەتیو ئاشتبوونەوەو دیسان شەڕی تازەو ئاشتبوونەوەی تازەدا بوون، ئەمانەش هەمووی لە پێناوی پچڕاندنی پارچە زەوییەکی زیاترو تالان کردنی قەڵایەکی دراوسێ بە تالان بردنی ئاژەڵو یان تۆڵەکردنەوەی ئابڕوویەکی تکاوو شتی وا. بەڵام ئەم هەموو رووداوانە کاکڵی رژێمی دەرەبەگییان نەگۆڕیوە. جا هەرچەندە زۆرجار راپەڕینەکانی جووتیارانی کلپەیان سەندووە، چینە دەسەڵاتدارەکان بەبێ بەزەی ریشەکێشیان کردوونو لە خراپو







لاواز رێکخستنی جووتیاران دەرفەتیان وەرگرتووە.

هزرمەندانی بۆرژوای راپەڕیو لە باری تیئورییەوە پشتگیریی مافی گەلانیان لە شۆڕشدا کرد. بۆ بەرگری ئەم مافە چەندان وتاری ئاگرین لە لایەن وتاربێژانی شۆڕشەکەی فەرەنساوە لە کۆتای سەدەی هەژدەیەمدا لە لایەن کەسانی وەك روبسپێرو ماراتو سینت-جیوست پێشکەشکران.

هزرمەندانی بۆرژوای تازە پێگەیشتوو، کاتێك داوای شۆڕشیان لە دژی سیستەمی گەندەڵی دەرەبەگی دەکرد، چاویان بڕیبووە دوا رۆژ. بەڵام لەگەڵ گەیشتنی بۆرژوا بەدەسەڵاتو توندوتیژبوونی خەباتی چینایەتی بیروباوەڕی ئەو هزرمەندە بۆرژوایانە لە بارەی مافی گەلەوە لە شۆڕشدا، بە شێوەیەکی ریشەیی گۆڕدراو سروشتێکی کۆنە پەرستانەی پۆشی. هزرمەندانی بۆرژوای روو لە ئاوا بوون پشتیانکردە دوا رۆژ، ئەمانە ئێستا وایدادەنێن شۆڕش دیاردەیەکی نا ئاساییەو بە رێکەوتەو یان شتی لەو بابەتە رەوایی شۆڕشی کۆمەڵاتی ئینکار دەکەن چونکە ئەم شۆڕشانە بانگکراون دەسەڵاتی ئەم چینە کۆمەڵایەتییانە هەڵگێڕنەوە کە ئەو هزرمەندانە بەرگری لە بەرژەوەندییان دەکەن.

شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکان پێداویستێکی مێژوویینو رەگوڕیشەیان بە ژیانی ئابووری کۆمەڵگەدا رۆچووە، چاوگی شۆڕشە کۆمەڵایەتیەکان بریتییە لە ناکۆکی نێوان هێزە نوێیە بەرهەمهێنەرەکانو پەیوەندییە کۆنەکانی بەرهەمهێنان.

دیارە شۆڕشەکان بە حەزوئارەزووی تاقە کەسو کۆمەڵە کەس و

یان چینەکان ڕوو نادەن، بەڵکو کاتێك هەلومەرجی بابەتیی گونجاویان پێگەیشتبن، گەل ئەنجامیان دەدا. شتێکیش کە لە کۆمەڵگەی چینایەتیدا دەبێتە هۆکاری پێداویستە بابەتییەکانی شۆڕشەکان ئەوەتا کە چینەکانی خاوەن دەسەڵات بەرگری لە پەیوەندییە کۆنەکانی بەرهەمهێنان دەکەن، ئەمەش بە هاوکاری سیستەمێکی تەواوی دامەزراوەی سیاسیو یاساییو ئەوانی تر، پێش هەموو شتێکیش بە یارمەتی دەوڵەتو یاساز جا لە پێناو تێکشکاندنی ئەم کۆسپانەدا دەبێ بە هێزە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان بەرەنگاریی هێزە کۆنەکان بکرێت. لەبەر ئەوەش کە چینە کۆنە پەرستەکان بە هاریکاریی دەسەڵاتی حکومەت پارێزگاریی پەیوەندییە کۆنەکانی بەرهەمهێنان دەکەن، لە پێش هەر شتێکدا لەسەر چینی پێشکەوتنخواز پێویستە دەسەڵاتی سیاسی بگرێتە دەست بۆ مەبەستی لەناو بردنی پەیوەندییە کۆنەکانی بەرهەمهێنانو چەسپاندنی پەیوەندییە نوێیەکان. ئەمەش مانای وایە مەسەلەی سەرکەوتن یان ژێرکەوتنی پەیوەندییە تازەکانی بەرهەمهێنان، لە ئەنجامدا لەسەر ئەوەی وەستاوە کە چینی شۆڕشگێڕ دەسەڵاتی حکومەت بگرێتە دەست. لەبەر ئەوە مەسەلەی دەسەڵاتی حکومەت مەسەلەی بنچینەیی هەموو شۆڕشێکە. گواستنەوەی دەسەڵات لە دەستی چینی کۆنە پەرستەوە بۆ دەست چینی پێشکەوتنخواز بەرێگەی خەباتی چینایەتی توندوتیژ پێکدێت.

لە قۆناغی شۆڕشدا توانای داهێنەرانەی ملیۆنەها کەس لە





فەلسەفەی مارکسیزم

کۆمەڵانی خاڵك دەبوژێتەوە. لە ڕەوتی شۆڕشی کۆمەڵایەتیدا ئەو کەسانە کە شۆڕشەکە دێننە دی، بازو بەهێزو پتەو دەبنو نوێ دەبنەوەو لە باری رووحیەوە دەوڵەمەند دەبن. دیارە شۆڕشی بەبێ شۆڕشگێڕان نابێت. بەڵام شۆڕشیش شۆڕشگێڕان دێنێتە کایەوەو شارەزایان دەکات. خەڵکی هێزو توانای وا لە خۆیاندا دەبیننەوە کە هەر پێشبینیان نەکردووە. لە ئەنجامی هەموو ئەمانەدا پەرەسەندنی کۆمەڵ زۆر خێراتر دەبێ. هەر لەبەر ئەمەش بوو مارکس شۆڕشەکانی ناونا بزوێنەرانی مێژوو.

شۆڕشەکان لە رووی چلۆنایەتی و هێزە بزوێنەرەکانەوە لێك جیاوازن. چلۆنایەتی و جۆری شۆڕش پێش هەموو شتێك بەو ئەرکانە دیاری دەکرێن کە دەبێ بە ئەنجامیان بگەیەنن، هەروا بەو چینەی دێتە دەسەڵات و، لە باری سیاسییەوە دەبێتە هێزی دەسەڵاتدار لە کۆمەڵگەداو هەروا بەو پەیوەندییانەی بەرهەمهێنان کەلە ئەنجامی شۆڕشەکەدا جێگیر دەبن.

هێزی بزوێنەری شۆڕش ئەو چینە کۆمەڵایەتییانەن کە شۆڕش دێننە دی و دەچنە کۆڕی خەباتەوە لە دژی چینە کۆنەپەرستەکان کە سەردەمیان کۆتایی هاتووەو، رێگە ئاوەڵا دەکەنەوە بۆ پەرەسەندنی پەیوەندیی بەرهەمهێنەرانەی نوێترو پێشکەوتووتر. یەکێکیش لەو چینانەی شۆڕش دەکەن دەبنە سەرکردەی شۆڕشەکەو تەواوی چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکانی تر کە لە شۆڕشدا بەشدارن بەدوای خۆیدا رادەکێشێ. هێزوبزوێنەرەکانی شۆڕش کامانەن و کام چینە

سەرکردەیانن – ئەمە پێش هەرچی لەسەر چلۆنایەتی شۆڕشەکە وەستاوە، هەروا لەسەر هەلومەرجی مێژوویی دیاریکراوی بە ئەنجام گەیاندنی و ڕێژەی هێزە کۆمەڵایەتییەکان لەو قۆناغەدا.

سەردەمی شۆڕشەکانی بۆرژواز ئەو ماوەیە لە پەرەسەندنی کۆمەڵگەدا کە دەرەبەگیی تێدا لەناو دەچێ و سەرمایەداری دەچەسپێ.

لە ئەنجامی شۆڕشی بۆرژوادا دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی لە دەرەبەگی و خاوەن موڵکەکانی خانووبەرەو زەوی و زارو خانەدانەکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ناو دەستی بۆرژواکان، یان بۆ هاوپەیمانیی سەرمایەداران و خاوەن موڵکەکانی خانوو زەوی. ((تاقە ئەرکێك لە بەردەم شۆڕشی بۆرژوادا بوو ئەویش سڕینەوەو بەربەست و تێکدانی گشت کۆت و پێوەندێکی کۆمەڵگەی پێشووتر بوو. هەر شۆڕشێکی بۆرژوا کاتێك ئەم ئەرکە جێبەجێ دەکات، بەمە هەرچی لێ داوا بکرێت جێبەجێی دەکات: بەمەش بۆرژوا پێگەیشتنی سەرمایەداری بەهێز دەکات)) *

شانبەشانی جووتیاران ئەو چینانەش کە لەگەڵ بەرهەمهێنانی تازە پێگەیشتووی سەرمایەداری هاوپەیوەندن لە شۆڕشی بۆرژوازدا بەشداریی دەکەن، ئەوانەش: بۆرژواو بۆرژوای بچووکی شارەکان و

* لێنین:دانراوەکان، چاپی رووسی. بەرگی ٣٦. ل ٥





پرۆلیتاریای تازە پێگەیشتوو. هێزی سەرکردەی شۆڕشی بۆرژوا بۆرژوا خۆیەتی، هەر ئەو خۆی جووتیاران و پێشگەران و پرۆلیتاریای شارەکانی لە دەوری خۆی گردکردەوەو بە یارمەتی ئەوان بوو دەسەڵاتی سیاسی گرتە دەست. لە ناو شۆڕشە بۆرژواکاندا شۆڕشی دیموکراسیی بۆرژوا تایبەتمەندیی خۆی هەیە. خاسیەتی ئەم جۆرە حیزبانەش – هەروەك لێنین دەری بڕیووە – ئەوەیە لەم جۆرە شۆڕشانەدا کۆمەڵانی خەڵك بەچەشنێکی سەربەخۆدا رادەبن. زۆرترین و قووڵترین دەستەو توێژەکانی ((گشتی)) کۆمەڵایەتی کە لە ژێر باری گرانی زۆرداری و چەوسانەوەدا ووردوخاش کراون، بۆیە سروشتی داخوازییەکانیان و کۆششیان بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگای نوێ، بەڕێگەی تایبەتی خۆی لە جێگەی کۆنەی داڕماو، بەسەر تەواوی رەوتی شۆڕشدا دەپۆشێت. شۆڕشە بۆرژواکان ئاسۆیەکی فراوانتری لە پێش پەرەسەندنی هێزە بەرهەمهێنەرەکانی کۆمەڵگەدا والا کردەوە. سەرمایەداری دوای ئەوەی بە چەشنێکی مەزن هێزە بەرهەمهێنەرەکانی پەرەپێدان ئیتر بووە کۆسپێکی یەکجار مەزن لە رێگای پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییدا. ناکۆکی بەردەوام توندو پەرەسەندووی نێوان هێزەکانی بەرهەمهێنان وپەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان زۆربەتوندی ئەرکێك دەخاتە پێش مرۆڤایەتی، ئەرکی داماڵینی بەرگی سەرمایەداری کە رێگرە لە پێش پەرەسەندنی سروشتیی کۆمەڵگەداو لەپێش ئازادبوونی هێزەکانی بەرهەمهێناندا کەبەدەست وبازووی گەل بەرهەم هێنراون وپەرەسەندنیشیان دەبێ





دوور لە هەر کۆسپێك وبۆ خێروخۆشی تەواوی کۆمەڵگە بەکاربهێنرێت، تاکە ڕێگەش بۆ گەیشتنە ئەم ئامانجە پیرۆزە شۆڕشی سۆسیالیستییە.

## شۆڕشی سۆسیالیستی

لە هەمووشۆڕشەکانی پێشوودا چینە زۆرلێکراوەکان هێزی پێشڕەوی سەرەکییبوون، بەلام بەرهەمی سەرکەوتن بۆچینە چەوسێنەرە نوێیەکانبوو: گەل درەختی چاندووەو چەوسێنەران بەرهەمیان چنیون. تەنیا شۆڕشی سۆسیالیستییە بەدووربێ لەناکۆکییەکانی شۆڕشەکانی رابوردوو. هێزی بزوێنەری شۆڕشی سۆسیالیستی کۆمەڵانی خەڵکی ڕەنجدەرە بەسەرۆکایەتی چینی کرێکار کە بەرژەوەندییان لەگەڵ بەرژەوەندیی زۆربەی زۆری کۆمەڵگەدا یەکدەگرنەوە.

لەبەرئەمەیە شۆڕشی کۆمەڵایەتی لەگشت شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکانی پێشوو جیاوازە. ئەم شۆڕشە ئاڵوگۆڕی یەکجار بنەڕەتی لەژیانی گەلاندا دێنێتە دی، لەکاتێکدا هەموو شۆڕشەکانی پێشوو تەنیا شێوازی دەرەوەی چەوسانەوەیان دەگۆڕی. بەلام شۆڕشی سۆسیالیستی هەموو چەشنە چەوسانەوەیەکی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە لەناو دەبات و ئالای سەردەمی کۆمەڵگەی ناچینایەتی







بەرزدەکاتەوە. شۆڕشەکانی پێشوو تەنیا دەسەلاتی سیاسییان لەگەڵ پەیوەندییە ئابورییەکانی چوارچێوەی کۆمەڵگەی کۆندا گونجاندووە. ئامانجێکی سەرەکی شۆڕشی سۆسیالیستی گواستنەوەیە بۆ پێکهاتەیەکی نوێ کە کۆمونیستییە، ئەمەلەکاتێکدا ئاشکرایە کە لەتانوپۆی سەرمایەداریدا تەنیا پێشینەکانی ماەیی رژێمی نوێ پەیدادەبن.

لە شۆڕشەکانی پێشوودا هێندەی شۆڕشی سۆسیالیستی چالاکییەکانی کۆمەلانی خەڵك فراوان وبەتین نەبوون. چینی کرێکاریش چونکە شۆڕشگێرترین چینە بەسەرۆکایەتی حیزبی مارکسی سەرکردایەتی هەموو ڕەنجدەران دەکات. مەسەلەی سەرەکیش لەشۆڕشی سۆسیالیستیدا مەسەلەی دەسەلاتگرتنی چینی کرێکارە بەهاوکاری لەگەڵ رەنجدەرانیتردا بەسەر دەسەلاتی سیاسیداو پەرەپێدان و چەسپاندنی بۆ بەرژەوەندیی گشت ڕەنجدەران.

تەنیا کاتێکیش چینی کرێکارو هاوپەیمانەکانی دەتوانن ئەم ئەرکە تەواوبکەن کە دەوڵەتی ڕنجدەران دابمەزرێنن.

هەردوو مامۆستای پرۆلیتاریاو گشت ڕەنجدەران، مارکس و ئەنگلس، لەدانراوەکانیاندا پێداویستی شۆڕشی سۆسیالیستیان سەلماندووە، بەلام هەردووکیان لەسەردەمی سەرمایەداری ڕاپەڕیودا ژیان ولێرەوە وایاندانا کە دەکرێ شۆڕشی سۆسیالیستی بەیەکجارەکی لەگشت وولاتانی سەرمایەداریی پەرەسەندوودا سەربکەوێت.

لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا

سەرمایەداری گۆڕدراو بووە ئیمپریالیزم. هەلومەرجی شۆڕشی سۆسیالیستیش هاتە گۆران، ئەودەم لێنین تیۆریی شۆڕشی بەپێی ئەم هەلومەرجە تازەیە پەرەپێدا.

ئەڵقەی سەرەکی لە تیۆری لێنینیزمدا سەبارەت شۆڕش ئەوەیە بسەلمێندرێ کەلە توانادایە شۆڕشی سۆسیالیستی یەکەمجار لە یەك ولآت یان زیاتردا سەرکەوێت. لێنین ئەوەشی سەلماند کە پەرەسەندنی ولآتانی سەرمایەداری لەرۆژگاری ئیمپریالیزمدا بەشێوەیەکی جۆربەجۆردەبێ هەندێ لەو ولآتانەی کە پێشان دواکەوتووبوون دەشێ لەبواری ئابوریدا بگەنەوە ولآتە پێشکەوتووەکان یان پێشیان بکەون. ((چونکە سەرمایەداری لەولآتانی جۆربەجۆردا بە شێوەیەکی تائەوپەری نابەرابەری پەرەدەسێنێ. لەسایەی رژێمی بەرهەمهێنانی کالآدا ناکرێ مەسەلەکە بەجۆرێکیتربێت. لەبەرئەمە ئەو بە ئەنجامگەیشتنە خۆی سەپاند کە ناکرێ سۆسیالیزم لە هەموو ولآتاندا پێکەوە لەیەك کاتدا سەرکەوێت. یەکەمجارلە ولآتێك یان چەند ولآتێکدا سەردەکەوێت. لەکاتێکدا ولآتانی تر تاماوەیەکی ترابۆرژواو پێش بۆرژوا دەمێننەوە))*. لێنین لە وەراتێهەڵچو کە سەرمایەداری وەك رژێم بەشێوەیەکی گشتی بۆشۆڕشی سۆسیالیستی پێگەیشتووە.

* لینین(مارکس وئەنگلس ومارکسیزم)چاپی عەرەبی. مۆسکۆ. ل،٤٨٧.





لەبەر ئەوە شۆڕشێکی لەو جۆرە دەکرێ لەولآتێکدا سەرکەوێت و پێویست نییە ئەو ولآتە زۆر پەرەسەندوبێت ودەکرێتەنانەت لە ولآتێکدابێت کە پەرەسەندنەکەی مامناوەندیبێت. لە بارێکی وادا مەرجی پێویست بۆ مسۆگەرکردنی سەرکەوتنی شۆڕشە کە هاوپەیمانیی نێوان چینی کرێکاران وجوتیارانە.

مەرجی گرنگ بۆ شۆڕشی سۆسیالیستی ئەوەتە حیزبێکی مارکسی هەبێت کە بتوانێ کۆمەلآنی خەلك لە سەردەمی ئالۆزبوونی ناکۆکییەکانی سەرمایەداریدا بۆکۆڕی خەباتی یەکلاکەرەوە ڕاپەڕێنێ. تەواوی ئەو هەلومەرجانە بۆ سەرکەوتنی شۆڕشی سۆسیالیستی پێویستن.ئەو دەم مەرجیش نییە چینی کرێکار ببێتە زۆرینەی دانیشتوانی ولآت، هەروەك ڕابەرانی حیزبە سۆسیال دیموکراتەکان لافیان لێدەدا.

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا نێوەندی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی جیهان گواسترایەوە بۆ ڕوسیا کە ئەو دەم بووە خالی پێکگەیشتنی تەواوی ناکۆکییەکانی ڕژێمی ئیمپریالیستی. وێڕای ئەوەش تەواوی هەلومەرجەکانی پێویست بۆ سەرکەوتنی شۆڕشی سۆسیالیستی لەڕوسیادا پەیدابوون. لەکاتی شیکردنەوەی خاسێتەکانی بزاڤی شۆڕشگێڕانەی چینی کرێکار لەو هەلومەرجە نوێیەداو پێش هەمووشتێك خاسێتەکانی شۆڕشەکەی ڕوسیا لەسالی ١٩٠٥دا، لێنین گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە هێزی سەرکردەی شۆڕشی بۆرژوای دیموکراسی لە سەردەمی ئیمپریالیزمدا پێویستە پرۆلیتاریابێت. هەر





خۆشی قازانجی لە وەدایە شۆڕشەکە تاسەربێت ویەکەمین جار ئاڵوگۆڕی دیموکراسی بهێنرێتەدی وپاشان بگەیەندرێتە شۆڕشی سۆسیالیستی.

بەم جۆرە لینین ومەسەلەی گواستنەوەی شۆڕشی بۆرژوای بۆ شۆڕشی سۆسیالیستی دانا. یەکێك لە خاسێتەکانی چینی کرێکاری ڕوسیا ئەوەبوو گەیشتبووە ئاستێکی بەرزی خەباتی چینایەتی. حیزبێکی مارکسی_لێنینی سەرکردایەتی ئەم چینەی دەکردوئەم حیزبە بەتێورییەکی شۆڕشگێڕانەی‌نوێ چەکداربوو، لە جەنگە چینایەتییەکاندا قاڵ بووبوو. حیزبی شیوعییەکان لە سەر ڕۆشنایی تێوریی لێنینی لە بارەی شۆڕشی سۆسیالیستیەوە، توانی بە یەك ڕێبازی

شۆڕشگێڕیدا، خەباتی چینی کرێکار لە پێناو سۆسیالیزمیدا وبزوتنەوەی گشتی گەل لە پێناوئاشتیداوخەباتی جوتیاران لەپێناو زەویداو خەباتی ڕزگاریخوازی نیشتیمانی گەلانی چەوساوەی ڕوسیا یەك بخات وئەم هێزانە بۆڕوخاندنی سەرمایەداری ئاراستە بکات. بەم شێوەیە دەسەڵاتی خاوەن موڵکەکانی خانوبەرە وزەوی‌وزارو سەرمایەدارەکان لەناوبراو، چینی کرێکاربە هاوپەیمانی جوتیارە هەژارەکان دەسەڵاتی سیاسییان گرتە دەست ودەوڵەتی سۆسیالیتی شۆرەوییان دامەزراند.

بایەخی مێژویی وزانستانەی قوولی تیۆری لینینی لەبارەی شۆڕشەوە، تەنیا بە ئەزموونی شۆڕشە مەزنەکەی ئۆکتۆبەر







نەسەلمێندراو بەس، بەڵکو هەروەها شۆڕشە سۆسیالیستییەکانی دواتریش دووپاتیانکردەوە. ئەم تیۆرییە ڕووناکییەکی گەش دەخاتە سەر ئەزموونی جەنگەکانی ئایندەی ڕەنجدەران بۆ ڕزگاربوونیان لە کۆتی سەرمایەداری.

تێکشکاندنی فاشیزمی ئەڵمانی وعەسکەرتاریای ژاپۆنی لە جەنگی دووەمی جیهاندا لەسایەی ڕۆڵی بڕیاردەری یەکێتی سۆڤییەتەوە هەلومەرجێکی باشی پەیداکرد بۆڕووخاندنی دەسەڵاتی سەرمایەداران وخاوەن موڵکەکانی خانوبەرەو زەوی وزار لە لایەن گەلانی کۆمەڵێك لە وڵاتانی ئەوروپاو ئاسیاوە. وێڕای بلاْوبوونەوەی زنجیرەیەکی تەواو لە شۆڕشە میللی_دیموکراسییەکان، واتە لە شۆڕشە گەلییەکانی دژ بە ئیمپریالیزم ودەرەبەگیی بەسەرکردەیی پرۆلیتاریاو لەبەر بنەمای هاوپەیمانیی کرێکاران وجوتیاران. لە ڕەوتی ئەم شۆڕشانەدا بەرەی یەکگرتووی گەل پێکهاتن وڕۆشنبیران وتوێژە نیشتیمانییەکانی بۆرژوای بچوك وناوەندی لەدەوری‌شۆڕش کۆبوونەوە. دامەزراندنی سۆسیالیزم لە یەکێتیی سۆڤییەتدا بایەخێکی مەزنی هەبوو بۆ پەرەسەندنی سەرکەوتووانەی شۆڕشەکان لەم وڵاتانەدا.

## بزاڤی رزگاریخوازی نیشتیمانی

شۆرشە ڕزگاریخوازییە نیشتیمانییەکان کە لە بزاڤی ڕزکاریخوازی نیشتیمانییەوە سەرهەڵدەدەن بایەخێکی گەورەیان هەیە بۆهێنانەدی سەربەخۆیی نیشتیمانی ونەهێشتنی دەسەلاتی بیانی وزۆرداری وچەوسانەوەو بەمەبەستی پێکهێنانی دەوڵەت وقەوارەی نیشتیمانی.

بانگەوازە مەزنەکەی مارکس وئەنگلس: ((کرێکارانی جیهان یەکگرن))بووە ئالای تێکۆشەرانی پرۆلیتاریای جیهان. لە هەلومەرجی نوێی دوای سەرکەوتنی شۆڕشە مەزنەکەی ئۆکتۆبەر. لێنین بە شێوەی تایبەتی پەیوەندی لە پچڕان نەهاتووی نێوان شۆڕشی سۆسیالیستی وبزاڤی ڕزگاریخوازیی نیشتیمانی ڕاگەیاند. دروشمی ((کرێکارانی جیهان یەکگرن))هەر دروشمێکی سەرەکیی خەبات دەبێ لەپێناو سەرکەوتنی شۆڕشی جیهاندا.وێڕای ئەمەش ناوەڕۆك وکاکڵی ئەم دروشمە بەرینتر بوو. لینین ئەم دروشمەشی پەسەندکرد: ((کرێکارانی جیهان وگەلانی چەوساوەی دنیا یەکگرن))،

ئەم دروشمە ڕۆڵی سەرکردایەتی پرۆلیتاریاو بایەخی پەرەسەندوی بزاڤی رزگاریخوازیی نیشتمانی دوپاتکردەوە.

ڕژێمی سەرمایەداری لەم سەردەمەدا بۆشۆڕشەکانی سۆسیالیستی پێگەیشتووە.بەلاّم توانای پەرەپێدانی شۆڕش لەهەر ولاتێکدا لەسەر هەلومەرجی ئەو ولاتە وەستاوە کە باری شۆڕشگێڕی دەستنیشان






فەلسەفەی مارکسیزم

دەکات. لێنینیزم لەدژی ((ناردنەدەرەوە))ی شۆڕشی بەراوەژووە.

بەرزکردنەوەی دروشمی شۆڕشی چەکداری لەپێش کاتی خۆیداو لەڕۆژگارێکدا بارێکی شۆڕشگێڕی لە ولاتدا پەیدا نەبووبێ، چینی کرێکار تووشی بەزیندەکات. زیانی سیاسی ئەم ڕەوتە لەوەدایە کە دەبێتە مایەی دوورە پەرێزیی حزبە شیوعییەکان ولەدەستدانی هاوپەیمانەکانی چینی کرێکار لەخەباتدا دژە دەسەلاتی مۆنۆپۆلەکان ودژی سەرمایەداری.

پەرەسەندنی شۆڕش بەپێی هەلومەرجی دیاریکراو دەشێ دوو شێوەی خەبات لەخۆبگرێ، خەباتی ئاشتییانە یاخود نائاشتیانە، ئەمەش بەپێی باری مێژویی هەرولاتێك و، پێش هەرچی ڕادەی ڕێکوپێکی وهۆشمەندیی چینی کرێکارو هاوپەیمانەکانی وئاستی بەرەنکاریی چینە کۆنەپەرستەکان.

توانای پەرەسەندنی ئاشتییانەی شۆڕش بۆچینی کرێکارو هاوپەیمانەکانی ئەوەناگەیەنێت دەست لە شێوازی نائاشتیی گواستنەوە بۆسۆسیالیزم بەربدات. ساویلکەییە واباوەڕبگرێ سەرمایەداری کە ناکۆکییە ناوخۆییەکانی لێکدەپچڕێنێ بەئاسانی دەست هەڵبڕێ وخۆبهاوێتە ژێر ڕەوڕەوەی مێژوو. کاتێك چینی چەوسێنەر هێز لە دژی گەل بەکاربهێنێ چینی کرێکارو هاوپەیمانەکانیشی ناچاردەبن پەنابەرنە بەر شێوازی نائاشتی بۆدەسەلاتگرتنەدەست.

ڕاستە لەیەکێتی سۆڤییەت و ولاتانی ئەورووپای خۆرهەلات شۆڕشی سۆسیالیستی وەك ئەزمونێك لە ئەنجامی زۆر هۆکاری ناوخۆو

دەرەکیدا تووشی تێکشکانبوو، بەم هۆیەشەوە بزاڤی رزگاریخوازیی گەلان تووشی تێکشکان وپاشەکشەهات، بەلاّم بێگومان ئەم شکستییە کاتییەو مانای پەرەسەندکردنی سەرمایەداری نییە لە ئاست سۆسیالیزمداو چینی کرێکارو بزاڤی رزگاریخوازیی گەلان لەو تێکشکانە کاتییەش دەربازدەبن.

سەرکەوتنی سۆسیالیزم ونەهێشتنی چینە چەوسێنەرەکان

بۆنەهێشتنی تەواویی چینەکان سەدەیەکی مێژوویی تەواو پێویستە. قۆناغی یەکەمی بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە ماوەی گواستنەوە لە سەرمایەدارییەوە بەسۆسیالیزم دەگوێزرێتەوە. لەوماوەیەدا چینە چەوسێنەرەکان لەناودەبرێن و رادەیەك بۆچەوساندنەوەی مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە دادەنرێ. لە ئەنجامی شۆڕشی سۆسیالیستیدا چینی خاوەن موڵکەکانی خانوبەرەو زەوی وزار نامێنێومولّکایەتی گەورەی سەرمایەداری دادەماڵدرێ. پاشان مولّکایەتیی تایبەتی گچکەی جوتیاران وپیشەگەران بە رێگای هەرەوەزیی سۆسیالیستی ئالّوگۆڕی بە سەردادێت. لە سەر ئەم بنچینەیە جیاوازیی چینایەتی بنەڕەتی نێوان کرێکاران وجوتیاران نامێنێ.

کاتێك سۆسیالیزم سەردەکەوێ وکێشەی چینایەتی لە ولاّتدا نامێنی ئیتر ناکۆکی چینایەتی لە ناودەچێ. پەیوەندی هەموو توێژەکانی کۆمەلّگە دەبێتە هاوکاریی دۆستانە. ئیتر لەوەولا خەباتی چینایەتی هێزی بزوێنەری پەرەسەندنی کۆمەلّگە نابێت. ئیتر







خەباتی چینایەتی ئاراستەی دوژمنان دەکرێ، دژی هێزەکانی سەرمایەداریی جیهانی کە لەسەر هێرشیان بۆسەر سۆسیالیزم درێژە پێدەدەن. بۆیە دەتوانین بلّێین تا سەرمایەداری جیهانی وئیمپریالیزم بمێنێ، مەترسی بۆسەر کۆمەلّگەی سۆسیالیستی ودەسکەوتەکانی گەلانی ڕەنجدەر لەئارادا دەمێنێ. پێویستە خەباتی فیکری وروحی لە دژی دنیای سەرمایەداری درێژەپێبدرێ. خەبات لەدژی پاشماوەکانی سەرمایەداری لە بیرومێشکی خەلّکدا ئەرکێکی پێویستە. ئەمەش دەبێ بەشێوازی پەروەردەییێت ودەشێ توندی لە دژی کەسانی شەڕخوازودڕندەو مەترسیدار بۆ کۆمەلّگە پەیڕەوبکرێ.

لەکۆمەلّگەی سۆسیالیستیدا ئەگەر چی چەوسانەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤەوە بنەبڕدەکرێو هەرکەس کاردەکەن ودەسکەوتیان هێندەی کۆششەکەیاندەبێ، بەلاّم هێشتا جیاوازیی چینایەتی وکۆمەلاّیەتی لە هەندێ بواردا دەمێنێ(لە نێوان شارولادێدا، لە نێوان کەسانی خاوەن کۆششی دەست وبازو، کەسانی خاوەن کۆششی بیرومێشکدا)ئەو جیاوازییانە بەیەکجارەکی لەناوناچن. جا لە بەر مانەوەی ئەوجیاوازییانە یەکسانیی تەواویش لە هەلومەرجی کاروژیانی خەلّکدا لە توانادا نابێت. لە بەر ئەوە نەهێشتنی ئەم جیاوازییانەو پێکهێنانی کۆمەلّگەی بنچینەکان گرنگترین ئامانجی بنیاتنانی کۆمۆنیزمە. بەم جۆرە دەبێ بزانرێ کە نەهێشتنی جیاوازییە چینایەتییەکان بەشێوەی گشتی بەستراوە بە گواستنەوەی لەسۆسیالیزمەوە بۆکۆمۆنیزم. پرۆسەی نەهێشتنی سنووری

چینایەتیش هەندێ خاسێتی جەوهەریی خۆی هەیە:پرۆسەیەکە بەرەبەرە پێكدێت وكودەتایەكی شۆڕشگێڕانەی پێویست نییە. لێرەدا ئەم پرۆسەیە لەئەنجامی ناكۆكی چینەكاندا نییە، بەڵكو ئەنجامی هاوكاریكردنیانە. نەمانی سنوور لە نێوان چینی كرێكاروجوتیارو ڕۆشنبیراندا كاتێك بە شێوەیەكی تەواو پێكدێت كە هەموویان ببنە ڕەنجدەرانی كۆمەڵگەی ناچینایەتی، كۆمۆنیستی كە هیچ جیاوازییەكی كۆمەڵایەتی تێدانابێت.







# بەشی پێنجەم

## دەوڵەت ودەورگێڕانی لەكۆمەڵگەدا

### دەوڵەت چییە؟

لەبارەی دەوڵەت ودەورگێڕانی لەژیانی كۆمەڵایەتیدا زۆر چەشنە بیروڕای جیاواز هەن. ئەم مەسەلەیەش بەتایبەتی لەلایەن هزرمەندە بۆرژواكانەوە شێوێدراوەو دەوڵەتیان كردۆتە هێزێكی جادویی و لەسەروسروشتەوە. بەڵام هیچ كامێكیان وەڵامێكی زانستانەیان نەدایەوە لەوەدا كە دەوڵەت سەربە ڕژێمە ئابورییەكانی كۆمەڵگەیە، لەوەداكەسروشتێكی چینایەتیی هەیە، لەبارەی یاساكانی پەیدابوون وپەرەسەندن وئەركەكانی دەوڵەتەوە لەژیانی كۆمەڵایەتیدا.

لێكدانەوەی زانستانەی ناوەڕۆك وجەوهەری دەوڵت لەلایەن ماركس و ئەنگلس ولینینەوە پێشكەش كرا.

دەوڵەت لەكۆمەڵگەی چینایەتیدا ئامرازێكی دەسەڵاتی سیاسییەو ڕێكخراوێكی سیاسییەبرپشتگیری دەسەڵاتیچینێكی دیاریكراو بەسەر چینێكی تردا.

وەنەبێ دەولچەت هەمیشە هەربووبێ. دەوڵەت بەرهەمی پەرەسەندنێكی مێژوویە. لەسەردەمی پێكهاتەی كۆمۆنی سەرەتاییدا نەموڵكایەتی تایبەتی ونەچینەكان هەبوون وپێویستیش نەبوو دەستەیەكی تایبەتی بۆفەرمانڕەوایی جیاواز لەگەل هەبێ. ئەركە كۆمەڵایەتییەكانیش لەلایەن كەسانی باڵغەوە ئەنجام دەدران. ئەمەش

بەڕێوەبردنێکی خۆبەخۆبوو. لەسەرۆکایەتی کۆمەڵە خەڵك وخێڵەکاندا کەسانێك هەبوون کەلەلایەن هەموانەوە هەڵبژێردرابوون- شێخەکان. ناوبانگی شێخ وسەرۆك خێڵەکان و سەرکردەکانیان لەسەر خاسێتی کەسایەتییان پێکهاتبوو: ئەزمونی زۆرو ئازایەتی وژیریوشتیوا. بەڵام پاش پەیدابوونی موڵکایەتی تایبەتی بارودۆخەکە گۆڕانی بەسەرداهات، بەپێی جیاوازییەکانی ئابووری کۆمەڵگە بەچینی ناکۆکەوە دابەشبوون. ئیتر نەدەتوانرا پێکەوە بەهاوبەشی مەسەلەکانی کۆمەڵگە چارەسەربکرێن، چونکە چینە جۆربەجۆرەکان بەرژەوەندی ناکۆکیان هەبوو. ئەمە وێرای ئاڵۆزبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی. ((پێویست بەدامەزراوەیەك بوو بتوانی نەك تەنیا پشتگیریی دابەشبوونی کۆمەڵگە بۆچینەکان بکات وبەس بەڵکو هەروا پشتگیری مافی چینی خاوەن موڵك بکات لەچەوساندنەوەی چینە بەشخوراوەکانداو بۆدەسەلاتگرتنی یەکەم بەسەر دووەمدا. ئەوەتا ئەم دامەزراوەیەش پەیدابوو. .))*

ژێردەستەکردنی ڕەنجدەران لەرووی ئابوورییەوە پێش هەمووشتێك بەموڵکایەتیی تایبەتی هۆیەکانی بەرهەمهێنان لەلایەن چینی دەسەلاتدارەوە زامن دەکرێت. بەلام ژێردەستەکردنی ڕەنجدەران لەرووی ئابورییەوە بەتەواوی بەشی ئەوەی نەکردووە کە ڕژێمی

* مارکس وئەنگلس. دانراوەکان. چاپی روسی. بەرگی٢١. ل ١٠٨.







کۆمەڵایەتیی لەسەر چەوسانەوەپێکهاتوو ماوەیەکی درێژتر بمێنێتەوە. گەلی چەوساوە هەمیشە زۆربەی زۆری هەر نەتەوەیەك پێکدەهێنن، بەڵام زۆرداران بەشێکی زۆر کەمن، جابۆئەوەی مستێکی گچکە لەدەوڵەمەندان بەسەدان هەزارو ملیۆنەها خەڵك لەژێردەستەییدا بهێڵنەوە چەکێکی سیاسی بەهێزیان پێویستە. . ئەم جۆرە چەکەش دەوڵەتە.

دەوڵەت لەهەمووپێکهاتە کۆمەڵایەتییە چینایەتییەکاندا ڕێکخراوێکی سیاسی ئەوچینەیە کەلەرووی ئابوورییەوە دەسەلاتدارەو ئامرازێکی سیاسیی چینایەتیی چەوسێنەرانە بەسەر چەوساوەکانەوەو دەزگایەکە بۆدیکتاتۆریی چینی دەسەلاچتدار. ((دەوڵەت ئامرازێکە بۆپاراستنی دەسەڵاتی چینێك بەسەر چینێکیتردا))* دەوڵەت کە ئامرازی دەسەڵاتی سیاسییە لە کۆمەڵگەی چینایەتیدا، کۆمەڵێك خاسێتی تایبەتی هەیە. دەسەلاتی بالای دەوڵەت لەڕێگەی دامەزراوەی تایبەتییەوە جێبەجێ دەکرێت. چینی خاوەن دەسەلات لە پێکهاتە چینایەتییەکاندا جڵەوی حکومەت وسوپاو دەزگا یاساییەکان و پۆلیس وشتیوا دەگرێتە دەست. دەوڵەت هەمیشە دەزگایەکی تایبەتی هەیە لەسەروکۆمەڵگەوە وئەوانیش کۆمەڵە خەڵکێکن کەبەشێوەی سەرەکی کاروباری حوکمڕانی ئەنجامدەدەن. یەکێك لەخاسێتەکانی

* لینین((دەوڵەت))چاپی عەرەبی. مۆسکۆل ١١

دەوڵـەتی چەوسـێنەر ئەوەیـە دەزگـای حکومـەت ئـاڵۆزەو ناوەنـدێتی بەهێزەو ئەمەش دەبێتە بەرزکردنـەوەی ڕۆڵـی بیرۆکراسـی، واتـە ئـەو فەرمانبەرانەی لەکۆمەڵانی خەڵك دوورەپەرێزن ولەسەری ڕاوەستاون. نــاوەڕۆکی چــینایەتی دەوڵــەتیش لــە ئەرکــە ســەرەکییەکانیدا بەدەردەکەوێ، واتە لەڕێبازی سەرەکیی چالاکییەکانیدا.







## ثێرست

## کورتە باسێکی ماتێریالیزمی مێژوویی





